ناساندنی چەند لێرەوارێك

نووسینی: ماکوان کەریم

نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی

**کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی**

بەڕێوبەری گشتی: محمد خضر احمد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ m.ktebxana

ئەنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ m.ktebxana

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ محمود - بەرامبەر مزگەوتی محمود علاف

mdmaktaba@gmail.com

حاجی قادری کۆیی

پێوانە: ٢١*١٤

چاپی دووەم: ٢٠٢٢ز - ١٤٤٤ك

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ:

لاپەڕە: ٤٠٣

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان،
ژمارە سپاردنی (١٨٥٧) ی ساڵی (٢٠١٤) ی پێدراوە.

# ئاسانی چەند لێرەوارێك

نووسینی

ماكوان كەریم

ٱ ٻ ٻ

# پێشـــەكی

سەرەتا بەناوی خوای بەرزو میهرەبان درووود و ستایش بۆ سەر گیانی محمدی پێشەوای ئیسلام ﷺ

ئەم كتێبەی لەبەر دەستدایە؛ كۆكراوەی چەند نووسینێكمە لە ئامادەكردن و وەرگێڕان و پاشان زادەی هزری بەندەیە تا بتوانم خزمەتێك بە خوێنەرو كتێبخانەی ئیسلامی كوردی بكەم، ئەم پەرتوكە باس لە چەند ڕێچكە و تولەڕێیەك دەكات، كە ئیستا سەرتاپای جیهانی ئیسلامی داگیركردووە، بە تایبەت لە كوردستاندا بوونیان هەیە، ئەشێت هەندێكیان مێژوویەكی كۆنی هەبێت، بەڵام بەهۆكاری ئەوەی بەردەوام لە كۆمەڵگاكەماندا باس دەكرێت وەك نمونەی جەنگی هەڵگەراوەكان بۆیە لێرەدا وەك ڕێچكەیەك باسم كردووە، مەبەستیش پێی جۆری ڕووداوەكەیە لەودەمەدا كە ڕوویداوە، یاخود كە باس لە وڵاتێكی وەك ئەمریكا دەكەم، زیاتر مەبەستمە كە كاریگەریەكانی بخەمە ڕوو لەسەر پانتای جیهان و بەتایبەتی لەسەر خوێنەری كورد.

لە دووتوێی ئەم كتێبەدا ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە كەچەند تولەڕێگا هەیە و زۆر جار ڕێگای ڕاستمان لە خۆمان ونكردووە، بۆیە باسی هەموو ئەو ڕێچكە و گروپ و میتۆد و سیستەمانەم كردوە بۆ ئەوەیە كە تۆی خوێنەر خۆت بدۆزیتەوە، پاشان بونیادی كەسایەتی خۆت بكەیت لەسەر ئیسلامێكی ڕاست و دروست، ئەشێت من هەندێك بۆشاییم بە جێهیشتبێت، بەڵام دڵنیاتان دەكەمەوە لە داهاتوودا ئەو بۆشاییانە بە

گوێرەی توانا لە دووتوێی بەرگی دووەهەمدا یان دەتوانن ناوی بنێن کتێبی دووەمدا دەخەمە بەردیدی ئێوەی خوێنەر.

ئەم باسانەی کە کردوومە وەك ڕێبەرێك وایە بۆ ناساندنی واقعی ئەو دەستە و گروپ و کۆمەڵ و لادەرانە، دیسانەوە دەڵێم هەر لەناو بابەتەکاندا کەموکورتی تێدایە، چونکە ماکوان نووسیویەتی، دواتان لێدەکەم بەگەورەیی خۆتان لە نووسینی ئەم برا بچووکەتان خۆش بن، ئەگەر چاکم وتبوو ئەوە بەدڵنیاییەوە لە لایەن خوای گەورەوەیە، ئەگەر هەڵەیەکیشم کرد بوو بە دڵنیاییەوە لە خۆمەوەیە و لە نەزانیمە.

لەکۆتاییدا خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەکمان بێت و فەرموون بۆ ناساندنی تولە ڕێیەکان و ئاشنا بوون پیان..

**مـــاکوان کەریم**

**فرێدریکستاد.. نـــەرویـــج**

**١١ سێبتەمبەری ساڵی ٢٠١٤**

## موعتەزیلـە بناسـە

**موعتەزیلە:** گروپێکی موسڵمانن، هەندێك بە مەزهەبیان هەژمار دەکەن، کۆمەڵێکیش بە گروپ، من بۆخۆم لەگەڵ ڕای ئەو کۆمەڵەم کە ئەمانە گروپێکن لە ئەهلی سوننەت و جەماعە جیابوونەتەوە..

لە ڕووی زمانەوانی: واتا جیابونەوە و دابڕان..

لە ڕووی چەمکی زاراوەییەوە: واتا گروپێکی عەقڵگەرای ڕەها و تێڕوانینیان لەڕێگای فەلسەفەوە بۆ هەموو ئیمکان و مومکینی گەردوون، کە پێکهاتەی فەلسەفەی کەونە، گەورەتر لە فیکر تەماشای هەموو بوونەکانی چواردەوریان دەکەن، لە گەردوون و ژیان و مرۆڤ و دەسەڵات، لەم ڕێگایەوە ئەقڵگەرایی و فەلسەفەیان تێکەڵ بە بیروباوەڕی ئیسلامی (عقیدە) کردووە، ئەمەش وای کردووە کە بیر و هۆش و هزریان ببێتە مەنهەج و پێوەرو ئیستیدال بۆ هەموو شتێك لە دەوریاندا واتا پێوەری ئەقڵیان هەیە لە مەنهەجی بیروباوەڕ و بنچینەی باوەڕ خۆیشی، خۆشیان ناوناوە بە خەڵکی دادپەروەر و یەکتاپەرست و فەرماندەکەن بە چاکە و ڕێگریش دەکەن لە خراپە، لەقەبیشیان بە قەدەری(القدرية)، یاخود عەدلی خاسڕەو (العدلية) یە.

### دروستبوونیان لە مێژوودا

هۆکاری سەرهەڵدانیان و دروست بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دروست بوونی خەواریج و پاشان ڕەد فیعلی گروپێکی تر دژی خەواریج بەناوی مورجیئە.. کە ئەمانیش دوو گروپی ئیسلامین.

خەواریج پێیان وایە هەر کەس تاوانی گەورە ئەنجام بدات دەچێتە دۆزەخ بە هەمیشە و بە کافر هەژمار دەکرێت، مورجیئەش پێچەوانەکەیەتی، پێیان وایە هەر کەس بەدڵ ئیمان بێنێت نوێژ نەکات ئیتر موسڵمانە. ئەم پرسیارە لە «حەسەنی بەسڕی» کرا - ڕەحمەتی خوای لێبێت- ئەویش بێدەنگ بوو لە ئاست پرسیارەکەدا، چونکە بۆ ئەو سەردەمە کارێکی وا قورس بوو کە سەرەتای دەستپێکی شۆرش و دژایەتی نێوانی دەسەڵاتی ئومەوی و عەباسی بوو، هاتنی فەلسەفەی یۆنان و هیندستان و هاتبووە ناو موسڵمانان و وەردەگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی و خەڵکی بەئەقڵ مامەڵەیان لەگەڵ دەقەکاندا دەکرد، ئەوەی زیاتر دەبینرا هەوڵ بوو بۆ دەسەڵات و دژی بنەماڵەکان چ لە نێوانی بنەماڵەی سامانی و بووە یهییەکان، طالبییەکان و ئومەویەکان و عەباسیەکان، خەواریج و مورجیئەش لەولاوە بووەستێت، هەموو ئەمانە دژ بەیەکتری بوون و جەنگیان دەکرد.. لە بێدەنگی شێخ حەسەنی بەسڕی قوتابییەکی بەناوی“ واصڵی کوڕی عەطا « دەنگی بەرز کردەوە وەڵامی داوە، بە دەنگی بەرز وتی: من دەڵێم خاوەنی تاوانی گەورە موسڵمانە بە ڕەهایی و ناڵێم کافرە بەرهاییش.

ئینجا ئەم قسەیەی کرد (شوێنێك لە ناو دوو شوێندا، یاخود جێگایەك لە ناو دوو جێگادا) جێگایەتی، کە کردنەوەی بە کوردی بۆ خۆی پێدەچێت ماناکەی بگۆرێت، بەزمای عەرەبی پێدەڵێن (منزلة بين المنزلتين).. واتاکەشی نە کافرە و نە ئیماندارە! بەڵام موسڵمانە و بە ئەبەدیش لە ئاگردا دەمێنێتەوە، بۆیە پێیدەڵێن موسڵمانە لەبەر ئەوەی ناوی ئیسلامی هەڵگرتوە، بەڵام بە ئیماندار هاژمارد ناکرێت. دوای ئەوە جەدەلێکی گەورە دروست بوو چیرۆکەکەی دووورودرێژە، واصڵی کوڕی

عەطا کۆڕەکەی جێهێشت و حەسەنی بەسڕی- ڕەحمەتی خوای لێبێت- وتی عەطا لێمان دابڕا ئەمانە ئێستا پێیان دەوترێت گروپی دابڕاوەکان..!

سەرەتای سەرهەڵدانیان بەم شێوەیە بوو.. هەرچەندە ئەم باسانە هیچی بۆ من گرنگ نییە تەنها وەك مێژوو باسی لێوەدەکەم ئەم باسەی من لەسەر موعتەزیلە نوێکانی ئەم سەردەمە ئەدوێت هەوڵمداوە بیرو بۆچون و دیدیان لە ئێستادا بخەمە ڕوو، بەڵام هەر دەبێت پێشینیان بزانین تا قسە لەسەر ئێستایان بکەین.

هەرچەندە ڕایەك هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمانە وەك جولەکەکانی سەردەمی مەدینە هەموو سیفاتێکی بەرزو پیرۆزی خوای گەورە نەفی دەکەن، یاخود جوانتر بڵێم دەڵێن خوای گەورە هەموو ناو سیفاتە پیرۆزەکانی لی دەسێنرێتەوە ونی دەکەن بەوەی کە گوایە نابێت بەهیچ شێوەیەك لە شێوازی مەخلوق بچێت.. لە دەم و لە چاو لە گوێ و بیستن ئەم سیفاتانە ئەوان پێیان وایە نادرێتە پەنای خوای گەورە، بنەمای ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ جولەکەکان «سمنیە» کە بنەمایەکی فەلسەفی هیندی یەهودییە لە ڕێگای کەسێك بەناوی «جەعدی کوڕی دەرهەمی» یەهودی و ئەویش بیرو بۆچوونەکەی لە ئابانی کوڕی سەمعان وەرگرتوە ئەویش لە کەسێك بەناوی طالوت و ئەویش لە پووری لوبەیدی کوڕی ئەعصەمی یەهودی کە لوبەید سیحری لە پێغەمبەری خوا کرد (صلی الله علیه وسلم).. دەشڵێن دامەزرێنەری بیرو بۆچوونی کۆمەڵی سمنیە دەگەڕێتەوە بۆ جەهمی کوڕی صەفوان و پاشان تەئصیل (جێگیر) کردنەوەی ئەم بیرە لە لایەن یوحەنای دیمەشقییەوە بووە، کە فیکری موعتەزیلەی لەسەر دامەزراوە، چونکە ئەمانە هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە نەفی سیفاتی خوای موتەعال بکەن، بڕوایان بە ئەزەلیەتی

خوا و ئازادی ئیرادەی مرۆڤەکان هەیە. ئەمە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی دابڕاوەکانە (موعتەزیلەیە) کەواتە «تەوحید» لای ئەوان واتا نەفیکردنی سیفاتەکانی خوایە، ئەوە دوایی زیاتر ڕوونی دەکەمەوە کە مەبەست پیێ چییە.. ئەهلی سوننەتیش پێیانوایە، کە خوای گەورە چۆن بڕیاری داوە بۆ ناو و سیفاتە پیرۆزەکانی وەك خۆی بڕوامان پێیەتی و بێ تەئویل و تەفسیر و شوبهاندن، واتا بی هیچ مەجازێك بڕوامان پێیەتی.. وەك ئیبنو تەیمییە باسی کردوە ڕەحمەتی خوای لێبێت..

دابڕاوەکان (موعتەزیلە) بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیون.. قۆناغی ئومەویەکان کە لەسەردەمی ئەوانەوە دروست بوون، واتە ساڵی (٨٠-١٣١) کۆچی دەستی پێکردووە، لە عەباسیەکانەوە دەست پێدەکات بە سەردەمی زێڕینیان تا کۆتایی دەسەڵاتی خەلیفە "متەوەکیل» کە سەردەمی لاوازییانە، دیسانەوە سەردەمی چالاکییان دەستپێدەکاتەوە کە لەگەڵ دەوڵەتی شیعەی بووهەیئیە دەست تێکەڵ دەکەنەوە، سەرلەنوێ دەکەونەوە سەر دەسەڵات..

بۆ لەگەڵ شیعە هەمیشە دەستیان تێکەڵ بووە؟ لەبەر ئەوە شیعە بنەمای بیروباوەڕیان لە موعتەزیلە وەرگرتوە.

موعتەزیلە فەرموودە لە ئەبوهورەیرە و عەبدوڵڵای کوڕی جابر و عەبدوڵڵای کوری عومەر – ڕەزامەندی خوایان لێبێت- وەرناگرن.. پیان وابوو ئەمانە قوتابی "کەعبی ئەحبارن» ئەم بڕگەیە  پێویستی بە شیکاری زیاترە لەدواییدا زیاتر ئەمەش ڕوون دەکەمەوە.. هەرچەندە بنەماکەی لەسەر ئەوە دادەمەزرێت کە پێیان وایە کە زەمی قەدەریەی کراوە بە مەجوسی هەژمار کراوە، کە گوایە ئەوە فەرموودەی پێغەمبەر نیە صلی الله علیه وسلم، ئیتر لەسەر ئەم فەرموودەیە – فەرموودە لەو سێ کەسەی

تر وەرناگرن و بە قوتابی کەعبی ئەحباری یەهودیان دەزانن، ڕەزامەندی خوایان لێبێت ئەو سێ هاوەڵە بەرێزە.. فەرموودەکە ئەلبانی بە حەسەنی داناوە (الْقَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ).

دووبنەمای تریان باس دەکەین بەکورتی لە ڕووی مێژووییەوە، دواتر بە ڕوونی باسی دەکەین ئەویش(الوعد والوعيد) واتا پەیمان و بەڵێن و ترساندن و هەڕەشە بەوەی ئەگەر کەسێك تاوانێك بکات و لەسەری بمرێت، ئەوە بە بە پایانی لە دۆزخ دەمینێتەوە، چونکە پەشیمان نەبووتەوە و تۆبەی نەکردوە..! ئەمر بە چاکەو ڕێگری لە خراپە.. بۆ مرۆڤە ئاساییەکان نیە، بەڵکو تەنها بۆ دەسەڵاتدارانە لەڕووی سیاسییەوە کە هەر کات، کارێکی گەندەڵیان کرد دەبێت بەرامبەریان ڕاپەرین و دەسەڵاتەکەیان لێوەربگیرێتەوە..

ئەمەی کە باسم کرد تەنها وەك ناساندنیانە لە مێژوودا.

موعتەزیلە خاوەنی تایبەتیمەندی خۆیانن لە دیدو بۆچوونیاندا لە مەڕ دوو چەمك کە بیدعەیە و هێناویانەتە ناو ئیسلام.. ئەویش..

**یەکەم:** لەوەی کە باسی دەکەن گوایە مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕەها ئازادە لە کردار و ڕەفتاریدا، واتا خۆی خولقێنەری کردارەکانیەتی بە هیچ شێوەیەك خوا دەسەڵاتی نییە بەسەر خوڵقێنەری کرداری مرۆڤدا.. ئەم بیرە ترسناکە، لە لایەن غیلانی دیمەشقی دامەزراوە لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە بانگەشەی بۆکرد هەتاکو مرد.. واتا تا سەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك – ڕەحمەتی خوایان لێبێت- تا ئێستاش ئەم قسەیەی موعتەزیلەکان هەر بەردەوامە... خوێنەر لەوانەیە بپرسێت، ئەی ڕاستەکەی چییە.. ئەهلی سوننەت چی دەڵێت:؟

لەڕاستیدا ڕای جیاوازەکە دەبێت مرۆڤ زۆر وردبێت تێیدا، ئەگینا قسەی موعتەزیلەکان زۆر جوان و عەیارانە خۆی نیشان ئەدات، زوو دەڕواتە ناو دڵ و مێشکەوە، ئەتوانن بیڕازێنەوە، دەڵێن کەی خوا کاری خراپە فێری خەڵکی دەکات؟

بەڵام لەڕاستیدا موعتەزیلە هەمیشە خەریکی تەدلیسن، واتا چەواشەکارین بۆ قوتابخانە و گروپەکەی خۆیان، ئەقڵیان زۆر کورتە، ئەگەر ئەهلی سوونەت ڕووبەرویان بێتەوە زوو چۆك دائەدەن، چونکە ئەقڵ لای ئەوان پێوەرو تەنها ژیرییە وەرزش بە مێشك و توانای مرۆڤ دەکات تا بتوانێت دەقەکانی پێ بخوێنێتەوە، بەڵام لای ئەهلی سوننەت وەحی ڕۆشنکەروەی ئەقڵ و ژیرییە وەرزشی پێدەکات تاکو مرۆڤ خاوەن ژیر و هێزی ئەقڵ بێت.. ئەهلی سوونەت پێیان وایە خولقێنەری هەموو شتێك لەم بوونەدا خوای گەورەیە، بەلام کردارەکە لە مرۆڤەکەوەیە، واتا موسڵمانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەوردی مێشکفراوانی شوێن هەموو زانستەکان کەوتون لە لایان زانایانی سەلەفەوە ڕوونکراوتەوە، چونکە ئەگەر بڵێین خوا خولقێنەر نیە، کەواتە لە خوایەتیمان خست، بەڵام کردارو ڕەفتارەکە خودی مرۆڤ ئەنجامی ئەدات و ئازادە لە کردنیدا، لەسەر ئەوەش لە قیامەت لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت.

**دووەم:** موعتەزیلە پێیوایە کەسێك تاوانی گەورە بکات، نەئیماندارە و نەکافرە، بەڵکو فاسقە، واتا ئەو باسە بەدرێژی دەکەمەوە کە لەبەشی یەکەمدا ئاماژەمان بۆ کرد..( منزلة بین المنزلتین) واتا (جێگایەك لە ناو دوو جێگادا) حاڵی ئەو کەسە لە دونیادا بە شێوەی فاسقە و لە قیامەتیشدا ناچێتە بەهەشت و بە پایانی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی بە

کردەوەی ئەهلی بەهەشت کاری نەکردووە، بەڵام هیچ ڕێگرێکیش نیە لەوەی پێی بوترێت موسڵمان، چونکە ناوی ئیسلامی هەڵگرتوە و بە دەم شایەتومانی هێناوە، بەڵام ئیماندار نیە!..

که لەڕاستیدا ئەهلی سوونەت پێیان وایە فاسق موسڵمانە و بەڵام دەرناچێت لە میللەت، ئیمانی نوقسانە بە پایانی لە دۆزەخدا نامینێتەوە..

ئەمەی کە باسم کرد.. هەمووی لە دەمی زانایەکی گەورەی موعتەزیلە «شەهرستانی» –ڕەحمەتی خوای لێبێت- کە هەموو ئەم باسانەی گێڕاوتەوە کە بڕوای بە قەدیمی خوای هەیە واتا نەفی سیفاتەکانی خوا دەکات، پاشان زانابوونی خوا پەروەردگار بە زاتی خۆی..

**دەتوانین بڵێین لەم چەند خاڵەدا دیدو بۆچونیان کۆدەبێەوە..**

**یەکەم:** (المنزلة بين المنزلتين) کە دەڵێن فاسق واتا خاوەن تاوانی گەورە نە ئیمانداره و نە کافره، بەڵکو لە (جێگایەك لە ناو دوو جێگادا)..

**دووەم:** (التوحيد) کە مەبەستیان لە یەکتاپەرستی.. پێی نەفی کردنی سیفاتی خوای موتەعالە..

**سێیەم:** (العدل).. خاسڕەوی واتا نەفی کردنی قەدەری خوای گەورە..

**چوارەم:** (الوعد والوعيد) کە ئەمەش بە هۆکاری هەڕەشەو پەیمانی خوای گەورە دەڵێن: ئەوکەسەی کە تاوانی گەورە ئەنجام ئەدات لە دۆزخدا بە پایانی دەمێنێتەوە.. ئەگەر تۆبە نەکات و پەشیمان نەبێتەوە.

**پێنجەم:** (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) زیاتر ئەم فەرمان بەچاکە و نەهی لە خراپە ڕوو دەسەڵاتدارانە، پابەندی خەڵکە بە ئەقڵی ئەوانەوە ئیتر بەمانە دەوترێت دابڕاوەکان (معتزلة).

لەناو ئەم گروپی موعتەزیلەدا ١٤٠ گروپی تر هەن کە لێی جیابونەتەوە لەسەر بنەمای فیکری و فەلسەفی و ڕای جیاوازیان هەیە لە یەکتر دابڕاون کەهەندێکیان هەندێکی تریان کافر دەکەن و بڕوایان بەیەکتر نیە، زیاد لە ٤٠ کۆمەڵەیان کە لە موعتەزیلە جیابوونەتەوە بە موسڵمان هەژمار ناکرێن هەندێك لە گروپە ناودارەکانیان.. لەوانە..

الواصلية، والعمرية، والهذيلية، والنظامية، والأسوارية، والمعمرية، والإسكافية، والجعفرية، والبشرية، والمردارية، والهشامية، والتمامية، والجاحظية، والحايطية، والحمارية، والخياطية، وأصحاب صالح قبة، والمويسية، والشحامية، والكعبية، والجبابية، والبهشمية کە دەچێتەوە سەر أبي هاشمی کوڕی الحبالی. ئەم بیستو دوو دانیە سەرەکی ترینیانن، وەك ئاماژەم پێداوە زانایان هەر بە کافریان دەزانن لەوانە کە زۆر دەرچوون بی ئەدەبن ئەم دووانەن (الحايطية والحمارية)..

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت.. ئایا لەڕاستیدا موعتەزیلە خاوەنی ئەقڵن و بە ژیری وادەکەن کە خەڵکی شوێنکەتووی قوتابخانەکەیان بێت، ئەمەش خەیاڵ پڵاوە.. لەڕاستیدا وا نیە، چونکە ئەگەر خاوەنی حووجە و بەڵگەی بەهێزبوو هەرگیز توڕە نابێت، بەرانبەرەکەی والێنکات کە ئیستیفزاز بێت، بەڵکو بەڵگەی خۆی نیشان ئەدات، ئەگەر جەدەل و قسەکردن هێزی فیزیك و شەڕی تێدا هاتە دی، ئەوەی کە دەستدرێژی دەکات و هێزی فیزیکی بەکاردەهێنیت ئەوا دۆڕاوە، بەڵگەی ئەوەی کە موعتەزیلە خاوەنی ئەقڵ نین، بەڵکو هەمیشە دەستیان داوەتە شەر دژی ئەهلی سوننەت، نمونەی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیان خستە زیندان توانای ئەوەیان نەبوو ئاخاوتنی لەگەڵ بکەن..

بەڵام، بە ئینسافە دەڵێم دەستی خێریان هەبووە دژی فەلەسەفە و فیکرە جیاوازەکانی تر کە هێرشیان هێناوەتە سەر موسڵمان، لە ئێستاشدا بوونیان باشە کە ڕووبەڕوی عەلمانی دەبنەوە، بەڵام بۆ ئەهلی سوننەت حووجەو بەڵگەی بەهێزیان نیە.. هیوادرام کە ئینساف لامان ون نەبێت، بۆ خارتی خوای گەورە کار بکەین نەك دەمارگیر.

**باسێکی کورتی ئەو مێژووە :**

لە سەردەمی ئیمام ئەحمەددا واتە لە کۆتایی ژیانی هاڕونە ڕەشیددا کە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدادەبێت، فیتنەیەك دروست دەبێت لەلایەن موعتەزیلەکانەوە، بڵاو دەبێتەوە لە ناو خەڵکیدا کە قورئان مەخلوقە، ئەمە وا دەکات زیاتر ئەم بیرە لە ناو خەڵکیدا پەرە دەسێنێت و کۆمەڵێك خەڵك موبەتەلا دەبێت پێوەیەوە، هۆکارەکەی ئەوەیە هەندێ فەلسەفەی یۆنانی و سریانی تەرجومە کراوە و هاتۆتە ناو جیهانی ئیسلامییەوە و ئیمام ئەحمەدیش بەتەواوەتی ئەوە ڕەد دەکاتەوە و لەناو خەڵکیدا بڵاوی کردەوە کە قورئان کەلامی خوای موتەعالە و ئەزەلییە و قەدیمە وەکو زانستی خوای موتەعال وایە، ئەم ئایەتەشی ئەهێنایەوە بە بە ڵگە(وإن أحد من المشركين استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله ثم أبلغه مأمنه ذلك بأنهم قوم لا يعلمون..ئەمە بەڵگەی ئیمامی ئەحمەد بوو...

ئەم وتەیە زۆر سامناك بوو کە دەیانووت قورئان مەخلوقە"واتا قورئان وەك دروست کراوەکانی خوا وایە لە کۆتایدا لە ناو دەچێت، هەموو دروست کراویك نوقسانە، قابیلی ئەوەیە دەستکاری بکرێت" ئیمامی ئەحمەد هەموو جارێك ئەم ئایەتەی پێ ئەوتنەوە (انا نحن نزلنا الذكر

وانا له لحافظون) خوای گەورە مادام خۆی قورئانەکەی دابەزاندووە هەر خۆشی دەیپارێزێت.

بۆ ئەم قسەیان دەکرد لەبەرئەوەی ئەگەر ئایەتێك بە دڵی خۆیان نەبوو لەگەڵ ئەقڵیان نەگونجا دەستکاری بکەن لە تەفسیرو تەئویلیدا، نەك لە گۆڕانکاری دەقەکاندا، بەڵکو گۆڕانکاری لە تێگەیشتنی دەقەکاندا..

لە پاشان کەسێك بەناوی"ئەحمەدی کوڕی ابو دوئادە" دەیویست بە هێز ئەم فیتنەیە و بیری خوی بڵاو بکاتەوە دوای مردنی هارونە ڕەشید، ئەم خەڵکە بە هێز وای لێ کرا لە سەردەمی "مەئمونی کوڕی هارونە ڕەشیددا" کە خۆی و ڕەعیەتیەکەی موبتەلا ببو بەم ئەفکارەوە و پێشی وابوو کە قورئان مەخلوقە، پاشان بەزۆر مەئمون لە خەڵکی ئەدا و خەڵکی تاقی دەکردەوە زاناکانی موعتەزیلەی دەنارد بۆ بەغداد و شارۆچکەکانی تر کە خەڵك تاقی بکەنەوە بۆ ئەوەی بزانن کە قورئان مەخلوقە یان نا؟... کەی خاوەنی ئەقڵ هیز و کوشتن بە کار دنێت..؟

ئەگەر وتیان نا ئەوا نان بڕاویان بکەن، لەسەر ئیش و کاریان دەریانبکەن و نانیان مەدەنێ و ئەمانە هەمووی لەڕووی ئەحمەدی کوڕی ئەبو دوئادەوە بووە، خۆی موعتەزیلە بووە، ئەیویست بە زۆر ئەم ئەفکارە بڵاو بکاتەوە، پاشان زۆر لە خەڵکی بەغداد ئەم کارەیان بە توقیە کرد، تەنها چوار کەس نەبێت لە دژی ئەمە وەستانەوە، کە ئەیانگوت قورئان مەخلوق نییە کەلامی خوایە، لەسەرەتاوە دوانیان لەو زانایانە بە هۆی لێدانی زۆرەوە مردن و دوانیان مانەوە کە یەکێکیان کوڕێکی گەنج بوو کە ناوی "مەحممەدی کوڕی نوح"ە ئەوەی تریان ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە- ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت- دەیانەوێت بیانبەن بۆلای مەئمون کە

گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات، زۆر گرنگە مرۆڤ تەوەکولی بە خوا هەبێت.. لێرەدا ڕووداوێك ڕوئەدات کە تەوەکولی مرۆڤ دەردەخات...

مەحممەدی کوڕی نوح کە لە ڕێگا دەیبەن بۆ لای مەئمون نزا دەکات و دەڵێت؛ خوایە نەگەمە لای مەئمون گیانم بکێشیت، نزاکەی گیرا دەبێت دەست بەجێ ناگاتە ئەوێ و دەمرێت..

ئیمامی ئەحمەد کە مەحممەدی کوڕی نوحی بینی بەو شێوە گیانی دەرچوو بەسەر دەستی پاسەوانەکەی مەئموندا چاو پڕ گریان بوو، جا لێرەدا نزایەکی زۆر سەرسامانە دەکات و چاو و دەست بەرز دەکاتەوە بەرەو ئاسمان دەفەرمووێت: خوایە گیان ئەم پیاوە واتە مەئمون بوغرا بووە و هەڵە ڕەفتار دەکات بەرامبەر سیفات و قورئانەکەت کە کەلامی خۆتە، ئازاری زۆری پیاو چاکانی تۆی داوە بە لێدان و کوشتن، خوایە گیان ئەگەر ئەم قورئانە کەلامی جەنابتە و مەخلوق نییە بەس ڕزگارمان بکە بە لە شەڕی ئەم خەلیفەیە..

ناگاتە لای مەئمون هەواڵ دێنن کە مەئمون وەفاتی کردووە و دەستی دەکرێتەوە و ئازاد دەکرێت و دەگەڕێتەوە ناو کەس و کاری..

لەدوای مردنی مەئمون "موعتەصیمی" برای دێتە سەر فەرمانڕەوایی ئەم کەسە پیاوێکی سەربازی بە هێز بوو بزووتنەوەیەکی سەربازی دروست کردووە لە خەلافەتی عەباسیدا و توانا و هێزێکی زۆری هەبوو، بەناوبانگە بە فەتحی عاموریا، بە هەمان شێوە ئەمیش وەك مەئمون موعتەزیلە بوو زۆر توندڕەو بوو، ئەحمەدی کوڕی ابو دوئاد کە لە پێشدا ئاماژەم پێدا، یەکێك بووە لەسەر دەستەی موعتەزیلەکان و یەکێك بووە لە توندڕەوەکان، هەردەم دەیویست بە هێز و بە زۆر ئەم فیکرە بچەسپێنێت..!

جارێکیتر بەهەمان شێوە ناردیەوە بە شوێن ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا و پێیگووت قورئان مەخلوقە یان خالقە، ئیمام ئەحمەد هەمیشە ئەو قسەیەی دووبارە کردۆتەوە کە وتویەتی کەلامی خوای گەورەیە بۆیە چەند جارێکیش مونازەرەی لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی ابو دوئادەدا گرتووە، هەموو جارەکان ئیمام ئەحمەد سەرکەووتو بووە، بەڵام چونکە ئەوەندە توندڕەو بوون لەبەردەم ئەم فیکرە موعەتزیلییەیاندا.. موعتەصیم بڕیاری دا کە زیندانی بکات، یەك ساڵ و نیو لەزینداندا بوو، لە کاتێکدا کە لە زینداندا بوو موعتەصیم دەچوو بۆلای پێی دەوت؛ پێم بڵێ و مەترسە، ئیمامی ئەحمەدیش بەم شێوەیە جوابی ئەداتەوە دەفەرمووێت: واللە کە هاتومەتە لای تۆ بەقەدەر مثقالە زەرەیەك ترسم لە تۆ نییە، ئەویش دەڵێ؛ ئەی ڕات چییە بەرامبەر بە قورئان، ئیمام ئەحمەدیش فەرمووی قورئان وتەی خوای گەورەیە و مەخلوق نییە، ئەم جارە دەیانەوێت بەشێوەیەکی تر بیگەڕێننەوە سەر ئەو مەنهەجە هەڵەیە بۆیە..مامی دەنێرن بۆ زیندان و پێی دەڵێت: ئەحمەد تۆش وەکو ئەو خەڵکە بە توقیە خۆت نەجات بە لەمە، بۆ خۆت خستۆتە ئەشکەنجە و ئازارەوە؟ ئەویش دەڵێت؛ "مامە جاهیل هەر جاهیلە ئەگەر زانایش بێدەنگ بێت ئەی کێ زانست فێری ئەو خەڵکە بکات" مامی کە گوێی لەمە دەبێت دەزانێت ئیمامی ئەحمەد دەتوانێت ڕووبەڕوی ئەم فیتنەیە ببێتەوە..

ڕۆژێك دەیانەوێت بە قامچی لێدان هەڕەشەی لێبکەن بۆیە لەو کاتەدا مەی خۆرێك لە گەڵیدا زیندان دەبێت، ئیمام ئەحمەد پێی دەڵێت، ئەترسم لە فتنەی قامچی! وا نەبێت لە مردن بترسێم، بەڵکو لەوە دەترسێم کەلەژێر لێداندا قسەکەم بگۆڕێت، بۆیە پیاوە مەی خۆرەکە پێی دەڵێت؛ ئەی ئەحمەد من تا ئێستا هەزار جەڵدەم خواردووە لەسەر ئەوەی کە

مەشروبم خواردووە، تۆ ناتوانی بەرگەی ئەو جەڵدانە بگریت کە لەبەر خوای موتەعالە؟؟؟ مەی خۆرەکە دەڵێت تەنها قامچی یەکەم و دووەم ئازاری هەیە باقی ئەوانی تر لاشەت سڕ دەبێت گوێ مەدەرێ...

ئەمە دەبێە هۆی ورە پێدانەوەیەك بە ئیمام ئەحمەد، دوای ئەوە موعتەصیم بانگی دەکات و پێی دەڵێت؛ من دڵم بۆت دەسووتێ، حەز ناکەم لێت بدرێت بەس ئەوەندە بڵێ قورئان مەخلوقە ئیمامی ئەحمەدیش پێی دەڵێت شتێکم بۆ بێنە لە قورئان و سونەتدا باسی مەخلوقی قورئان بکات منیش جوابێکتان ئەدەمەوە

لیدان دەست پێدەکات..

دوای ئەوە کە یەکەم قامچی لێ دەدەن دەڵێت بسم الله...

دووەم قامچی لێ دەدەن دەڵێت ماشاءالله...

سێیەم قامچی لێ ئەدەن دەڵێت لا حول ولا قوة الا بالله...

چوارەم قامچێ لێدەدەن دەڵێت؛ قورئان کەلامی خوایە و دوای ئەوە بێدەنگ دەبێت تا سەد جەڵدەی لێ دەدەن..

ئەم ڕووداوانەی کە بەسەردا دێت لە مانگی ڕەمەزاندایە، ئەحمەدی کوڕی ابو دوئاد زۆر دڵی بۆی دەسووتێت دەڵێت بەس بچپێنە بە گوێمدا بڵێ قورئان مەخلوقە ڕزگارت دەکەم لەم عەزابە، ئیمام ئەحمەدیش دەفەرمووێت تۆ وەرە بەگوێچکەی مندا بچرپێنە بڵێ قورئان کەلامی خوایە من لای خوای موتەعال داوات بۆ دەکەم کە لە عەزابی جەهەنەم بتپارێزێت، ئەوەندە لێی دەدەن کە دەیبەن بۆلای دکتۆر(حەکیم) دەڵێت تا ئێستا لێدانی وام نەدیوە بە هیچ کەسێکەوە پاشان ئاوی بۆ دێنێت دەڵێت من بەڕۆژوم!...

لەسەر ئەو هەموو ئازاردان و لێدانەوە ڕۆژووەکەی نەشکاندووە، لەدوای ئەمە بەردەوام دەبێت و خەڵك لەشاری بەغدادا کە دەبینن دەسەڵات بەرامبەر ئەم پیاوەدا وەستاوەتەوە زیاتر خۆشیان دەوێت، ئیتر بۆ دواجار خەڵك خۆپیشاندان دەکەن دەچنە بەردەم باڵەخانەی خەلافەت بە موعتەصیم دەڵێن: دەبێ دەریبێهنێت لە زیندان، چونکە ئەو پیاوە پیاوی زیندانی کردن نییە، بۆیە موعتەصیم دەترسێت لەوەی کە شۆڕش دروست ببێت، دەری دێنێت لە زیندان، بەڵام دەبێت دەستبەسەر بێت لەماڵی خۆیدا و نابێ هیچ وانەیەك بڵێتەوە و نابێ قوتابی هەبێت و وتاربدات لەمزگەوتدا.

ئیمامی ئەحمەد بڕوای وا بووە هەر کەسێك لە دەسەڵاتەوە نزیك بێتەوە کەسایەتی بەرەو لاوازی و سوکایەتی دەڕوات، ئیمامی ئەحمەد نوێژی لەدوای ئەو کەسانەوە نەکردووە کە پیاوی دەسەڵات و سوڵطە بوون.!

پاشان برایەکی تریان دێتە سەر فەرمانڕەوای بەناوی "موئتەمین بالله" دێتە سەر ئەمیش بە هاوشێوەی براکانی تریان ئازاری خەڵك دەدەن و خەڵکی تاقی دەکەنەوە بۆ ئەوەی کە قورئان بە موخلوق بناسێنن.. لەسەر و بەندی ئەم ڕووداوانەداو لەم کاتەدا خوای گەورە زانایەك دەنێرێت بۆ شاری بەغداد کە کەس ناوی نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت دەچێتە لای موئتەمین دەڵێت؛ من دەمەوێت مناقەشە و گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی ابو دوئاد بکەم؟

موئتەمین ڕازی دەبیت منازەرە ساز دەکرێت.. کە دەکەوێتە قسە و دیالۆگ پێی دەڵێت پێغەمبەری خوا هیچ شتێکی شاردۆتەوە ئەویش دەڵێت نەخێر، وە دەڵێ باشە خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کە دەفەرمووێت

(اليوم اكملت لكم دينكم....)؟ دەڵێ بەڵێ، دەڵێ زانستی پێغەمبەر لای خواوە هاتووە؟ ئەویش دەڵێ بەڵێ، دوای ئەوە دەڵێ لە مانەدا باسی کراوە کە قورئان مەخلوق بێت ئەگەربـاس نەکراوە باشە تۆ بۆچی باسی دەکەیت.

یان ئەوەتا ئەوان زانستیان پێ نیە و تۆ زاناتری لە خوا و پێغەمبەر؟! یان درۆ دەکەیت..

دوای ئەوە خۆی ئاشکرا دەکات ئەحمەدی کوڕ ئەبو دوئاد دەڵێ؛ ئەوان هیچیان نەیانزانیووە، لەو کاتەدا لە پێکەنینداموئتەمین دەست دەگرێت بە دەمیەوە، دەزانێت دۆڕاوە، ئەحمەدی کوڕی ئەبو دوئاد لەدوای ئەوەی کە دۆراندی حوجەی پێ نەبوو، ئیتر عەزابەکە لەسەر خەڵکی لا دەبەن ئەو فیتنەیە تا ڕادەیەك کۆتایی پێ دێت بەڵام موعتەزیلە هەر سەردەستەیە، لە دوای مردنی موئتەمین بالله پیاوێك دێتەسەر حوکم بە ناوی "متوکل علی الله" یە کە یەکێکە لە خەلیفە باشەکان، دوای ئەوە ئیمامی ئەحمەد دەهێنێتە دەرەوە لە ماڵی خۆی و مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بڵاو دەبێتەوە و ئەهلی سوننەت و جەماعە زیاد دەکاتەوە.

پرسیار ئەوەیە.. کەی خاوەنی ئەقڵ هێز بەکار دینێت و پەنا دەبات بۆ هێز.. ئەگەر کەسیك تواناو بورهانی بەهێز بوو، ئەوە گورەترین چەکە.

لێرەدا دەمەوێت ئەوە ڕوون بکەمەوە بۆچی موعتەزیلەم ناوناوە بە دابڕاوەکان.. ناوم نەناون بە گۆشەگیرەکان؟

لەبەر ئەوەی ئەمانە بۆ خۆیان دابڕان لە کۆمەڵی ئەهلی سوننەت و جەماعە و گۆشەگیر نەبوون، بەڵکو- دابڕان دوای ئەوە هەر لە تەنیشت

حەسەنی بەسڕی لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز.. واصلی کوڕی عەتاش وانە و کۆڕ و مەجلیسی هەبوو فیکری خۆی بڵاو دەکردەوە.. پاشان ئەمانە مەنهەجێکیان دانا.. کە ئەقڵ و ژیری دەستپێکە..!، مرۆڤ لەسەر بنەمای ئەقڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، چونکە بوونەوەرێکی خاوەن ژیرییە، ئەمەش وای کرد کە مەزهەب و گروپی زۆریان لێدروست ببێت، ئەوەی کە بە دڵی قوتابییەکەی نەبوایە جیادەبووە و مەزهەبێکی بۆ خۆی دروست دەکرد، هۆکاری ئەوەشە کە جۆری موعتەزیلە زۆرە بەناوی ئەو کەسانەی کە دادەبڕان لە کۆڕی مامۆستاکانیان، ئیتر ناوی موعتەزیلەی بەناوی خۆیەوە هەڵدەگرت وەك واصل کوڕی عەتا، پێیدەوترێت مەزهەبی وەصلی،، بەڵام بەگشتی هەموو ڕازی بوون لەسەر بنەمای موعتەزیلە بەو پێنج خەصڵەتەی کە ئاماژەمان پێداوە..

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە.. ئایا ئەهلی سوننەت و جەماعە کێشەی چییە لەگەڵ ئەو وتەیەی موعتەزیلە کە دەیانگوت مرۆڤ بوونەوەریکی ئاقڵ و ژیرە مەگەر وانییە..؟

بەڵێ بە دڵنیاییەوە وایە، بەڵام کێشەکە لێرەوە دەست پێدەکات، ئەوان ئەقڵ پێش وەحی (سرووش) دەخەن، واتا ئەوەی کە ئەقڵ بڕوای پێنەهێنا تەئویلی دەکەن بۆ ئەوەی ئەقڵ قەناعەتی پێبکات، ئەمەش لای ئەهلی سوننەت ڕاست نییە، هەموو ئەقڵێك مەرج نییە وەك یەك بێت، بەڵکو – ژیری و توانا و هێزەکان جیاوازیان هەیە نیسبیە (ڕێژەییە)، کە مادام وایە مەرج نیە ئەوەی بە ئەقڵی کەسێك هەڵەیە و پەی پێنابات و حیکمەتی نازانێت لای کەسێکی تریش هەر وابێت، پێویستە بوەستێت لەسەری و تا دەگاتە حەقیەت و ڕاستی بۆ دەردەکەوێت، بەڵام موعتەزیلە مەرجەعی ئەقڵە، ئەهلی سوننەت مەرجەعی وەحیە، چونکە نابینی هەموو ئەقڵەکان

وەك یەك بن واتا ئەگەر ئەقڵ وەحدەتی نەبێت، ئەی چۆن بتوانین ڕای جیاوازمان و هەڵەکانمان بدۆزینەوە..؟ `

ئەمەیە هەڵەی موعتەزیلە و بیدعە و سەرلێشێواویەکەی، واتا وەحدەتی ئەقڵ و ژیری لەم بوونەدا دەست ناکەوێت، بەڵام وەحدەتی وەحی کە قورئان و سوننەتە، هەموومان دەگەڕێینەوە سەر.. فەرموودی پێغەمبەری ئیسلامیشە ﷺ دەفەرمووێت: (فإنه من یعش منکم فسیری اختلافا کثیرا، فعلیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین المهدیین) هەر بە هۆکاری ئەو ڕاجیاوازییەیە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ وەحی کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە، پاشان ئیجماع کە گرۆی هاوەڵانە ڕەزامەندی خوایان لێبێت..

یەکێك لە زانا ناودار و بەرێزەکانیان ئەبو حەسەنی ئەشعەرییە.. (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە سەرەتا خۆی موعتەزیلە بوو، بەڵام ئەمیش کەوتە موجادەلە و موناقەشە لەسەر باس و خواستی (العدل) وای کرد کە بە تەواوی مەزهەبی موعتەزیلە ون ببێت، چووە سەر مینبەر وتی ئەوا من وازم لە موعتەزیلە هێنا وەك چۆن ئەم کراسە لەبەرم دادەکەنم ئاوا موعتەزیلەم داکەند و ئەوە فرێمدا.

بێگومان پێشتر ئەو زانا بەرێزەی کە مناقەشەی لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی ئەبو دوئاد کرد سەرکەوت بەسەریدا کە ناوی نییە لە مێژوودا، هیچ کەس ناوی نازانێت ئەو زانا بەرێزە لە مێژوودا تۆمار نەکراوە، کۆتاییان پێهات لە ڕوویی سیاسیشەوە، بەڵام لە ڕووی فیکرەوە ئەبوحەسەنی عەشعەری کۆتایی پێهێنان و هەتاکو- هاتنی ئیبنو تەیمییە ئەشعەریەکان بە ئەهلی سوونەت هەژمار دەکران، بەڵام کە ئیبنو تەیمییە – ڕەحمەتی خوای لێبێت – هات و هەڵەکانی ئەوانی ڕوونکردەوە ئەهلی سوننەتی

ناساندەوە، هەڵەی ئەشعەریەکانیشی خستە ڕوو، بەڵام ئەشعەرییەکان نزیکترین بیروباوەڕن لە ئەهلی سەلەفەوە، هەرچەندە خەڵکێك دەڵێن گوایە ئەبوحەسەنی ئەشعری وازیشی لە بیروباوەڕی ئەشعەری هێناوە لەسەر مەزهەبی سەلەف بووە، کە کاك عادل شێخانی لە کتێبە نایابەکەیدا بە جوانی ڕوونی کردۆتەوە بەناوی(قواعد فی بیان حقیقة الایمان).

لە ئەمڕۆماندا شتێك نییە بە ناوی موعتەزیلە وەك ئەوەی کە جاران هەبوون لەسەر هەمان بنەما کار بکەن، ئەوە نییە و نەماوە.. بەڵکو- گۆڕانکاری زۆر بەسەر موعتەزیلەدا هاتووە، ئەوەی کە موعتەزیلەیە هەموو ئێستا زیاتر لە ناو شیعە خۆی دەبینێتەوە، چونکە هەموو بنەمای فیکری و کەلامی و فەلسەفی شیعی لە موعتەزیلە وەرگیراوە، بەڵام ئەوان بە ئارەزووی خۆیان دەستکارییان کردووە، سەرچاوەی قسەوتنیشیان بە هاوەڵان، هەر لە دەستی موعتەزیلە وەریانگرتوە، چونکە شیعە سەرەتا بزووتنەوەیەکی سیاسی بوون هیچی تر، بەڵام کە موعتەزیلە دروست بوو زۆر جار تاوانی گەورەیان ئەدایە پاڵ هاوەڵان، لە نێوانی عەلی و زوبێر و عائیشە، ئەمە وایکرد بە پێچەوانەوە بشکێتەوە، شیعەی عەلی بە تەمەیوز ناویان دەرکرد و باقی تاوانی گەورە تەنانەت کافر و مونافیق و مورتەدی دایە پاڵ هاوەڵان، کە سەرچاوەی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ موعتەزیلە، چونکە موعتەزیلە فەرموودەی (ئەحاد) واتا لە هاوەڵێکەوە گێڕاوەتەوە وەرناگرن ئەگەرچی فەرموودەکە هەموو سەندەکانی ڕاست و دروست بێت، پاشان فەرموودەی(غەریب) وەرناگرن واتا دوو هاوەڵ گێڕابێتیانەوە، پاشان فەرموودەی (عەزیز)یش وەرناگرن کە سێ هاوڵ گێڕاوینەتەوە، تەنها فەرموودەی (متەواتر) وەردەگرن کە لەسەر ٧ هاوەڵاوە گێڕاوەتەوە، لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا..ئەمەش وای کردووە کە تانە و تەشەر بدەن لە هەندێك فەرموودەی بوخاری، گوایە هاوەڵان مەرج

نییە هەموو دادپەروەر بن موناфیقیشیان تێدابووە، وەك ئەوەی کە بوخاری فەرموودەی لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلولەوە ڕیوایەت کردبێت..! لەکاتێکدا ئەم قسانە و ئەو بیدعە و داهێنراوانەی کە جاران کراوە، لە ئێستا کۆمەڵێك بەناوی ئەقڵگەراکان یان تەنویرییەکان، ئەم وتانەی سەردەمی مەئمون و موعتەصیم دووبارە دەکەنەوە وا خۆیان دەناسێنن کە گوایە ئەمانە نوێگەری و ئەقڵگەران، کە وەك ئیبنو تەیمییە دەفەرمووێت: لە کتێبی (درء تعارض العقل والنقل) ئەم کتێبە باس لەوە دەکات کە ئەگەر ئەقڵێك بۆ خۆی سەلیم بێت هیچ ڕێگریەك لە نێوانی قورئان و سوننەتدا نییە بۆ تێگەیشتن، بەڵام پرسیار ئەوەیە، مادەم وایە بۆچی موعتەزیلە دروست بوون..

لێرەدا زوڵم لە هەندێك موعتەزیلە کراون کە پێویستە ڕوونی بکەمەوە، پیاوێکی بەناوبانگی وەك قازی عەبدولجەبار کە خاوەنی موسوعەیەکی گەورەیە لەسەر موعتەزیلە.. دەڵێت..

جیاوازی موعتەزیلەکانی تر لەگەڵ موعتەزیلەی بەسرە ئەوەیە کە ئەوان یەك شتیان لە ئەهلی سوننەت زیاتر کردووە ئەویش ئەقڵە.. لێرەدا وەك ئەوەی قازی عەبدولجەبار ڕوونی کردۆتەوە منیش ڕوونی دەکەمەوە کە لە د. محمد عیمارەم وەرگرتوە..

موعتەزیلەی بەسرە دەڵێن وەك ئەهلی سوونەت و جەماعە، قورئان و سونەت و ئیجماع.. بەڵام ئەقڵیشیان بۆ زیاد کردووە.. د. محمد عیمارە لە شەرحی وتەکەی قازی عەبدولجەبەردا دەڵێت: باسی ئەقڵ لێرەدا تەنها تەشریفییە.. چونکە ئەگەر ئەقڵ نەبێت ناتوانرێت لە قورئان و سوننەت و ئیجماع تێبگەیت، کەواتە پیشناخرێت مەگەر بۆ تەرتیب پێشبخرێت، وەك نمونەی ئەوە دێنێتەوە کە کەسێك دەچیتە مزگەوت دەڵێت بەڕێگادا چوومە مزگەوت، بۆیە ڕێگاکە پێشخراوە وەك تەرتیبی کارەکە ئەگینا پیرۆزی

هەر بۆ مزگەوتەکەیە.. کەواتە لێرەدا هەندێك لە موعتەزیلە بە شێوەیەکی کەم جیاواز بوون لەگەڵ ئەهلی سوونەتدا، کەواتە وەسیلە تێگەیشتن بۆ قورئان و سوننەت واتا ئەداتێکە وەکو تەشریف باس دەکرێت نەك پیرۆزتربێت لە قورئان و سوننەت، چونکە وەك د.محمد موسا میسری دەڵێت: هەندێکیان لە دڵسۆزی ئەقڵیان پیش دەخست تا دوای بوو بە بیدعە و نەگبەتی بەسەر موسڵمانەنەوە، چونکە هەر پرسیارێك کە ئەهلی کیتاب یان بێدینەکان دەیانکرد موعتەزیلە ئەو بەربەستە گەورەیە بوون بۆ وەڵامدانەویان، کە نەیاندەهێشت بیروباوەڕی ئیسلامی بچوك بێتەوە، بەڵکو- گەورەتریان دەکرد، بەڵام لە دواییدا زیان و زەرەی زۆری لە بیروباوەڕی ئیسلامی دا و خەڵکی تووشی گومڕایی کرد..

هەندێك نمونە لەوانەی کە خەلقی قورئانی پێدروست بوو، وەڵامی مەسیحییەکان بوو وتیان عیسا خوای گەورە بە کەلیمە ناوی بردووەلە قورئاندا (وكلمته ألقاها إلى مريم) * ئیتر وتیان ئەگەر عیسا مەخلوق بێت خۆ قورئانیش مەخلوقە، شیکارییەکەی لە پەراوێزدا بیخوێنەرەوە بە عەرەبی؟ ئیتر ئەمە بووە هۆکاری ئەو فیتنە گەورەیە کە بە درێژایی مێژوو موسڵمانانی سەرقاڵ کرد.. تەنها بۆ ئەوەی بەرپەرچی مەسیحی بدەنەوە.. ئێستاش وایە کۆمەڵێك لە خەڵکی بۆ موجادەلە و مناقەشەی نێوانی خۆیان و عەلمانی ئەوەی کە ئەقڵی کورتی ئەوان نایبڕێت دەیانەوێت بیگونجێنن لەگەڵ ئەقڵیان.. ئاخر کێشەی گەورەش لەوەدایە کە بێ مامۆستان و ناگەڕێنەوە لای مامۆستاکانیان، یاخود ئەوەی کە بووە بە مامۆستایان جارێ پێویستە قوتابی بێت لای مامۆستەیەکی ئەهلی سوونەی شەرع زان..!

## لە ڕاستیدا ئەهلی سوننەت و جەماعە عەقلانین

ئیسلام زادەی بیری مرۆڤ و ئەقڵانیەت نیە، بەڵکو پێکهاتەی دنیای ماددی و دنیای ڕۆحانیەتە عالەمی شەهادەت و عالەمی غەیبی، بەڵام لێرەوە ئەو پرسیارە خۆی زیت دەکاتەوە کە ئیسلام ئەقڵانیەت نییە؟ ئەی چۆن باس لە ئەقلانییەتی ئیسلامی دەکرێت؟! سێ سەدە ئەم ئیسلامە هەموو سەرچاوەکانی قورئان و سوننەت و هاوەڵان و تابعین بووە کە ئەم ڕەوەندە بەڕێزانە هەمووی بە خەڵکی سەلەف ئاماژەیان بۆ دەکرێت لە مێژووی ئیسلامدا، لەدوای کردنەوەی دنیا بە ڕووی جیهانی ئیسلامیدا، بەرفراوانکردنی خاکی موسڵمانان لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسییەکاندا، تەرجومە کردنی فەلسەفەی یۆنانی کۆن بیر و بۆچوونی خەڵکی و فەیلەسوفەکانی ئێران و هیندستان و چین لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە موسڵمانان پێدەخەنە ناو زانستێك کە پێی دەوترێت ئەقڵانیەت کە بە (عیلمی کەلام، زانستی تەوحید) ناسراوە، ئەم ئەقڵانیەتە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەم موعتەزیلە و بەجێهێشتنی مەجلیسی حەسەنی بەسڕی لە لایەن واصلی کوڕی عەتا کە کاریگەری فەلسەفەی یۆنان و بیروباوەڕی یەهودی هزری ئەوانی لەسەر بوو کە ئەقڵ پێش نەقل بکەوێت! ئەم ئوصولە دەڵێت (ئازادی و هەبوونیی ئیرادەی مرۆڤ خۆی) (الأزلية وحرية الإرادة الإنسانية).. پێشتر ئاماژەم پێداوە.

کەواتە کە دەوترێت ئەقڵانیەت مەرج نیە لەسەر موعتەزیلە هەژمار بکرێت، بەڵکو کەسێکی وەك ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەسێکی ئەقڵانی بووە وەڵامی موعتەزیلەکانی داوەتەوە و بە ئەهلی سەلەف

دانراوە، بەهەمان شێوە ئەبوبکری باقلانی و ئیبن تەیمییە..هتد، دوایی بە درێژی دێمە سەرباسەکانیان.

### ئەقلانیەت چیە لە ئیسلامدا؟

کاتێك دەڵێن ئەقڵانیەتی ئیسلامی واتا: پێناسە و ماهیەتی ئەقڵە کە ئەقڵ خۆی مەلەکەیە، پاشان غەریزەیەکە و نوورێکە لە دڵەوە، ئەم ئەقڵانیەتە مەشخەڵی ڕێگاکەی لە قورئان و سونەتەوە سەرچاوە دەگرێت.

### مەلەکە خۆی واتای چی یە؟

بۆ ئەوەی باشتر لە(مەلەکە) تێبگەین پێویستی بە شیتەڵ کردن هەیە، بۆ نمونە کاتێك مریشکێك کە ڕۆژانە هێلکەکانی ئەم دیواو دیو پێ دەکات، ئەمە مەلەکەی مریشکێکە کە فێری ئەو کارە بووە بە بەردەوامی ئەیکات، واتا مریشك ئەقڵی نی یە بەڵکو مەلەکەی (فیترەتی) هەیە.

نمونەی دووەم بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە و پێناسەی مەلەکە.. هەنگێك کاتێك دەچێتە سەرگوڵێك شیلەکەی دەمژێت و دەیکات بە هەنگوین، ئەمە پێی ناوترێت ئەقڵ بەڵکو پێی دەوترێت مەلەکەی(فیترەتی) هەنگ.

خوای گەورە لە (٤٩)جێگادا باسی عەقڵی کردووە، لە قورئاندا لە (٣٠٠)جێگادا باسی موورادیفەکانی ئەقڵی کردوە، هەروەها ئەقڵانیەت لە ئیسلامدا سەرکەش و سەرەڕۆ و یاخی نابێت، چونکە کۆکراوەی نێوان ئەقڵ و دەقە، بە ئەقڵ دەقەکان دەخوێنیتەوە، تەحەکومکردنی دەقەکانە بەسەر ئەقڵەوە، ئەقڵ بەو گرنگی و گەورەیەی خۆی.. مەلەکەیە، هەموو مەلەکەتی مرۆڤ لە دنیای مادی(عالەمی شەهادەتدا) هەست پێکردنە،

هەموو هەستێکیش پانتاییەکی بەرفراوانی هەیە لە ئەقڵی مرۆڤدا، بەڵام لە دنیای ڕۆحانیەت (عالەمی غەیبی) هەموو ئەقڵ دەوستێ لە بەرزو کەماڵ و سیفەتە بەرزەکانی خوای گەورەدا هیچ هێز و ئەقڵێك پەی نابات بە دنیای ئیمانی (عالەمی غەیبی)، ئەم ئەقڵانیەتی ئیسلامییە بەشێکی زۆر گرنگە لە پێنج مەقاصیدەکەی ئیسلام کە پارێزگاری کردنە لە ئەقڵی مرۆڤەکان!، بەرەوپێش بردنی بیر و هزری ئیسلامییە.

تێگەیشتن لە ئەقڵانیەت: واتا هەست کردن بە شتێکە لەم بوونەدا هەبێت، لە بونیاد و غایەی ئەم بوونەدا بەشدار بێت، لەهەمانکاتدا لە خودی ژیانی مرۆڤدا بەشدار بێت..

بەڵام پێوەری ئەقڵانیەت شتیکی ترە دەتوانین بڵێین: هەستکردنە بە حیکمەتەکانی ئەم بوون و کەونە و خودی ئەقڵ خۆیشی..

لە ئیسلامدا سەنتەری ئەقڵ دڵە، بە ڕێکردن بەڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا ئەقڵ هەنگاو دەنێت...

کێشەی ئیمانی ئەوەیە چۆن عەقڵ لە دڵەوە سەرچاوە دەگرێت..

واتا.. بینین بۆ خۆی بوونی هەیە، بەڵام پێویستی بەسەنتەرێك هەیە کە چاوە، چاو پێویستی بە ڕووناکییە بۆ ئەوەی ببینێت..

لەم نمونەوە ئەو دەقەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد، سەنتەری بوونی ئەقڵ لەناو دڵدایە، ئەقڵیش خۆی هەست و نەست و دەرك پێکردنە، ئەم دوو بەشە لەڕیگای ڕووناکی قورئان و سونەتەوە ڕێدەکەن، کەواتە بۆمان دەرکەوت کەسەرچاوەی ئەقڵ لەدڵەوەیە، خوای گەورەش ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرمووێت:

أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لا تَعْمَى الأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ الحج

واتە: ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون بەدڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە... (کوان: خەڵکانی ڕابوردوو؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران؟ کێ ئێمەی دروست کردووە؟ ئامانج لە ژیان چییە؟؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا (چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە).

أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ الجاثية

واتە: ئایا مەگەر نەتبینیووە ئەو کەسەی کە ئارەزوو و هەوەسی خۆی دەکاتە خوای خۆی و شوێنی دەکەوێت؟! (هەرچەندە) زانستی و زانیاریشی هەبێت، هەر خوا گومڕای کردووە (لە ئەنجامی بەد هەڵوێستی خۆیدا) و مۆری ناوە بە دەستگای بیستن و دڵ و دەروونیدا، پەردەی هێناوە بەسەر چاو و دەستگای بینینیدا، جا ئیتر کێ هەیە جگە لە خوا هیدایەت و ڕێنمونی بکات، ئایا بیر ناکەنەوە و یادەوەری وەرناگرن و هۆش ناکەنەوە (بۆ ئەوەی شوێن بەرنامەی خوا بکەون؟).

بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم چەمکانە، بۆ ئەوەی دڵ و ئەقڵ لەیەکتری جیا بێتەوە پەنا دەبەمەوە بۆ دەقی قورئانی کە زیاتر بۆمان ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت:

وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْاْ عَلَى أَدْبَارِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ الإسراء

واتە: (چونکە مەبەستیان نییە تێبگەن) ئێمەش پەردە دەنێین بەسەر دڵیاندا تا هەر تێی نەگەن، گوێشیان سەنگین دەکەین، جا کاتێ کە لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت دەبەیت (باسی بت و بەرنامەیان ناکەیت) پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن و بێزاریی دەردەبڕن و دەڕۆن.

کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت خەڵکانێك خاوەنی زانیارین و ئەقڵیان بەشتەکان دەشکێت، بەڵام چونکە ئەقڵیان لە دڵیانەوە سەرچاوەی نەگرتووە وەکو مەلەکە، هەست بەو چێژە ئیمانییە ناکەن کە مرۆڤی موسڵمان هەیەتی، ئا لێرەوەیە دەتوانین ئیمان پێناسە بکەین، وەك خوای گەورە لە قورئاندا بۆمانی پێناسە کردووە و دەفەرموێت:

الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ.. ﴿٣﴾ البقرة

واتە: ئەوانەی باوەڕ بە نەبینراوەکان دەهێنن (وەك خوا و فریشتە و ئەوانەی خوا باسی کردوون و ئێمە نایان بینین.

**ئەقلانیەت، نامەعقول.**

ئەقڵانیەت لە ئێستادا لای عەلمانییەکان و هەندێك لە ئەقڵگەرەکان لە دەرئەنجامی کاردانەوەی کەهەنوتی و لاهوتی سەرچاوەی گرتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ (ئەقلانیەتێکی کاتی و ماددی لادینی بەحت) کە سەرچاوەکەی شارستانیەتی ئیغریق و فەلسەفەی یۆنانی کۆنە کە ئەقڵ بە دوور دەگرێت لە نەقڵ، واتا بەڵگە سەرچاوەی ئەقڵە، بەڵام ئەقڵ سوڵطان نییە بەسەر بەڵگەوە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە، لەدواییدا لە سەردەمی

ڕێنسانسدا ئەم بیرە زیاتر برەوی پێدرا دژی کەنیسەی کاتۆلیکی و کەهەنوت و لاهوتی، چونکە کڵێسا دەیوت..(چاو بنوقێنە و دوام بکەوە، پێویستە لەسەر تۆ کە بڕوابێنیت بە مەسیحی کوڕی خوا، بێ ئەوەی بیر لەوە بکەیتەوە کە ئەقڵت چیت پێ دەڵێت!، کەئەمەش ئیمانە، خودی ئیمان پێویستی بە عەقڵ نییە) لە دەرئەنجامی کاردانەوەی بیری کەنیسە ئەم ئەقڵانیەتی عەلمانییە و تەنویرییە سەرچاوەی گرتووە، وا خەڵکیان فێر کردوە کوێرانە دوام بکەوە بێ پرسیار کردن، من بە پیرۆز ڕابگرە، وەك (آوغسطین) دەڵێت: بڵێن ئیمان دێنین بەوەی کە مەحاڵە و نامەعقولە..

ئەمە ئەقڵانیەتی یۆنانییە کە سەرچاوەی گرتووە، لەسەر هیچ بەهایەکی ڕۆحی دانەمەزراوە بە هۆکاری ئەوەی کە دژی کەنیسە دروست بووە؛ عەلمانیەت و عەقڵگەراکان لێرەوە باس لە ئەقڵانیەت دەکات و دەیەوێت هەموو دەقەکانی ئیسلام لە وڵاتی ئێمەدا لەسەر ئەم بنەمایە بخاتە ژێر پرسیارەوە، هاوکاری کۆمەڵێك لە خەڵکی بەناو موسڵمانان دەکات بەناوی موعتەزیلەی نوێوە کە گوایە ئەمانە لەسەر بنەمای ئەقڵ خوێندنەوە بۆ دەقە ئیسلامییەکان دەکەن..!، بەڵام ئەقڵانیەتی ئیسلامی بەڵگەی ئەقڵانی لەسەر بنەمای قورئان و سوننەت ئەخاتە بەردەم خەڵکی، لە بڕوا بوون بە ئیمان بە خوای گەورە و کتێبە ئاسمانییەکان و پێغەمبەران.

لێرەدا هاوکیشەیەك هەیە لە ئەقڵانیەتدا کە زۆر جیاوازە لە هاوکێشەی ماتماتیکی، لەهەموو ماتماتکیك دا (١+١=٢) بەڵام لە ئەقڵانیەتدا پرتەقاڵێك و سێوێك ناکاتە دوو سێو یاخود دوو پرتەقاڵ، بەڵکو سێوێك و پرتەقاڵێك دەکات، هەروەها لە ئایینەکاندا وایە ئیسلام هەرگیز پێوەر ناکرێت لەگەڵ ئایینەکانی تردا بوترێت ئایین هەر ئایینە، دوایی خۆت چەواشە دەبیت، خەڵکێکی زۆریش چەواشە دەکەیت.

ئەوەی گرنگە خەڵکی پێ ئاشنا بکەم ئەوەیە کە ئەقڵانیەتی ئیسلامی بۆ هاتنە کایەی جەدەلیەتی ئیسلامییە و گۆڕینەوەی بیر و بۆچوونی جیاوازە، کاتێك کە لەگەڵ کەسێکی بێباوەڕ ئاخافتن دەکەم من ناتوانم بە (قال الله، قال الرسول ) وەڵامی بدەمەوە، چونکە ئەو لە بنەچەوە بڕوای نە بەخوا و نە بە پێغەمبەرەکەم هەیە، لە ڕاستیدا خەڵکی موعتەزیلەی کۆن لەو بوارەدا سوارچاکی مەیدان بوون، زۆر بەرگریان لە ئیسلام کرد، لەو شاڵاوە دڕندانەی کە وەك فەلسەفە و فکری ڕۆژئاوا لەسەدەی سێیەمەوە کرایە سەر ئیسلام، ئەوان توانیان ئیسلام بڵاوبکەنەوە لەسەر نەسەقێکی فکری و نەسەقێکی فەلسەفی، توانیان زۆرێك لە بیر و بۆچوونەکان.. بدەن بە زەویدا، بەتایبەت زۆرێك لە ئایینەکانی هندستان وەك زەردەشتی و شوشەنگی و میترایسمی، زۆرێك لە مەزهەبەکان وەك مەزهەبی سومانیەکان لە یەمەن، موعتەزیلە توانی بەرگرییەکی زۆر باش بکات لە ئیسلام و بیروباوەڕی ئیسلامی لە سەردەمی کۆن و نوێدا واتا مەبەستم فەلسەفەی کۆنی ئەوروپا وەك سوقراتیات و ئەفلاتونیات، وەك بیر و فەلسەفەی نوێ سەردەمی ڕێنسانس سەرهەڵدانی سەردەمی گەورەیی فەلسەفە، بۆ ئەوەی موسڵمانان وێنایەکی زۆر خراپ لە موعتەزیلە وەرنەگرن، ئەوانیش دوو جۆرن وەك ئاماژەم پێدا (ئیبن تەیمییە )لە کتێبی (درء تعارض العقل والنقل) کە دەیانکات بە موعتەزیلەی بەسرە و بەغداد، ئەوانەی بەسرە بە ئەهلی سوننە و جەماعە دەزانێت ئەوانەی بەغداد کە دەیان وت قورئان مەخلوقە، زۆریکی تر لەم جەدەلە بێمانایە کەهیچی لەسەر بونیاد نانرێت، بەڵام کاتێك کە ئەقڵانیەت بە زانست کرا.. سەرەتای بەزانست کردنی ئەقڵانیەت لە ئیسلامدا لەسەردەستی زانای پایەبەرز (ئەبوبکری باقلانیە) لەساڵی(٤٠٣)کۆچی کتێبێکی

نووسی بە ناوی (التمهید) پاشان ئیمامی (غەزالی) لە ساڵی (٥٠٥) کۆچی زیاتر پەرەیپێداو لەچەند کتێبێکدا کردیە مەعریفە و وەك زانست کاری پێکرا لەو کتێبانە (مدارك العقول، معیار العقول، محك النظر، المستصفی)، هەروەها زیاتر ئەم ئەقڵانیەتی ئیسلامیە کرایە مەنهەج بە هەموو دنیادا بڵاو بووەوە، لەسەردەمی (ئیبن ڕوشد)ی ئەندەلوسی لە ساڵی (٥٩٥) کۆچی توانی مۆنۆپۆڵی بیرو هزری هەموو ئەورپا بکات وە تەنانەت تەرجومەی هەموو فەلسەفەی یۆنان بکاتەوە و سەرلەنوێ بیخاتەوە بەردەست مرۆڤایەتی! لە پاشاندا لە سەردەمی مەمالیك کە زمانی عەرەبی وردە وردە بەرەو لاوازی هەنگاوی دەنا عەقڵانیەتی زیاتر برەوی پێدرا لە سەردەستی کەڵەزانای کورد (ئیبن تەیمییە) لە کتێبێکدا بە ناوی (درء تعارض العقل والنقل) لەساڵی (٧٢٨) کۆچیدا، لە ڕێگای ئەم زانایانەوە.. بووە هۆکاری ئەوەی کە ئجتیهاداتی زۆر گەورە لە ئیسلامدا بکرێت ئیسلام گەیشتە سەردەمی شارستانیەتی خۆی لە ماوەی سیانزە سەدەدا، کە وشەی ئازادی بەرقەراربوو لە هەموو مەیدانەکانی ئیسلامیدا، هەرچەندە... لە بیرو باوەڕ، شەریعەت، زمانەوانی، فکر..هتد لای هەمووان ئاشکرایە لە ئیسلامدا وشەی ئازادی بە مەفهومی(الحریة) دەست ناکەوێت، بەڵام لە ئیسلامدا بۆ ئازادی بیرو ڕا وشەی(الاختیار) مورادفی ئازادی بووە، چونکە وشەی الحریە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای خێر و چاکە هاتووە! وەك دەڵێن (فالساعي الى الخیر بحریة هو الانسان المالك لحق الاختیار) پاشان لە سەردەمی نوێدا ئەو قوتابخانە ئەقڵانیەتانەی کە سەرلەنوێ دامەزرانەوە، لەسەر دەستی محمد عبدە، جەمالەدەینی ئەفغانی، کواکبی، ئیقباڵ..هتد، بەڵام ئەم نوێبوونەوە جیاوازتربوو لە سەردەمەکانی تر لە ئەقڵانیەت، چونکە داگیرکەری

ئیستبدادی بە هێزی سەربازیەوە هاتە ناو جیهانی ئیسلامی، ئەمان دیانویست وەك شارستانیەتی ڕۆژئاوا بکەن تا بە شارستانیەتی خۆیان کێبرکێیان لەگەڵ بکەن.. ئەمانیش بوونە هۆکاری نەهامەتی و نەگبەتی بۆ موسڵمانان بوونە پرد بۆ هاتنی عەلمانیەت بۆ وڵاتی موسڵمانان و پارچە پارچە کردنی ئوممەتەکە، ئێستاشی لەسەر بێت، ئێمە گیرمان کردووە بە دەستی بیرو بۆچوونی لیتاوی و زۆنگاوی ئەرەگۆن و سروشت و حامید ئەبوزیدە شەریعەتی و مەلکیان، کە هەمووی سەرچاوەی موعتەزیلە نوێکانن، نەك لە قوتابخانەی ئیسلامیەوە سەرچاوەیان گرتبێت، بەڵکو بەناوی ئیسلامەوە لە قوتابخانەی فۆکۆ و دیکارت و کامۆیو قوتابخانە ئەقڵانیەکانی فەرەنسا و ئینگلیزەوە سەرچاوەیان گرتبوو، بەڵام بە ناوی ئیسلام و موعتەزیلەی داماو، دەیانویست خۆیان بکەنەوە بەناوی لاوی موسڵمان و موسڵمانانیان بەو دەردە برد کە لە ساڵی شەستەکاندا لە پیاوانی زۆر پیر نەبێت کەس نەدەچووە مزگەوتەکان دین وای لێهات لەسەر دەستی ئەمانە کە تەنها بە طقوسات(سرووت) دەبینرا لای خەڵکی و کەلام و فەلسەفەی وشکیان پێش قسەی خوا و پێغەمبەرەکەی خستبوو.

گەورەترین هەڵەی عیلمانی وعەقڵگەراکانی نوێ ئەوەیە لە وڵاتی ئێمەدا دەیەوێت بە چاوی شارستانیەتی ئەورپا کە ئێستا دامەزراوە لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامدا بەخورد بکات!

ئەقڵانیەت بێ ڕەچاوکردنی ڕەهەندەکانی شارستانیەت، مەحاڵە بتوانرێت ئەقڵانیەتی ئەورپا بەسەر وڵاتانی ئیسلامی و خەڵکی موسڵمان پەخش بکرێت، چونکە شۆڕشی گەلانی تر بۆ ئازادی بیروباوەڕیان بووە، بەڵام لە جیهانی ئیسلامی کێشەکە لەسەر بیروبۆچوون و ئایین نەبووە، ئەوەندەی کە شارستانیەتی تر ویستویانە داگیرمان بکەن ئەوان ویستویانە

بیری خۆیان بچەسپێنن، خەڵکی موسڵمان شۆڕشیان نەکردووە دژی ئایینی ئیسلام بۆ ئەوەی داوای ئازادی بیروبۆچوون و ڕای ئازاد بکەن، لە مێژوودا شتێکی وا نابینیت.. یاخود بۆ ئازادی بۆ فەرهەنگەکانی تری ژیان تێڕابمێنیت زۆر بە دەگمەن دەبینی لە جیهانی ئیسلامیدا شۆڕشێك کرابێت بۆ ئازادی بیروباوەڕ، ئەگەر بڵێم هەر نەبووە لەوانەیە زیادەڕەوییم نەکردبێت، ئەگەرچی زۆربەی زۆری شۆڕشەکانی ناو جیهانی ئیسلامی.. ئیسلامیان کردۆتە پێشەنگ و ئایدۆلۆژیا بۆ بەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی و سیاسی و ئازادییەکان بەگشتی، بەڵام دەکرێت بە درێژایی مێژوو لە ناو جیهانی ئیسلامیدا ململانێ لە نێوانی ئومەوی و عەباسی، موەحدین و مورابطین، عوسمانی و صەفەوی، خواریزمی و غوری، هەبێت بۆ دەسەڵات و قەڵەمڕەوی خۆیان زیاد بکەن، هەموو هەر هەمان ئەدەبیاتی ئیسلامیان پێشکەش بەخەڵکەکانیان کردووە بێجگە لە قورئان و سوننەت شتێکی تازەیان نەداوە بەخەڵکی، هەموو خەڵکەکانیش ڕازی بوون بەو ئیسلامە، چونکە لەگەڵ فیطرەت و بیروبۆچوونیان گونجاو بووە، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی داونەتەوە؛ لە ئیسلامدا هەموو ئەقڵانیەتێك مەرغوب نیە.

ئەو کەسانەی کە خۆیان بە ئەقڵانی دەزانن، گرنگە لە کۆتاییدا ئا لەم جۆرە کەسەنە نەبن..

وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١٠﴾ الملك

واتە: (ئینجا بە حەسرەتەوە) دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایە و بیر و عەقڵ و هۆشمان بەکار بێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ...

فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١١﴾ الملك

واتە: (بەناچاری و خەجاڵەتییەوە) دان بە گوناهو تاوانی خۆیاندا دەنێن، جا ئیتر نیشتەجێکانی دۆزەخ لەولاوەتر چن.

أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴿٢٤﴾ محمد

واتە: ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە قورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن؟! یان ئەوەیە دڵەکانیان لە ئاستی ڕاستیدا قفڵ دراوە؟!

کەواتە لێرەشدا ئەوە باشتر ڕوون دەبێتەوە، باخەڵکێکیش ئەقڵی هەبێت، بەڵام ئەگەر لەدڵیەوە سەرچاوەی نەگرت توانای ڕاڤەکردنی قورئانی نییە، ئەگەرچی زمانزانی عەرەبی بێت و دەیان ناوی زل و (د) و ناسناوی وێران لەخۆی بنێت، وەك دەڵێن: پسپۆڕ و شارەزا لەبواری ئیسلامی سیاسی و یاخود لە ئیسلامییات شارەزایە و یان پرۆفیشوناڵە لە بیری ئیسلامی دا، بەڵام ئەگەر لەڕاستیدا دڵی قفڵی لێدرابێت ئەوە لەگەڵ ئاژەڵ دا بەراورد دەکرێن، وەك خوای گەورە پێناسەیان دەکات و دەفەرمووێت:

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ الفرقان

واتە: ئایا وادەزانیت زۆربەی ئەوانەی ڕاستیەکان دەبیسن، یا بیرو هۆشیان دەخەنە کار؟ ئەوانە هەروەك ماڵات وان، بەڵکو گومڕاتریشن.

لە کۆتایدا ئەوە دەڵێم خەڵکی وا پەی دەبات کە من بۆ بەرانبەر بە عەقڵگەراکان ناو موسڵمانان بە هەمان شیوەی عەلمانی بەرخوردم لەگەڵ کردن، لەڕاستیدا لای من عەقڵگەراکانی ئێستا و عەلمانییەکان هیچ جیاوازیان نیە، چونکە بۆ رازیکردنی ئەوانی کرد، هەرکەسێکش بیبەوێت کەسێك ڕازی بکات ئەوا واتای ئەوەیە خۆشیدەوێت یان لێیدەترسێت،

کەسێکیش کەسێکی خۆشویست وەك ئەوە و لەگەڵی حەشر دەکرێت و لێترسانیش ئەوە دەستەمۆیەتی و ئەصڵ ئەوەیە موسڵمان تەنها لە خوا دەترسێت.[١]

---

(١) فمعنى أن عيسى هو كلمة الله أنه كان بكلمة الله «كن» كما قال السلف من المفسرين. قال الإمام أحمد بالكلمة التي ألقاها إلى مريم حين قال له: (كن) فكان عيسى بكن، قال تعالى: [إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آَدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَاب ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ] آل عمران: ٥٩. وقال أبي ابن كعب معنى قوله تعالى: [فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا] [التحريم: ١٢] عيسى رُوح من الأرواح التي خلقها الله تعالى واستنطقها بقوله: [أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى] [الأعراف: ١٧٢]. قال الحافظ ابن حجر في فتح الباري: وصفه بأنه منه، فالمعنى أنه كائن منه، كما في قوله تعالى: [وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ] الجاثية: ١٣. أي سخر هذه الأشياء كائنة من الله تعالى، فهو مكون ذلك وموجده بقدرته وحكمته.

# شیعــە بناســە

زانایانی ئوصوڵ دەڵێن: ”الحكم على الشيء فرع عن تصوره“ واتا بڕیاردان لەسەر شتێك بەشێکە لەناسین و زانین.. نمونە بۆ ئەم ڕێسا مەنطیقییە (لۆژیکییە)، ئەگەر کەسێك شتێك حەڕام بکات، دەبێت خۆی لەو شتە بزانێت بۆ نمونە ئەگەر کەسێك دۆمینە حەڕام بکات دەبێت بزانێت دۆمینە بۆ خۆی چییە، یاخود ڕیبا حەڕام دەکات، دەبێت لە جۆری ماهیەتی پارەو فرۆشتن و وەرگرتنی کاڵا شارەزا بێت، دەنا توانای بڕیاری حەڵاڵ وحەڕامی نابێت، کەواتە بڕیاردانیش لەسەر شیعە ئەگەر نەیان ناسێنین تێنەگەین لەوەی کە خۆیان چین؟ لە کوێوە سەرچاوەیان گرتووە؟ زۆر ئەستەمە ئاخافتن لەسەر ئەم کۆمەڵە لادەرە، بۆ ئەم مەبەستە چۆن دەتوانین لەگەڵ ئەهلی سوننەت جیایان بکەینەوە. بەکورتی دەمەوێت ئەوە بڵێم پێش ئەوەی هێرش بەربم یاخود بەرگریکار لە شیعە، دەبێت بزانین سەرەتا شیعە کێن؟ لە کوێوە سەرچاوەیان گرتوە؟ باکگراوندی بیروباوەڕ و تێگەیشتنی فقهی و شەرعیان چییە؟ مێژوویان چییە؟ واقعیان چییە؟ ئامانج و خەونیان چییە؟ ئەوکات کە ئەمانەمان ڕوون کردەوە بە ئاسانی و بە بەرچاو ڕوونی دەتوانین بڕیاریان لەسەر بدەین.

## شیعە کێن؟!

ئەم دۆسیەیە تەنها دۆسیەی گەلێك یاخود هۆزێك نییە کە لە جێگایەکی دیاریکراودا دەژین، یاخود لە وڵاتێك لەوڵاتەکاندا بوونیان هەیە، یاخود کۆمەڵێك کێشە کەوتۆتە نێوان کۆمەڵێك لە وڵاتانی دراوسێ، بەڵکو ئەم کێشەی شیعەیە بناغەیەکی گرنگی هەیە لە بیروباوەڕ لە فیقهی ئیسلامی

و لە مێژوو..کەواتە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکەی.. زۆرێك لە مێژوونووسان کۆك نین لەسەر سەرهەڵدانی شیعە، ئەوەی کە لەلای زۆربەی خەڵکی باوە، ئەمان سەر بە عەلی کوڕی ئەبوطالیبن، دژایەتی مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانیان کردووە (ڕەزامەندی خوا لە هەردوولایان بێت)، بەڵام مانای ئەوە نییە ئەوەی کە پشتگیری عەلی کوڕی ئەبوطالیبی کرد ئەوە شیعەیە، ئەوەی پشتگیری یاخود شوێنکەوتووی معاویە بێت ئەوە ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.! نەخێر بەڵکو کەس بەمە ڕازی نییە، بەڵکو ئەوەی کە ئەهلی سوننەت لەسەری دەڕوات لەو کێشەیە کە کەوتە نێوان ئەو دوو هاوەڵە بەرێزە ڕەزامەندی خوا لە هەردووکیان بێت، عەلی لەسەر حەق بوو، تێگەیشتن و ئیجتیهادەکەی معاویە نەگیشتبووە صەواب(ڕاستی) لەو کێشەیەدا، بۆیە هەموو زانایان ڕایان وایە کە حەق لای عەلی یە.

کەواتە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە لەو زەمەنەوە جیاناکرێتەوە لەگەڵ شیعە، کە ڕای جیاوازیان لەسەر ئەوە بووە کە ئەو سەردەمە شیعە دروست بووە، لەسەر مەبدەئی ئەوە بێت کە ئەهلی سوننە پشتیان لە ئەمیری موسڵمانان عەلی کردبێت، نەخێر هەرگیز لە یەك سەرچاوەی ئەهلی سوننەتدا شتێکی وا بەدی ناکرێت؛ کەواتە ناکرێت بڵێین سەردەمی شیعە لەو زەمەنەوە سەرچاوەی گرتووە کە ڕای جیاواز لەسەر دەسەڵاتی خیلافەت کەوتە نێوان ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزەوە. هەندێکی تر لە مێژووناسان پێیان وایە و دەڵێن: سەردەمی دەستپێکی شیعە لە شەهیدکردنی حوسێنی کوڕی عەلی دەست پێدەکات_ ڕەزامەندی خوای لێبێت، کە منیش بۆ خۆم لەسەر ئەم ڕایەم و ئەمەم پێ بەهێزترە؛ چونکە حوسێن لە خیلافەتی یەزیدی کوڕی معاویە دەرچوو، ڕووی کردە وڵاتی عێراق کە بانگێشتیان کردبوو بۆ ئەو وڵاتە، بەڵام خەڵکی عێراق پەیمانەکەیان نەپاراست و پشتیان بەردا و خیانەتیان کرد بە

حوسێن و شەهیدیان کرد؛ ئەوەی بەشدار بوو لەو تاوانە گەورەدا خەڵکی کەربەلا بوون لەوانە.. سینانی کوڕی نەخعی، شەمری کوڕی زولجەوشەن، عوبێدوڵڵای کوڕی زیاد، خوولی کوڕی ئەصبوحی، یەزیدی کوڕی معاویە، کە دەرحەق بەو تاوانە گەورەیە هەموو ئەمانە بە سزای خوایی گەیشتن، سینان لەدوای ماوەیەك کەڕ و شێت بوو بە ئاشکرا پیسایی خۆی دەخوارد، شەمر و خەولی هەردووکیان سەگ خواردنی زۆر بە کەساسی مردن، پاشان عوبێدوڵڵا کوشتیان و مار چووە ناو لوتی و چاوی.. وەك پەند و عیبرەتیان لێهات، دوای چوار ساڵ هیچ کەس ڕێزی لە یەزید نەدەگرت، دوایی خۆی لەداخاندا گیانی دەرچوو گەڕایەوە بۆلای خوای خۆی..

ئەم کارەساتەی حوسێن ئەو تاوانە گەورەیەی کە دەرحەق بە پەنجا کەس لە ئالو بەیت کرا، بووە هۆکاری ئەوەی کە کۆمەڵێك لەو خەڵکە پەشیمان بن لەو کارەیان.. بۆ ئەوەی خوای گەورە لەو تاوانە گەورەیەی کە کردوویانە خۆش بێت، بڕیاریان دا شۆڕش بکەن لەدژی دەسەڵاتی ئومەوی، ئەم شۆڕش و دەرچوونە ڕوویدا، زۆرێك لەو نێوەندەدا کوژران، لێرەوە ئەم کۆمەڵە بە شیعە ناسران.. کەواتە شیعە پەیوەندی تەواویان لەگەڵ حوسێنی کوڕی عەلی هەیە ڕەزامەندی خوای لێ بێت، نەك عەلی کوری ئەبو طالیب، هەموومان دەبینین کە زیاتر یادی شەهید بوونی حوسێن دەکەنەوە، بەڵام زۆر گرنگی نادەن بە عەلی کوڕی ئەبو طالیبی باوکی، لە کاتێکدا هەردووکیان شەهیدن!!. لێرەوە ئەم کۆمەڵە سەرهەڵئەدەن، وەك کۆمەڵێکی سیاسی نەشونما دەکەن دەیانەوێت دەسەڵات لە دەستی ئومەویەکان وەربگرنەوە، لێرەوە ئەم فیکری مناصرەکردنە دەست پێدەکات، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی نییە بە بیرو باوەڕەوە یاخود بوبێتە مەزهەبێکی فیقهی ڕاجیاوازیان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا هەبێت، بەڵکو

سەرەتا سەرکردەکانی شیعە و ئیمامەکانیان هیچ جیاوازیەکیان نەبوو لە ڕووی بیروباوەڕ و فیقهەوە لەگەڵ ئەهلی سوننەت.

لەدوای شەهیدکردنی حوسێن -ڕەزامەندی خوای لێبێت-، بۆ ماوەی چەند ساڵێك ڕەوشەکە هێور بووەوە.. لەم ماوەیەدا کەسێك سەرهەڵئەدات بەناوی (عەلی زین ئەلعابدین کوڕی حوسێن) کە باشترین خەڵکی سەردەمی خۆی بووە یەکێك بووە لە زانا و زاهید و عارفەکان، هیچ کەس هیچ شتێکی خراپی لێ نەدیوە و لێیان نەگێڕاوەتەوە لە ڕووی بیروباوەڕ و فکر و فیقهیەوە؛ ئەویش لەسەر ئەوە بووە -ڕەحمەتی خوای لێبێت- کە هاوەڵان و شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بوون..

لە کوڕانی عەلی کوڕی زین ئەلعابدین دوو پیاوی گەورە و دیندار لەسەر بناغەی وەرع و تەقوا لە زەمینەکەدا دەناسرێن بە ناوی (محەممەد ئەلباقر و زەید) هەردوو ئەم کوڕە بەرێزانە لەسەر ڕای زانایانی سوننەتدا بوون، ئەوەی کە هاوەڵان و شوێنکەوتوان لەسەری بوون، بەڵام زەید کوڕی عەلی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- ڕای جیاوازی هەبوو دەیفەرموو کە عەلی کوری ئەبو طالیب لە پێشترە بۆ خەلافەت لە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان، ئەگەر چی ڕایجیاوازی هەبوو لەگەڵ هەموو ئیجماعی ئوممەت دا، وە ڕای جیاواز بوو لەسەر ئەو هەموو فەرموودەیەی کە فەزلی ئەو سێ هاوەڵەی داوە بەسەر عەلیدا، هەرچەندە ئەم ڕاجیاوازیە ناچێتە باس و خواستی بیروباوەڕەوە، چونکە فەزلی ئەو سێ خەلیفە نادەن بەسەر عەلیدا، بەڵکو عەلی بە پێشتر دەزانێت بۆ خەلافەت، هیچ لە قەدر و توانای ئەم خەلیفانە کەم ناکاتەوە، تەنها لەم بارەیەوە ئەم پیاوە بەڕێزە کە زەیدی کوڕی عەلی یە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا، بەڵام لە هەموو بوارەکانی تری بیروباوەڕ و فیکر و فیقهدا یەك ڕایان هەیە هاوسۆزو هاو دەمن.

زەیدی کوڕی عەلی وەك باپیری حوسێن چەند جار دەرچوو لە خەلافەتی ئومەوی شۆڕشی دەست پێکرد، هەمان ئەزموونی حوسێنی دووبارە کردەوە -ڕەزامەندی خوا لە بێت-، لە سەردەمی هیشامی کوری عەبدولمەلیك، کۆتایی هات بە ژیانی زەیدی کوڕی عەلی کوڕی زین ئەلعابدین کوڕی حوسێن کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالیب، لە ساڵی (١٢٢)کۆچی کوژرا بەدەستی خەلافەتی ئومەوی، لەدوای مردنی ئەم پیاوە بەڕێزە مەزهەبێك دروست بوو لە مێژوودا ناسراوە بەناوی مەزهەبی زەیدی(الزيديَّة) کە دەگەڕێنەوە سەر زەیدی کوڕی عەلی، ئەم مەزهەبە هەرچەندە لەسەر شیعە هەژمار دەکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا هیچ ڕاجیاوازیان نییە، تەنها لە پێشتری عەلی کوڕی ئەبو طالیب نەبێت بەسەر سێ خەلیفەکانی ڕاشدیندا بۆ فەرمانڕەوایی، شوێنکەوتووی ئەم مەزهەبە لە یەمەن بڵاو بوونەتەوە، بەڵام ئێستا هیچ بوونێکیان نیە وەك ئەوەی یەکەم جار هەبوون!!، ئەمانە نزیکترین شیعەن لە ئەهلی سوننەت، یان دەتوانین بڵێین ئەمانە لە ئەهلی سوننەت جیاناکرێنەوە.

لێرەدا ئەوەی کە گرنگە ئاماژەی پێبکەم، لەناو ئەم مەزهەبی زەیدیەدا کۆمەڵێك کەوتنە قسەکردن لەسەر ئەوەی ئایا ئەبوبەکر و عومەر شیاون بۆ خەلافەت؟ کۆمەڵکیان خۆیان سەرلێشێواو کرد و ڕەفزی خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر دەکەن، لێرەوە ئەم کۆمەڵە بوون بە دووبەش ئەوبەشەی کە جیا بوونەوە لە مێژوودا ناسراون بە ڕافیزە(الرافضة)؛ لەبەر ئەوەی ڕەفزی ئەو دوو خەلیفەیان کرد ئەبوبەکر و عومەر، لەهەمان کاتدا ڕەفزی ڕای زەیدی کوری عەلی یان کرد!، لەدواییدا ئەم گروپە مەزهەبی دوانزە ئیمامی "الاثنا عشرية" دروست دەکەن کە گەورەترین مەزهەبی شیعەن. پێش ئەوەی کە زەید بکوژرێت مەحممەد باقری برای بەچەند ساڵێك پێش ئەو وەفات دەکات،

واتا لەساڵی (١١٤)کۆچی.. کوڕێکی زانای لە دوای خۆی بە جێهشتوە ئەویش (جەعفەری ساددقە) ئەمیش یەکێکە لە زانا بەناوبنگەکانی ئومەتی ئیسلامی.. کە شوێنکەوتووی هاوەڵان و تابعی و زانایانی ئەم ئیسلامە بووە. لە کۆتایی دەسەڵاتی ئومەویەکاندا بزووتنەوەی عەباسی کەوتە چالاکی و بزواوتن دژی خیلافەتی ئومەوی ئینقیلابی کرد بەسەر خیلافەتی ئومەویدا ئەم بزووتنەوەیە هاوکار بوو لەگەڵ ئەو گروپەی کە لە زەیدی کوڕی عەلی جیابونەوە، توانیان خەلافەتی ئومەوی بڕوخێنن لە ساڵی(١٣٢) کۆچیدا، بە سەرکردایەتی ئەبو سەفاحی عەباسی و ئەبو جعفەری مەنصور، بەڵام لە دواییدا توشی بێ هیوایی بوون چونکە دەیانویست کەسێك لە بنەماڵە و کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو طالیب خیلافەت بگرنە دەست، لەدوای ئەو بێهیواییە کەوتنەوە ئینقیلاب و شۆڕش دژی عەباسییەکان؛ ئەمجارە بەناوی ئەوەی کەئەمان بزووتنەوەی طاڵیبینن واتا دەگەڕێنەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو طالیب لە بەرانبەردا عەباسییەکانیش دەگەڕێنەوە سەر عەباسی کوڕی عەبدولمطەلیب_ ڕەزامەندی خوایان لێبێت-. هەتا ئێستا هیچ ڕاجوێیەکی جیاواز لە نێوانی ئەمانەدا نابینرێت لە ڕووی بیرو باوەرو فیکرو فیقهەوە، تەنها حوکمرانی نەبێت، لەگەڵ جیاوازییان بۆ دەسەڵاتی ئەبوبەکر و عومەر کە عەلی لە پێشتر بووە بۆ خیلافەت، بەڵام کۆمەڵەکەی تر کە جیابوونەوە لە زەیدی کوڕی عەلی ئەوان پێیان وابوو ڕەفزی خیلافەت دەکەن نە دەترسان لەوەی کە لەعنەتی ئەو دوو هەوەڵەیان دەکرد.. بە مەلعون ناویان دەبردن، پەنادەگرم بەخوای گەورە لەو کوفرەی کە دەیان کرد!...

لەدوای وەفاتی جەعفەری ساددق لە ساڵی (١٤٨) کۆچی لە دوای خۆی کوڕێکی بەجێهێشت بەناوی (موسای کاظم) ئەویش پیاوێکی زانا و عارف و خاوەن تەقوا بوو، بەڵام وەك باوکی نەبوو، ئەمیش لە ساڵی

(١٨٣) کۆچی دوایی کرد لەدوای خۆی چەند کوڕێکی جێهێشت، بەناوبانگترینیان عەلی کوری موسای کاظم و ڕەضای موسای کاظم. پاشان خەلیفەی عەباسی بەناوبانگ (المأمون) ویستی شۆڕشەکان دابمرکێنێتەوە کە بزووتنەوەی طالیبنیان دروستیان کردبوو، داوای حوکمی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو طالیبیان دەکرد، ڕازی نەبوون بە فەرعی عەباسی کوڕی عەبدولموطەلیب، عەلی کوڕی موسای کاظمی کردە جێنشین و وەلی عەهد، بەڵام لە ساڵی (٢٠٣)کۆچی کتوپڕ وەفات دەکات، لەم کاتەدا بزووتنەوەی طالیبین بانگەشەی ئەویان کرد کە گوایە مەئمون کوشتوویەتی، سەرلەنوێ شۆڕش و ئینقیلابات دەستی پێکردەوە، چۆن بەسەر ئومەویەکاندا دەیانکرد بە هەمانشێوە لەگەڵ عەباسییەکان دەستیان پێکرد.

بەگوێرەی سەردەمەکان تا ڕادەیەك شۆڕشەکان هێور بوونەوە، تاکو ئەو سەردەمەش هیچ شتێك بە دی نەدەکرا بەناوی مەزهەبی شیعی کە مەزهەبێکی سەربەخۆ بێت، بەڵام هەر بزووتنەوەی سیاسی بوون بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، هیچ جۆرە جیاوازییەك نەبوو لە نێوانی بیروباوەڕیان، لەهەمانکاتدا لە ڕووی فیقهیشەوە کە وەکو ئێستا شیعە هەیەتی لە ڕووی مەنهجەوە جیاواز نەبوون. پاشان ئەوەی کە جێگای ڕامانە ئەوەیە کە ناوچەکانی فارس و ئێرانی ئێستا.. داوای جیابوونەوەیان دەکرد لە خیلافەتی ئیسلامی!!، چونکە بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە فەتح کرابوون بە حەسرەتەوە دەژیان بۆ شارستانیەت و ژیاری خۆیان، بەتایبەت پاشاکانیان، خۆیان بە خەڵکێکی جیاواز تر دەزانی لە موسڵمانان، تەنانەت زۆر جار خۆیان بە خەڵکێکی ڕاقی (شکۆدار) تر ئەدا لەقەڵەم، لەو سەردەمەدا.. بیری گەل و هۆزگەرایی کەوتبوە مێشکی فارسەکان کە زیاتر ئینتیمایان بۆ گەلی فارس هەبوو نەك بۆ ئیسلام، تەنانەت ئاگریان

ئەپەرست زۆرێك لە فارسەکان بە هیچ شێوەیەك خۆشەویستییان بۆ ئیسلام نەبوو. لەگەڵ ئەوەی کە هیچیان بۆ نەدەکرا لەگەڵ دەسەڵاتی ئیسلامیدا هیچ توانایەکیان نەبوو بەرانبەر بە خیلافەت، بۆیە ناچار پشتگیرییان لە بزووتنەوەی طالیبین کرد، پشتگیری هەموو شۆڕشەکانیان کرد بە ماڵ و سەروەت و سامانیان.. بەو ئامانجەی کە دەوڵەتی ئیسلامی بەوان لاواز بکەن!!...

بەڵام ڕاستەوخۆ نەیاندەویست واز لە ئیسلام بهێنن، دەیانویست بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری(تحریف) بکەن کلتور و شارستانیەتی خۆیان بپارێزن، هەروەك چۆن لەسەرەتاوە پێیان وابوو کیسراکان ڕۆحی خوایان تێکەڵە، بەو شێوە لە طالیبیەکان خۆیان نزیك بکەنەوە بەو مەبەستەی کە سەر بە ئالو بەیت و عەلی کوڕی ئەبو طالیبن. گەلی فارس و بزووتنەوەی طالیبین بەناوی ئالو بەیتەوە یەکیانگرت تا بتوانن کیانێکی سەربەخۆ دروست بکەن، ئەم کیانە تەنها سیاسی نەبوو، بەڵکو کیانێکی ئایینی نوێ بوو!. پاشان ئەم بزووتنەوەیە لەگەڵ فارسەکاندا بەدوای ئەوەدا دەگەڕان کە کەسێکیان دەست بکەوێت لە سولالەی (نەوەوی) طالیبین واتا عەلی کوری ئەبو طالیب، کەوتنە خەبات و شۆڕش، پاشان لەدوای وەفاتی عەلی ڕەزا کە مەئمون هەڵیبژاردبوو بۆ جێنشینی خۆی، کوڕێکی بوو بە ناوی (محمد الجواد) ئەم کوڕە لەساڵی (٢٢٠) کۆچیدا.. کۆچی دوای کرد ئەمیان کردە پێشەوای خۆیان، پاشان ئەمیش کوڕێکی لە دوای خۆی جێهشت بەناوی (عەلی کوڕی محمدالهادی) ئەم پیاوە لە ساڵی (٢٥٤) کۆچی وەفاتی کرد کوڕێکی لە دوای خۆی جێهشت بەناوی (حەسەنی کوڕی عەلی) لەقەبەکەی بە (عەسکەری) ناوزەد دەکرا؛ ئەمیش کتوپڕ لەساڵی (٢٦٠) کۆچی.. کۆچی دوایی کرد، لەدوای خۆی ئەم پێشەوا

بەڕێزە کەسێکی بەجێهیشت بەناوی محەممەد کە تەمەنی پێنج ساڵ بوو نەدەشیا بۆ وەرگرتنی دەسەڵات.

بەدرێژایی مێژووی ئەم بزووتنەوە جیاخوازانە کە خۆیان بەشێك بوون لە بنەماڵەی ئالو بەیت، فارسیش بەشێك بوون لە بزووتنەوەکە، هەمیشە ئەم بزووتنەوەی طالیبین پێشەوایەتیان ئەدایە دەست بنەماڵەی ئالو بەیت کە ناسراو بوون بە بزووتنەوەی طالیبین.. دەبوو کوڕە گەورەی ئالو بەیتی پێشەوایەتیان بکات، واتا ئەم پێشەوایەتییە بە عەلی ڕەزا دەستی پێکرد تا حەسەن عەسکری کە کۆتاییانە، بەڵام پێش عەلی ڕەزا نە باوکی کە ناسراوە بە موسای کاظم و نە باپیریان ناسراو بە جەعفەری سادق و نە باپیری باوکی (محمدالباقر) هیچیان بەشدار نەبوون لەو شۆڕشانەی کەناویان نابوون طالیبین، سەرکردایەتیان نەکردوە کە دژی عەباسی و ئومەوی کردوویانە. بەڵام لە دوای وەفاتی حەسەنی عەسکەری لە ساڵی (٢٦٠)کۆچیدا ئەم بزووتنەوە شۆڕشخوازە لە بازنەیەکی بەتاڵدا دەسووڕانەوە هیچ کەسیان دەست نەدەکەوت بۆ ئەوەی سەرکردایەتیان بکات کە لە ئالو بەیت بێت، ئاماژەم پێدا کە حەسەنی عەسکری کوڕێکی منداڵی لەدوای خۆی بەجێهشت، لە هەمووی نا هەموار تر بۆ ئەم بزووتنەوەیە چاوەڕوانی گەورە بوونی ئەم منداڵەیان دەکرد کە ناسراوە بە محەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری، کەچی کتوپر کە چاوەڕوان نەدەکرا ئەم منداڵ کۆچی دوای کرد!، لەدوای وەفاتی ئەم منداڵە ئەم بزوتنەویە بوون بە چەند پارچەیەکەوە هەریەکە لەسەر بیروڕاو تەنانەت دامەزراندنی ئایینێکی نوێ بوون!.

بەشێك لەم کۆمەڵانە ناسران بە دوانزە ئیمامی، کە ئەم کۆمەڵە ئێستا هەن لە ئێران و عێراق و لوبنان.. کە ئەمانە زۆرترین شیعەن لەم سەردەمەی

ئێستاماندا. ئەم کۆمەڵە نەیان دەتوانی ڕێ بکەن بەوەی کە سەرکردەیەکی ئالو بەیتیان لەگەڵ نییە، ناچار بە فرتو فێڵ بۆ ئەوەی ڕێگاکەیان تەواو بکەن چەند بیدعە و خورافاتێکیان دامەزراند، کە لە قوتوی هیچ عەتارێکدا جێگای نابێتەوە، مەگەر هەر شیعەی ئێستا باوەڕی پێبکات، هەروەك چۆن عەلی شەریعەتی دەڵێت: ئەگەر خورافات لە شیعە وەربگیرێتەوە ئەوا هیچیان پێنامێنێت!. بەڵێ ئەم گروپە چەند داهێنراوێکیان داهێنا لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، کە زۆر ترسناك بوو، وایان دا بە گوێی خەڵکیدا کە ئەمە بەشێکە جیانابێتەوە لە ئایینی ئیسلام، تا وای لێهات ئەم داهێنراوانە(بیدعە( بوو بە بەشێك لە بیروباوەڕو تەکوینیان؛ یەکێك لەو بیدعانە بریتیبوون لە ئیمام، کە پێیان وایە تەنها دوانزە ئیمام هەیە کە بەم شێوە ڕیزیانکردووە (١- علي بن أبي طالب. ٢- الحسن بن علي. ٣- الحسين بن علي. ٤- علي زين العابدين بن الحسين. ٥- محمد الباقر بن زين العابدين. ٦- جعفر الصادق بن محمد الباقر. ٧- موسى الكاظم. ٨- علي الرضا. ٩- محمد الجواد.١٠ – علي الهادي. ١١- الحسن بن علي العسكري. ١٢- محمد بن الحسن العسكري.) ئیتر ئالێرەوە ئەم کۆمەڵە ناسراون بە دوانزە ئیمامی، بۆ ئەوەی بۆمان ڕوونبێت پێیان وایە کە کۆتای ئیمامیان کە محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەرییە ئەو منداڵە بوو کە پێشتر ئاماژەمان پێدا لە تەمەنی پێنج سالیدا مردووە، پێیان وایە خۆی کردووە بە ژێر زەمینێکدا لە سامەڕا، یاخود لە یەکێك لە شاخەکان خۆی شاردۆتەوە کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ دەبێت ئەم کارەی ئەنجام داوە!، بڕوایان وایە کە لە ئاخر زەماندا دەگەڕێتەوە فەرمانڕەوایی هەموو جیهان دەکات، ناسراوە لای شیعەکان بە مەهدی مونتەزیر(المهديّ المنتظر) گوایە شیعەکان پێیان وایە کە ئەمە وەسیەتی پێغەمبەرە (صلى لله عليه وسلم) بۆ ئەم دوانزە ئیمامە کە فەرمانڕەوایی لەدەستیاندا بێت، دەبێت

هەموو جیهان ئەمان فەرمانڕەوایی بکەن، بەڵام پێیان وایە کە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلی لله علیه وسلم) ئەم ڕاستییەیان شاردۆتەوە بۆیە بەگشتی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (صلی لله علیه وسلم) کافر دەکەن، هەندێکیش لە شیعەکان فاسقیان دەکەن و تەکفیریان ناکەن؛ بەهۆکاری ئەوەی گوایە ناوی ئەم ئیمامانەیان شاردۆتەوە.

پاشان ئەم بیرە وەکو میرات چووە ناو وڵاتی فارسەوە و وەکو سیستەمێکی حوکمڕانی لێهات، کە وتیان گوایە دەبێت فەرمانڕەوایی لە کوڕە گەورەکانی ئالوبەیت بێ و سولالەی بگەڕێتەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) لەمەولا بدرێتە دەست ئەو ئیمامانەی کە بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەر ئەو بنەماڵەیە تاوەکو دەرکەوتنی مەهدی مونتەزیر – وەکو لای هەمووان ئاشکرایە...ئاشکراشە لای خوێنەر کە شتێکی وا لە ئیسلامدا نییە- تەنانەت لەسەردەمی سیستەمی خیلافەتی ویراسەتدا (بۆماوەیی) وەك (ئومەوی، عەباسی، سەلجوقی، ئەییوبی و عوسمانی) هیچ کام لەمانە نەیانوت کە ویراسەت بەشێکە لەدین یاخود لەدینەوە سەرچاوەی گرتووە، یان دەبێت تەنها لە خانەوادەیەکەوە بێت. لەناو دەوڵەتی فارسی دا واتە لە حوکمی شیعەگەرایی ئەو دەمە بیدعەیەکی تر هاتە ناویان ئەویش بریتی بوو لە بە پیرۆز ڕاگرتنی خانەوادەی دەسەڵاتدار، وتیان ئیمام عیصمەتی هەیە واتە: بەهیچ شێوەیەك هەرگیزاو هەرگیز هەڵە ناکەن، وتەیان وەکو کەلامی خوا وەردەگیرێت، واتە وتەی ئیمامەکانیان حوکمی قورئانی هەیە، هەروەها حوکمی فەرموودەی پێغەمبەری خوایشی هەیە. ئەگەر سەیری بنەچە و بێخی شیعە بکەین دەبینین زۆربەی قاعیدەی فیقهی و شەرعییەکانیان لەسەر بنەمای وتەی ئیمامەکانیان دامەزراوە، جا ئەگەر ڕاست بێت یاخود بە درۆوە بەدەمیانەوە هەڵبەسترابێت. خومەینی سەرۆکی

شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی دەڵێت: یەکێك لە زەروریاتی مەزهەبەکەمان ئەوەیە کە هیچ مەلیکێکی گەورە یان ئیمپراتۆریەتێك ناگات بە ئیمامەکانمان و هیچ پێغەمبەرێکیش ناگات بە ئیمامەکانمان...

ئەمەش لەکتێبی (دەوڵەتی ئیسلام لاپەڕە ٥٧ دا هاتووە)، "... وإن من ضروريات مذهبنا أن لأئمتنا مقامًا لا يبلغه ملكٌ مقرَّب، ولا نبي مرسل"!!. لێرەوە دوژمنایەتیان لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکان دا هەیە تەنانەت سەردەمێکی دیاری کراو تەکفیری عەباسی مامی پێغەمبەریان دەکرد (صلى لله عليه وسلم).. هەروەها کوڕە بەڕێزەکەی کە عبدوڵڵای کوڕی عەباسە کە بە (حبر الأمة) ناسراوە، چونکە سەردەمانێك دوانزە ئیمامی تەکفیری خیلافەی عەباسیان دەکرد.

یەکێك لە داهێنراوەکانی تر ئەوەیە کە پێیان وایە زۆربەی زۆری وڵاتانی موسوڵمان (دارکفر)ە (خەڵکی شاری مەدینە، مەککە، شام و مصریان بەگشتی پێ کافر بوو) ئەم وتەیەش دەدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا (صلى لله عليه وسلم) پەنا بەخوا، پێیان وایە ئەمە دینە، ئەم وتەیەش لەسەرچاوەکانی خۆیانەوە بەدی دەکرێت، کە بریتین لەم کتێبانە (الكافي وبحار الأنوار وتفسير القمي وتفسير العياشي والبرهان ) وە زۆرێکی تر لەسەرچاوەکانی خۆیان. بەگشتی شیعە هیچ زانایەکی ئەهلی سوننەیان پێ ڕاست نییە، ڕەفزی هەموو کتێبەکانی ئەهلی سوننە و جەماعەت دەکەن بەتایبەت ئەم زانایانە (البخاري و مسلم والترمذي و النسائي، أبي حنيفة، مالك، الشافعي، ابن حنبل، هەروەها بڕوایان بە هاوەڵان و پێشەوایانی ئیسلام نییە لەوانەش (خالد بن الوليد و سعد بن أبي وقاص و عمر بن عبد العزيز و موسى بن نصير و نور الدين محمود و صلاح الدين، و قطز و محمد الفاتح) وە زۆری تریش.

لە ئەنجامی ئەوەی کە باوەڕیان بە هاوەڵان و شوێنکەوتووانی پێغەمبەر (صلی لله علیه وسلم) نیە زۆربەی زۆری سەرچاوەی کتێبەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمامەکانیان و زۆربەی کتێبەکانیان لاوازن لە ڕووی ڕشتەی ڕاویەکانەوە، چونکە زۆرجار دەڵێن گوێدرێژەکەی باوکم بۆی گێڕامەوە تاکو دەگاتە گوێدرێژێکی سەردەمی پێغەمبەر (صلی لله علیه وسلم) کە هەمووی شتی خورافیاتە، بۆیە بیدعەی زۆر لە بیروباوەڕ و بەندایەتی و فکر و فیقیاندا و ... هتد هەیە. لێرەدا نامەوێت بچمە ناو هەموو داهێنراو و بیدعەکان و شرك و خورافیاتەکانیان، بەڵکو نووسەر دەیەوێت ئاماژە بە کێشە سەرەکیەکانیان بکات بەڵکو باش لێیان تێبگەین لەو کۆمەڵەی کە ناسراون بە شیعەی دوانزە ئیمامی، دەنا قسەکردن لەسەر بیدعە و تەقیە و ڕیجعە و بە دەیان کتێب کۆتایی نایەت، هەروەها پێیان وایە کە قورئان تەحریف کراوە پەنا بەخوا، یاخود پێیان وایە کە خوا عاجزە لەبەردەم ئەم کەونە(گەردوون)دا، وەیان جبریل بەردەوام وەحی دێنێتە خوارەوە بۆ ئیمامەکانیان، یان یادکردنەوەی ڕۆژی شەهید کردنی ئیمام حوسین (خوای لێ ڕازی بێت) وەك حەج وایە..! پێیان وایە ئیمامەکانیان باران و هەور و هەڵایان بەدەستە و باران دەبارێنن و ڕزق و ڕۆزیان دەدەن، ئەگەر بمانەوێت لەسەر هەموو ئەمانە بدوێین بەهەزارەها بیدعەیان ئاشکرا دەکەین کە نەك ڕوکنێکە لە دینەکەیان، بەڵکو بەشێکی ڕاستەوخۆیە لەلای دوانزە ئیمامییەکان لە ئوصولیان. ئەمەی باسمان کرد لەم فەترە زەمەنیەدا کە بەشێکن لە شیعەکان، بێجگە لەمان کۆمەڵی تریان زۆر لێ جیابۆتەوە، لەمێژوودا ناسراوە بە سەردەمی (حیرة الشیعة)، ئێمە تەنها باسی ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی هیجریمان کرد کە بەوەفاتی حەسەن عسکری ئیمامی یانزەهەمیان شیعەی دوانزە ئیمامی سەرچاوەی گرتووە.

کەواتە دەگەڕێمەوە سەر ئەو دەقە زانستییە کە لە ئوصولدا هاتووە دەڵێت «:الحكم على الشيء فرع عن تصوره» واتا بڕیاردان لەسەر شتێك بەشێکە لە ناسین و زانین.. کەواتە لێرەوە باسەکەمان دەست پێ دەکات لەمەوبەدوا بە زانست و بە ئاگا بوون ڕەخنە لەسەر شیعە کەڵەکە دەکەین بە هەزاران پرسیاریان لێدەکەین، خۆیان و مەزهەبەکەیان دەخەینە ژێر میکرۆسکۆبی پرسیارەوە، لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەمە دەگونجێت لەگەڵ دین یان ناگونجێت، حەڵاڵە یاخود حەڕام، بەڵام ئاخافتن لەسەر بنەمای سۆزو (ڕەدفعل).. مرۆڤ بەرەو تیاچوون و هەڵە دەبات.

**دەسەڵاتی شیعە و هەوڵدان بۆ فەرمانڕەوایی :**

گومانم لەوەدا نییە کە خەڵکانێك بناغە و ئەصلی شیعەیان خوێندبێتەوە لەم نووسینەدا تووشی شۆك بن، چونکە لەڕاستیشدا پێگەیشتن و نەشونمای شیعە بەم شێوەیە بووە. بەدڵنیاییەوە مێژووش لەلای من وا نانوسرێتەوە کە تەنها قۆناغ بێت و وەك چیرۆکێك باسی لێوە بکەم، بۆیە مێژوو و فیکر بەیەکەوە تێکەڵ دەکەمەوە تاکو ببێتە پەندێك و وانەیەك بۆ هەمووان و بشتوانین لەگەڵ کێشە و ڕەوشەکەی ئێستادا بەشێوەیەکی جوان کاری لەسەر بکەین و وەك مەشخەڵێکیش بۆ ڕووناکی بەرچاو لەبەردەستدا بێت.

بۆیە پێویستە مێژوو وەکو خۆی بگێڕدرێتەوە، چونکە ڕەوەندەکانی داهاتوو سوودی لێ دەبینن و هەر لاسەنگیەك یان خێچ وخوارییەك بە مێژووە دیار بێت، ئەوا تاوانە بەرانبەر بە ڕەوەندی داهاتوو. بۆیە باسی ئەم مێژووە دەکەین بۆ ئەوەی بتوانین تەرجومەی ئیشی خۆمانی لەسەر بکەین تا ببێتە ئەزمونێکیش بۆ ئیشکردن لەسەری وەکو خوای گەورە

دەفەرمووێت: {فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ} الأعراف ١٧٦. لەبەر ئەوەیە کە وەك گێڕانەوەی چیرۆك نی یە بەڵکو بۆ زیاتر تێڕامان و لەهەمان کاتدا یارمەتیدەریشمان بێت بۆ واقیعی ڕەوشی ئێستامان، هەروەك لەسەرەوە ئاماژەمان بە بناغە و ئەصڵی شیعە کردووە کە چۆن نەشونمایان کردووە، پێویستە لەم بەشەدا باس لەوە بکەین کە چۆن ویستوویانە بگەن بە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی هەموو جیهانی ئیسلامییان کردووە لە سەدەی چواری هیجری دا، ئەگەر بنەچە و دەسەڵاتیان نەزانین نەکاریگەریانمان بۆ دەردەکەوێت وە نە ئەشتوانین لەبەرانبەریاندا هەڵوێستمان هەبێت.

## گەڕانەوە بۆ فکری سیاسی و مێژووی دەسەڵاتیان:

بەگشتی لەدوای وەفاتی حەسەن عەسکەری کە ئیمامی یانزەهەمی شیعەکانە، پێیان نایە سەردەمێك کە نەیان دەزانی چۆن تێیدا هەنگاو بنێن، تەنانەت سەریان لێ شێوا بوو خۆشیان لەناو خۆیاندا کۆك نەبوون؛ کە ئەو سەردەم و زەمەنە لە مێژوودا ناسراوە بە (حيرة الشيعة)، بۆیە شیعە دابەشبوون بە چەند بەشێکی زۆرەوە، هەربەشێك لەمانە بە ویست و ئارەزووی خۆی دینی دادەتاشی بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵاتی سیاسی، یەکێك لە گەورەترین بەشەکان کە دروست بوو کۆمەڵی دوانزە ئیمامی بوو کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا چۆن نەشونمایان کرد، بەڵام ئەمانە بەتەنها لە گۆڕەپانی سیاسیدا نەبوون، بەڵکو بە تەنیشتی ئەمانەوە چەندەها کۆمەڵ و بەشی تر نەشونمایان کرد کە کارییگەریەکی زۆر خراپی دانا لەسەر هەموو ئومەتی ئیسلامی. یەکێکی تر لەو کۆمەڵانە کە هەموو وڵاتانی ئیسلامی ئەفەریقی و بەشێکیش لە ئاسیای داگیر کرد لەمێژوودا ناسراون بە کۆمەڵی شیعەی ئیسماعیلیە (فرقة الئيسماعيلية) ئەم کۆمەڵە.. کۆمەڵێکی

سەرلێشێواو گومڕابوون زۆربەی زۆری زانایانی ئیسلام.. لە ئیسلام دەیانکەنە دەرەوە و بەموسوڵمانیان نازانن!. ئەم کۆمەڵە بە پلانێکی زۆر ترسناکی یەهود دروست بوون، بۆ ئەوەی هەرچی ستراتیژیەتی خۆیان هەیە لەناو ئومەتی ئیسلامیدا بیسەپێنن، دروستکەری ئەم کۆمەڵە بەناوی (میمون القداح)؛ لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت و ئیسلامبوونی خۆی ڕاگەیاند، بەفرت و فێڵ خۆی نزیك کردەوە لە (محمد کوڕی ئیسماعیل کوڕی جعفر صادق) (ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێت) تەنانەت ببوە هاوڕێی، محمد کوڕی ئیسماعیل لە ئالوبەیت بوو.. باپیریشی پێشەوا جعفەری صادق بوو کە ئیمامی شەشەمی شیعەی دوانزە ئیمامی یە، ئیسماعیلی کوڕی جعفر برای موسای کاظمە کە ئیمامی حەوتەمی دوانزە ئیمامی یەکانە.

ئەوەی کە مەیمونی قەداحی یەهودی پێی هەڵسا کارێکی سەرسوڕهێنەر بوو، پلانێکی ترسناکی داڕشت بۆ هەڵوەشاندنی ئومەتی ئیسلامی لە یەکتری، خۆی ناونا بە عبداللە و کوڕێکیشی ناونا بە محمد و وەسیەتیشی کرد بۆ کوڕ و کوڕەزاکانی کە هەموو منداڵەکانیان بەناوی محمدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جعفر صادق ناوزەد بکەن، بۆ ئەوەی ئەم نەسەبە بەگوێرەی قۆناغەکانی مێژوو یەهودییەکان خۆیان بگەنەوە بە ئالوبەیت، گوایە ئەمان لەسولالەی مەحممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادقن..! کارێکی تر کە بانگەشەی بۆ کرد زۆر ترسناك بوو بریتی بوو لەوەی کە ئەمانە ئیمامی گەورەن و دەبێت هەموو جیهان لەگەڵ هەموو جیهانی ئیسلامی دا فەرمانڕەوایی بکەن، دەبێت ئەو ئیمامەش لەنەسەبی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق بێت، نابێت بگەڕێتەوە سەر سولالە و نەسەبی موسای کاظمی جەعفەری صادق، لەبەر ئەوەی شیعەی

دوانزە ئیمامی نەسەب و سولالەیان لەوەوە دەگێڕنەوە. مەیمونی یەهودی توانی بەم بیرەی خۆی نەشونما بە کۆمەڵی ئیسماعیلیە بکات، کوڕ و کوڕەزاکانی مەیمونی قەداح بانگەشەیان بۆ ئەم بیروباوەڕ و فیکرە دەکرد، وە جوانکاریان بۆ دەکرد بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خەڵکیدا بیگونجێنن لەگەڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلام دا، یەکێکی تر لە کارە هەرەخراپ و ترسناك و قێزەونانەی کە ئەنجامیان دا بریتی بوو لە (حلول) تێکەڵ بوونی بەڕۆح و جەستەی ئیمامەکانیان، واتە: (خوا و ئیمام بەیەکەوە حوکمی سەرزەوی دەکەن)؛ بۆیە پێیان وابوو کە ئیمام ئلوهیەتی خودای تێدایە، بڕوایان هەبوو بە (تناسوخ) واتە: (ئیمامەکانیان نامرن، ڕۆحەکانیان لە جەستەی تردا دێنەوە سەر زەوی و بەزیندویەتی دەمێننەوە)، بەگشتی پێیان وایە ئیمامەکانیان لە دوای مردنیان دەگەڕێنەوە بۆ دنیا و بە هەمیشەیی دەمێننەوە. بێجگە لەو هەموو کارە قێزەون و گەندەڵانەی کە ئەنجامیان داوە گەیشتنە لوتکەی تاوان و شێتی کە بەئاشکرا جنێویان بە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەدا، باسی ناموس و شەرەفیان دەکردن؛ تەنانەت قسەیان بە خودی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەوت، لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەی گەڕانەوەی نەسەبیان بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد! گەورەترین لیژنەی ئیغتیالاتیان دروست کرد بۆ گەیشتن بەدەسەڵات، لەجیهانی ئیسلامی دا ئەوەندە گەورە بووبون دەگەیشتن بەهەرچی وەزیر و سوڵتان و خەلیفە هەیە، لەوانەی کە ئیغتیال کران (وەزیری بەناوبانگ نیظام مولك، ئەمیری بەناوبانگ عیمادالدین زەنکی، سوڵتانی بەناوبانگ ممدوحی کوڕی تونتەکین) زۆرێکی تر لەسەرکردەی سەربازی و پیاوە ناودارەکانی ئومەتی ئیسلامی بەدەستی ئەم کۆمەڵە کوژراون.

بانگەوازی ئیسماعیلیە ڕۆژ بەڕۆژ چالاکتر دەبوو؛ لەناو هەموو ڕەوەند و جیلەکان دا پەرەی پێ درا، خەڵکیان بەوە فریو دەدا کە خۆشەویستییان بۆ ئالوبەیت هەبێت، قەناعەتیان بەخەڵکی کرد کە ئەمان لەنەوەی پێغەمبەری خوان (صلی الله علیه وسلم)، فارسەکان کە بەم بانگەوازە تێکدەرەیان زانی بەتایبەتی ئەوانەی کە بەدزییەوە ئاگر پەرست بوون و بە ڕووکەشیش دەیان وت کە موسوڵمانین، هەر بەزووی چوونە ناو ئەم کۆمەڵی ئیسماعیلیەوە، لەو سەرکردانە کە چوونە ناویان لە خانەوادە بەناوبانگەکانی ئێران (حسین الأهوازي) بوو، کەیەکێکە لە بانگەشەکارە بەناوبەنگەکانی کۆمەڵی ئیسماعیلیە.. یەکێکە لە گەورە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵە، کە زیاتر لەناوچەکانی بەصرەدا بانگەوازی دەکرد.

حەسەنی ئەهوازی بووە هاوڕێی کەسێك بەناوی (حمدان کوڕی الأشعث) کە کەسایەتییەکی خوێنڕێژ و داوێنپیس و چەتە بووە لە مێژووی ئیسلامی دا زۆرێك لە مێژوونووسان وەك (ابن کثیر و ابن اثیر) هەردووکیان پێیان وایە کە جولەکەیە، جولەکەی فارسە، بەڵام زۆرێکی تر لە مێژوو نووسان پێیان وایە کە مەجوسی فارسە، یاخود یەهودی بەحرەینە. دەسەڵاتی شیعەی قەرامیطە: حەمدانی کوڕی ئەشعەث لەقەبی بەناوبانگ بوو بە (قرمط) بەگوێرەی قۆناغەکانی سەردەم ئەمیش کۆمەڵێکی بۆخۆی جیاکردەوە کە نەسەبیان دەچووە سەر ئەو پیاوە خوێنڕێژە بەناوی کۆمەڵی (قەرامیطە) کە لقێك بوون لە کۆمەڵی ئیسماعیلیە. ئەمانە ترسناکترین کۆمەڵ بوون لەناو شیعەکان دا، ئەم کۆمەڵە ئاواتیان پارە بوو لەگەڵ داوێنپیسی هەرچییەکیان پێ خۆش بوایە لەکاری خراپە و کوشتن و زینا و دزی دەیانکرد، بەردەوام خەریکی چەتەیی و ڕێگری بوون، هەرچی دز و چەتەکان بوو پەیوەندییان کرد بەم

کۆمەڵەوە ئەوانەشی کە دەرچووبوون لە سیستەمی خیلافەت و تاوانبار بوون لەناو ئەم کۆمەڵەدا خۆیان دەشاردەوە، ئەم قەرامیطانە بوون بە خەتەرترین و ترسناکترین کۆمەڵ لە مێژووی ئومەتی ئیسلامی دا، هەرچەند لەباسێکی ئاوادا دەرفەتی ئەوە نییە کە باسی هەموو لایەنەکانی ئەمانە بکەین، بەڵام هەروەکو ئاماژە.. ئاماژەم پێداوە، لەناوەندی سەدەی سێیەمی هیجری دا ئەم سێ کۆمەڵە گەورەیەی شیعە وەکو قارچك هەڵتۆقین، هەریەکەیان بانگەشەی ڕاستی و حەقی بۆ خۆی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ یەکتریدا ڕایان جیاواز بوو لە بیروباوەڕ و فیکر و ئەحکام و لە هەموو شتێکدا جیاواز بوون. ئەم سێ کۆمەڵەش بریتین لە: (شیعة الاثنا عشرية، شیعة الئيسماعيلية وە شیعة القرامطة). لەگەڵ ئەوەشدا کێشمە کێشم و ململانێیان هەبوو لەگەڵ ئەهلی سوننەدا، ململانێشیان هەبوو لەناو خۆیان دا بەهیچ شێوەیەك بەیەکتری نەدەگەیشتنەوە، چونکە هەریەك لەم کۆمەڵانە بە ئارەزووو هەوای خۆیان دینیان دادەهێنا و بیدعە و داهێنراویان دروست دەکرد لەناو ئاییني ئیسلام دا.

ئەم قۆناغە لەمێژووی ئیسلامی دا کە ئەم هەموو بزووتنەوە شیعەی تێدا دروست بوو، ڕەوشێکی نائارامی لەناو ئومەی ئیسلامی دا دروست کردبوو، بەڵام تا ئێستا هەر هەوڵیانە بۆ دەسەڵات.. بەهیچ شێوەیەك فەرمانڕەواییان نەگرتۆتە دەست، لەکۆتایی سەدەی سێیەمی هیجری و دەستپێکی سەدەی چوارەمی هیجری، گۆڕانکارییەکی زۆر خێرا ڕوویدا کە ڕەوشەکەی زیاتر بەرەو ترسناکی و بەرەو ناهەمواری برد..

بەزووترین کات شیعەی قەرامیطە چوونە سەر دەسەڵات و فەرمانڕەواییان گرتە دەست، چونکە ئەمانە زۆر دڕندە و پیاوکوژ بوون، یەکێك لە سەرکردە و بانگخوازەکانیان ناوی (ڕۆستەم کوڕی حوسێن) بوو لەوڵاتی یەمەن

دەوڵەتی قەرامیطەی دامەزراند، بانگەوازەکەی بەرفراوانتر کرد و خەڵکی دەنارد بەهەموو لاکاندا تا بانگەواز بۆ بیرەکەی خۆیان بکەن، تەنانەت توانی دەنگی خۆی بگەیەنێتە وڵاتی مەغریب!، ئەم دەوڵەتە زۆری نەخایاند لەناوچوو، بەڵام جۆرێکی تر لە شیعەی قەرامیطە دروست بوون لە خاکی جزیرەی عەرەبی دا بەتایبەتی لە بەحرەین (مەبەست ئەم بەحرەینەی ئێستا نی یە، بەڵکو ڕۆژهەڵاتی جزیرەی عەرەبی دەکات)، دەوڵەتی قەرامیطە لەو ناوچانەدا زۆر بەهێز بوون، هەموو بەرژەوەندییەکانی جیهانی ئیسلامیان خستە ژێر ترسەوە، ساڵێك هەستان بە کوشتنی هەموو حەجاجەکان کە هاتبوون بۆ حەج، یەکێکی تر لەو تاوانە گەورانەی کە ئەنجامیان دا هێرشکردنە سەر مزگەوتی حەرەمی مەککە بوو؛ لە ڕۆژی تەرویە لەساڵی ٣١٧هیجری هەرچی حەجاج هەبوو لەناو کەعبەدا کوشتیان، تەنانەت بەردە ڕەشەکەشیان دزی و شکاندیان و ناردیان بۆ وڵاتی بەحرەین، کە ئەو دەمە پایتەختەکەی (هجر) بوو لە ڕۆژهەڵاتی جزیرە، ئەم بەردە بۆ ماوەی ٢٢ ساڵ لای قەرامیطەکان مایەوە تا ساڵی ٣٣٩ی هیجری موسوڵمانان گەڕاندیانەوە بۆ کەعبە.

**دەسەڵاتی ئیسماعیلیە :**

ئیسماعیلیەکان لەهیچ شوێنێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا نەیانتوانی دەسەڵات بگرنە دەست، کەش و هەوای لەبار و ڕەوشێکی لەبار بۆ ئەوان وڵاتی مەغریب بوو، چونکە پێشتر ڕۆستەمی کوڕی حوسێن کە یەکێك بووە لە شیعە قەرامیطەکان، بانگەوازی شیعەی قەرامیطە و ئیسماعیلیەی گەیاندبووە ئەوێ ئەویش لەڕێگەی پیاوێکەوە بەناوی (ابو عبداللەی شیعی) بوو. ئامادەمان پێدا کە ئەم دوو کۆمەڵە (قەرامیطە و ئیسماعیلیە)

هەردووکیان بانگەشەی ئیمامەتی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق یان دەکرد؛ بۆیە ئەو زەمەنە لە مەغریب دا کەسیان دەست نەکەوتەوە لەو بنەماڵە بەڕێزە، بەڵام یەکێك لە کوڕەزاکانی مەیمونی قەداحی یەهودیان دۆزیەوە بەناوی (عبيد الله بن الحسين بن أحمد بن عبد الله بن ميمون القدَّاح) ئەمەش بووە هۆکار و هەلێك بۆ دامەزراندنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی لە مەغریب دا، بۆیە بانگەشەی بوون بە دەوڵەتیان کرد، ئەوەی خۆشەویستی هەبوو بۆ بانگەوازی ئیسماعیلیە بانگ کرا بۆ ئەو جێگایە، (عبيد الله بن الحسين بن أحمد بن عبد الله بن ميمون القدَّاحی یهودی) لەقەبی مەهدی بۆخۆی دانا، خۆشی کرد بە پێشەوای بانگەوازی ئیسماعیلیە و بانگەشەی ئالوبەتی بۆ خۆی کرد کە گوایە باپیرانی دەگەڕێتەوە سەر ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق، بۆ ئەوەی زیاتر دڵی موسوڵمانانی ئەو سەردەمە ڕابکێشێت بەلای خۆی دا، دەوڵەتەکەشی ناونا دەوڵەتی فاطمیی کە وەك چەواشەکاریەك گەڕاندیەوە سەر فاطمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ لای هەمووشتان ئاشکرایە کە خۆی یەهودییەکی ڕەسەن بوو.

ئەو سەردەمە بەهۆکاری جەهلی خەڵك و جوڵانی و سۆزو هەست و نەستیان توانی بە زووترین کات بانگەوازەکەی خۆی بڵاو بکاتەوەو.. قەڵەمڕەو و فەرمانڕەوایی خۆی بڵاوبکاتەوە ئەوەندە دەسەڵاتی گەورە بوو هەموو باکوری ئەفەریقای خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی..

دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی بیدعە و کاری خراپە و جنێودان بە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر و بانگەشەی حلول و تەناسوخی ڕۆح و زۆری تر لەم داهێنراوانە، تەنانەت ئەم دەوڵەتە گەیشتە سەر سنوورەکانی مصر، لە ساڵی ٣٥٩ی هیجری توانیان خاکی مصر داگیر بکەن و بڕۆنە

ناوی؛ لەڕێگای سەرکردەیەکی ئیسماعیلیە بەناوی (جوهر الصقلي الئیسماعیلي) لەسەردەمێکدا کە (المعز لدین الله العبیدی) خەلیفە بوو، ئەم خەلیفەی ئیسماعیلیە ناسرا بوو بە عوبیدی کە گوایە نەسەب و سولالەی دەگەڕێتەوە سەر (عبید الله بن الحسین بن أحمد بن عبد الله بن میمون القدَّاحی یهودی) لەمەولا ناوی فاطمیەکان گۆڕا بە عوبێدی. موعز لدین لله عوبێدی چووە ناو مصر و شاری قاهیرەی دامەزراند، مزگەوتێکی تێدا دروست کرد بەناوی مزگەوتی (ئەزهەر) بۆ ئەوەی هەرچی بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلی هەیە لەوێوە بیگەیەنێتە خەڵکی، دەستیان کرد بە کوشتنی زانایانی ئەهلی سوننە!.. لەسەر مینبەری مزگەوتەکانیانەوە بەئاشکرا جنێویان بە هاوەڵە بەڕێزەکان دەدا تا گەیشتە سەردەمی (حاکم بأمر الله) ی خەلیفەی عوبێدیەکان کە بانگەشەی بوونی خوایەتی بۆخۆی دەکرد؛! لەسەر هەموو مزگەوتەکان دا بە نووسین جنێوی بە ئەبوبەکر و عومەر دەدا، ئەمری کرد بە خواردنی گۆشتی بەراز، گۆشتی کەروێشك و خواردنی ترێی حەڕام کردبوو، جەلادەکانی زیندانی بۆ لێدانی موسوڵمانان هەموو یەهودی بوون، هەرکەسێك باج و خەراجی نەدایە بە دەوڵەتەکەی، عەبدی ڕەشی زەکەر درێژی دانابوو وەك سزایەك لەبەرچاوی خەڵکی لەناو بازاڕدا لەگەڵ بازرگان و خەڵکەکان دا هەتکیان دەکردن!.. حاکم بأمر اللەی گەندەڵ بانگەشەی خوایەتی کرد حەزی لە خوشکەکەی خۆی بوو بەناوی (ست الملوك) کە لەگەڵیدا ڕای بوارد و زۆرێك لە مێژوونووسان دەڵێن هەر خوشکەکەی خۆی لەناوی برد و کوشتی و پاشان بانگەوازی ئەوەیان کرد کە چۆتەوە بەرەو ئاسمان.

لەدوای کوشتنی حاکم بأمر الله دەست کرا بە دروست کردنی مزگەوتی زۆر بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەیان، توانیان هەموو مصر و

تەنانەت شام و حیجازیش داگیر بکەن بۆماوەی دوو سەدەی تەواو تا ئەو کاتەی خوای موتەعال (صلاح الدين الأيوبيي) دەنێرێت لە شەڕی ئەم شیعانە ئومەتی ئیسلام ڕزگاریان دەبێت لە ساڵی ٥٦٧ی هیجری.. مصر ئازاد دەکات لە داگیرکەرانی ئیسماعیلی.

**دەسەڵاتی شیعەی دوانزە ئیمامی :**

ئەم کۆمەڵە شیعەیە داهێنراوی زۆریان هەبوو بەڵام تا ڕادەیەك لەو دوانەی تر باشتر و هێمن تر بوون ئەمان بڕوایان بە بوونی خوا هەبوو، بڕوایان بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو بڕوایان بە زیندووبوونەوە و حەشر هەبوو، بەڵام بیدعە و داهێنراویان ئەوەندە زۆرە لە ژمارە نایەت.. زۆر کاری خراپیشیان ئەنجام دەدا، بانگەشەی دوانزە ئیمامی گەیشتە ناو هەندێك لە خێزانە بەناوبانگەکانی فارس و عێراق تەنانەت توانیان بانگەشەکانیان بگەیەننە خانەوادە دەسەڵاتدارەکان لە زۆربەی زۆری جێگاکاندا.. بانگەوازەکەیان گەیاندە خانەوادەیەکی بەناوبانگ بەناوی خانەوادەی کوڕانی سامان (عائلة بني سامان) کە بنەچەی ئەمانە فارسن.. توانیان ئەو خانەوادەیە بەگشتی بکەن بە شیعە کە ئەو دەمە فەرمانڕەوای وڵاتی فارسیان (ئێرانی ئێستا) دەکرد، توانیان دەوڵەتێك دابمەزرێنن لەساڵی ٢٦١ی هیجری تا سالی ٣٩٨ی هیجری، هەروەکو دەسەڵاتداربوون.. بەڵام بەهیچ شێوەیەك بانگەشەی تەشەیوعیان نەدەکرد. پاشان گەیشتنە خانەوادەیەکی دەسەڵاتداری تر کە بنەچەی ئەمان عەرەبن لە گەل و هۆزی (بني تغلب)ن ئەم خانەوادەیە ناسرابوون بە خانەوادەی کوڕانی حەمدان (عائلة بني حمدان) کە ئەو دەمە فەرمانڕەوایی وڵاتی موسڵیان دەکرد لە وڵاتی عێراق، ئەمانیش لەساڵی ٣١٧ی هیجری تا ٣٦٩ی

هیجری فەرمانڕەواییان کرد، تەنانەت توانیان سوڵتانی خۆیان بگەیەننە حەلەب، لەحەلەبیش لە ساڵی ٣٣٣ی هیجری تا ساڵی ٣٩٢ی هیجری فەرمانڕەوا بوون. لەهەمووی ترسناکتر کە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر جیهانی ئیسلامی شیعەی دوانزە ئیمامی توانی دەسەڵاتی خۆی بەرفراوانتر بکات گەیشتن بە خانەوادەی کوڕانی بویە (عائلة بني بوية) کە بنەچەی ئەمان فارسە، توانیان دەوڵەتی فارس بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، تا گەیشتە ئەو بارو ڕەوشەی لە ساڵی ٣٣٤ی هیجری دا خەلافەتی عەباسی بەتەواوەتی داگیر بکەن، بەڵام بۆ ئەوەی ئینقیلابات و فیتنەی گەورە ڕوو نەدات لەلایەنی سوننیەکانەوە، خەلیفەی عەباسییان وەك ڕەمزێك دانایەوە کە بۆ ماوەی ١٠٠ساڵ توانیان بەتەواوەتی فەرمانڕەوای دەوڵەتی عەباسی بکەن، واتە لەساڵی ٣٣٤ی هیجری تا ٤٤٧ی هیجری؛ تا ئەوکاتەی سەلاجیقەکانی ئەهلی سوننە دروست دەبن و خاکی عێراق لەژێر فەرمانڕەوایی شیعەی دوانزە ئیمامی ئازاد دەکەن، ئەم شیعانە بەبەردەوامی بوغز و ڕقی خۆیان بەسەر زانایانی سوننە و خەلافەتەکەشی دەڕشت تا وای لێهاتبوو لەسەر مینبەرەکانەوە.. هەروەها لەسەر دەرگای مزگەوتەکانیشەوە دەیاننووسی و جنێویان بە هاوەڵەبەڕیزەکان دەدا، بەتایبەت ابوبەکر و عومەر –ڕەزامەندی خودایان لێ بێت- بەئاشکرا لە خوتبەی هەینیدا لەعنەت و جنێویان پێ دەدان، ئەم سەردەمەش سەردەمێکی کەئابە و دڵتەنگی بوو لە مێژووی ئیسلامیدا. لێرەوە دەبینین سەدەی چوارەمی هیجری سەدەیەکی شیعەی تەواو بوو؛ شیعەی دوانزە ئیمامی دەسەڵاتدارێتی خۆی لەڕێگای بوهەیئیەکانەوە (البویهیون) عێراق و ئێرانیان بە تەواوەتی خستبووە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیانەوە، سامانیەکانیش ڕۆژهەڵاتی ئێران و بەشێکی ئەفغانستان و بەشیکی ڕۆژهەڵاتی جیهانی

ئیسلامی لەژێر قەڵەم ڕەویاندا بووە، حەمدانیەکان موسڵ و حەلەب یان فەرمانڕەوایی دەکرد، هەروەها قەرامیطەکان ڕۆژهەڵاتی نیوەدوورگەی عەرەبیان لەژێر دەستدا بوو کە چەند جارێك دەگەیشتنە حیجاز وەك قەڵەم ڕەو، بەڵکو گەیشتنە دیمەشق و پاشان یەمەن بەتەواوەتی لەژێر فەرمانڕەوایەتیان دا بوو، پاشان دەوڵەتی عوبەیدی کەلە مێژوودا ناسراوە بە فاطیمی توانیان هەموو وڵاتانی ئیسلامی ئەفەریقا داگیر بکەن بەڵکو گەیشتنە فەلەستین و سوریا و لوبنانیش!. لە کۆتایی سەدەی چوارەمی هیجری دا دەوڵەتی قەرامیطە بەتەواوەتی ڕۆچوو و نەما، لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی هیجری دا دەوڵەتی بەنی بوهەییە کۆتایی پێهات واتە ساڵی ٤٤٧ی هیجری، پاشان ئیسماعیلیە عوبێدییەکان بەردەوام بوون لەدەسەڵاتیان تا ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی هیجری واتە ساڵی ٥٦٧ی هیجری ئەوانیش کۆتای بەدەسەڵاتیان هات و جیهانی ئیسلامی و ئەهلی سوننە و جەماعە فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی گرتەوە دەست. هەموو ئەم شیعانە لەناو چوون و بوونێکی ئەوتۆیان نەما لەسەر زەوی دا، بەڵام شیعەی دوانزە ئیمامی بەردەوام لەناوچەکانی فارس و بەشیکی عێراق دا بانگەشەی مەزهەبەکەیان دەکرد، بەبێ ئەوەی فەرمانڕەوایی بکەن. بەم شێوەیە ڕەوشەکە هێور بوویەوە تا ساڵی ٩٠٧ی هیجری واتە سەرەتای سەدەی دەیەمی هیجری ئەو کاتە کەسێك بەناوی (ئیسماعیلی صەفەوی) هەڵدەستێت بە دامەزراندنی دەوڵەتی صەفەوی شیعەی دوانزە ئیمامی لە ئێران، کە نەسەب و سولالەی باووباپیرانی ئیسماعیلی صەفەوی دەگەڕێتەوە سەر صەفی الدین ئەردەبیلی کەلە بنەڕەتدا فارسن و لەساڵی ٧٢٠ی هیجری باوکیان وەفاتی کردووە، توانی دەوڵەتەکەی و قەڵەمڕەوی بەرفراوان بکات، شاری تەبریزیشی کردە پایتەختی صەفەویەکان..

کەوتە ململانێکی زۆر لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانلی دراوسێی دا، خۆی نەیدەتوانی لەبەرانبەر عوسمانلی یەکان دا بوەستێتەوە ناچار هاوپەیمانی لەگەڵ پورتوگالیەکان دا بەست بۆ لێدانی عوسمانلیەکان، بەهۆکاری ئەو هاوپەیمانیە توانی بەشێکی عێراق لەژێر دەستی عوسمانلیەکان دەربهێنێت، تا وای لێهات ویستی ئیمارەتی ئەردەڵان و بابانیش بکاتە شیعە؛ مەزهەبی شیعە بڵاو بکاتەوە...

ئەگەر سوڵتان (سەلیمی یەکەمی) عوسمانیی ڕێگەی پێ نەگرتایە ئەوا ئێستا هەموو کوردستانی ئێمە شیعەی دوانزە ئیمامی بوو، کە لە شەڕێکی یەکلاکەرەوەدا توانی شاڵاوو شەپۆلی شیعەی دوانزە ئیمامی بوەستێنێت کە ئەو شەڕە بەناوبانگەش لە مێژوودا ناسراوە بە شەڕی (چاڵدێران) لەساڵی ٩٢٠ی هیجری دا کە توانی سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بێنێت و دەریان بکاتە دەرەوە لە عێراق. بەدرێژایی مێژووی خۆیان ململانێ لەنێوان صەفەویەکان و عوسمانییەکان دا هەبوو، ئەم ململانێیەش لەناو خاکی عێراق دا دەکرا جوانتر بڵێم کوردستان، ڕەوشەکە بەو شێوەیە مایەوە تاکو دوو سەدە، صەفەویەکان توانیان فەرمانڕەوایی ئێران بکەن لە ساڵی ٩٠٧ی هیجری یەوە تاساڵی ١١٤٨ی هیجری تا ئەو کاتەی دەوڵەتی صەفەوی لەناو دەچێت، لەناوەڕاستی سەدەی ١٨ی میلادی ساڵی ١٧٣٥ی زاینی، لەو ماوەیەدا ئێران بوو بە چەند پارچەیەکەوە هەر پارچەیەك لەمانە عوسمانییەکان و ڕووس و ئەفغان شەڕیان لەسەر دەکرد، تەنانەت کۆمەڵێك لە بەرانبەر سەرکردەی سوپای عەباسی سێیەمی صەفەوی کە کۆتا سوڵتانی صەفەویەکان بوو. لەهەمان کاتدا عوسمانییەکانیش کەوتنە لاوازی، ئەوروپیەکانیش دەیان ویست لەگەڵ ڕووس دا ئەم وڵاتە پارچە پارچە بکەن، بۆیە ناوچەکانی ڕۆژئاوایان لە ژێردەست دەرهێنایەوە ئێرانیەکانیش

هەمیشە خۆشەویستیان بۆ سەرکردە ڕۆژئاواییەکان هەبوو، ئەو دەمەش ئینگلیز.. هند و پاکستانی داگیر کردبوو دەیانویست خۆیان لە ئینگلیز نزیك بکەنەوە جارێکیش دەیانویست خۆیان لە فرەنسیەکان نزیك بکەنەوە و یان دەبوونە جاشی ڕووس.

فەرمانڕەوایی ئێران لەساڵی ١١٩٣ی هیجری بەرانبەر بە ١٧٧٩ی زاینی (ئاغا محمدی قاجار) کە لەبنەچەدا فارسە و مەزهەبیشی شیعەیە، بەڵام خۆی عەلمانییە هیچ بانگەشەیەك بۆ مەزهەبی دوانزە ئیمامی ناکات و حوکمیشی پێناکات دەسەڵات دەگرێتە دەست، دوای خۆی کوڕەکانیشی بەهەمان شێوە فەرمانڕەوایی دەکەن. بەگوێرەی سەردەم و زەمەن قاجەریەکان دەسەڵاتیان بەرەو زیاد بوون و کەم بوون دەڕوات و ئەمان خۆیان ناوزەد دەکەن بە شاە، ئەم خانەوادەیەش کۆتایی بەدەسەڵاتیان دێت تا کەسێك بەناوی ڕەزای پەهلەوی ئەو بنەماڵەیە دادەگرێتە خوارەوە و خۆی دەچێتە جێگایان واتە لە ساڵی ١٣٤٣ی هیجری بەرانبەر بە ١٩٢٣ی زاینی وە بانگەشەی شای ئێرانی بۆخۆی کرد لە ڕێگەی یارمەتی ئینگلیزەوە، بەڵام لەساڵی ١٩٤١ی زاینی دا کێشەیەکی گەورە کەوتە نێوانیان لەگەڵ ئینگلیزدا ئینگلیزەکان دایانگرت و کوڕەکەیان خستە جێگای بەنای محمد ڕەزای پەهلەوی تا ساڵی ١٣٩٩ی هیجری بەرانبەر بە ١٩٧٩ی زاینی بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی شۆڕشی خومەینی شیعەی دوانزە ئیمامی دەستی پێکرد.. فەرمانڕەوایی شیعەی دوانزە ئیمامی لەناوچەکانی فارس (ئێران) دەست پێ دەکاتەوە..

ئەمەش مێژووی سیاسی و فیکری سیاسی دەسەڵاتی شیعەی دوانزە ئیمامی بوو لە جیهانی ئیسلامی دا، لەو کاتەوەی کە سەریان هەڵداوە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت فەرمانڕەوایی

شیعە جۆرێك لە ئینقیلاب و پیاداكێشانی هەبووە لەسەر دەسەڵاتی سوننی، بەشێوەیەكی ئایینی و بانگەشە بۆ خۆشەویستی ئالوبەیت و گەڕانەوە بۆ ڕەچەڵەكی ڕەسەن هەمیشە فەرمانڕەواییان كردووە، بەڵام لەهەموو قۆناغەكانی مێژوودا هەمیشە دەست لەملانی یاخود هاودەست بوون لەگەڵ دوژمنەكانی ئومەتی ئیسلامیدا، بەتایبەت لەگەڵ خاچ دروشمەكان (صلیبیەكان) ڕووس و ئینگلیز و فرەنسی و پورتوگالیەكان دا، ئەگەر جوان سەیری زەمەنی تەتار بكەین هەمیشە هاوپەیمان بوون لەگەڵ تەتارەكان دا و هیچ ململانێیەكیان لەگەڵ ئەواندا نەبووە. لەگەڵ ئەوەدا ئێمە سەیری تاوانەكانیان دەكەین كە ئەنجامیان داوە، نەك بۆ تۆڵە سەندنەوە بەڵكو بۆ وتوێژكردن و ئاخافتن لەسەر بیروباوەڕ و مەنهەجیان ئەمەش سەرەتایەكی كەم بوو لە فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتیان كە بیروباوەڕی ئەوان لەسەر نەسل و عیصمەتی ئیمامەت و چینایەتیان لەنێوانی عەلی و ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان و زۆرێك لە هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر ﷺ و دایكی ئیمانداران دادەمەزرێنن، تا ئەوان بەو شێوەیە بیر بكەنەوە نیەتی ئەوانمان لەبەر چاودایە، دەشزانین لە مێژووی ئیسلامدا چییان كردووە، دەشڵێین منداڵان لەسەر پلانی باووباپیرانیان هەنگاو دەنێن، ئایا هەڵوێستی ئێمە بەرانبەر بە شیعە چۆنە؟ چۆن لەگەڵیاندا ڕەفتار بكەین؟ ئایا بێ دەنگی باشە هەڵی بژێرین یاخود قسە كردن؟ ئایا جاهیل بوون باشە یاخود بە عیلمەوە قسەیان لەگەڵ بكەین؟

## عەلەویەکان بناسە

ئەوکەسەی کە ئەم بیرو هزرەی دامەزراند ناوی "أبو شعیب محمد بن نصیر البصري النمیري" لە ساڵی (٢٦٠) کۆچی دامەزراوە بەناوی ئەوەوە ناونرا نوصەیرییەکان.. ئەم کەسە تاوانبارترین کەسە لە سەر ڕووی زەوی ئەم بیرو باوەڕە لە شاری "حەلەب" لە سوریا دامەزرا. پاشان بڵاویان کردەوە بە جیهانی ئیسلامیدا دوو کەسی سەرەکی بوون کە یەکێکیان لە میسر بەناوی"أبو محمد عبد الله بن محمد الجنان الجنبلاني"(٢٣٥-٢٨٧)کۆچی ئەوتریشیان لەشاری بەغداد بەناوی "علي الجسري" (٢٣٠)کۆچی لە دایك بووە.

لە میسر بانگەشەی نوصەیری لە ناو دەوڵەتی عوبەیدیەکاندا پەرەی سەند تا دامەزراندنی دەوڵەتی حەمدانی لە حەڵەب و موسڵ، سەنتەری ئەم بیروباوەڕە لە شاری حەڵەب سەرچاوەی گرتبوو تا دوایی گوازرایەوە بۆ شاری "لازقییە" لە سوریای ئێستادا.

### بیروباوەڕی نوصەیریەکان بەمشێوەیە دامەزراوە..

بروایان بە حلول و تەناسوخ (دۆناودۆن) هەیە

**حــلول:** بریتییە لە تێکەڵ بوونی ڕۆحی ئیمامەکانیان بە خوا و تێکەڵبوونی خوا لەگەڵ جەستەی ئیمامەکانیان، واتە: (خواو ئیمام بەیەکەوە حوکمی سەرزەوی دەکەن)؛ بۆیە پێیان وابوو کە ئیمام ئولوهیەتی خودای تێدایە.

(تناسوخ) واتە: (ئیمامەکانیان نامرن، ڕۆحەکانیان لە جەستەی تردا دێنەوە سەر زەوی و بەزیندویەتی دەمێننەوە)، بەگشتی پێیان وایە ئیمامەکانیان

لە دوای مردنیان دەگەڕێنەوە بۆ دنیا و بە هەمیشەیی دەمێننەوە، هیچ بڕوایەکیان بە قیامەت نیە، ئەوەی کە پێی دەوترێت زیندووبوونەوە لە ژیانی قیامەتە لای نوصەیرییەکان هیچ بنەمایەکی نیە و بە ڕاستی نازانن، هەموو ڕۆحی مرۆڤەکانیش لە گیانلەبەری تردا دێنەوە ژیان لەسەر زەوەیدا ئەگەر کەسانی پاك بن ئەوا لە گیانلەبەرە جوان و پاکەکان دێنەوە سەر زەوەی وەك پەپولە و ئاسك و چۆلەکە.. تاد، بەڵام ئەگەر خراپ بوون ئەوا وەك قالۆنچە و مشك و کرم دێنەوە سەر زەوەی.

ئەم بیرە لە دوای زەمەنێکەوە دادەمەزرێت کە لە مێژوودا ناونراوە بە (حيرة الشيعة) لە دوای مردنی "حەسەن عەسکری" کە منداڵێکی بە جێهیشت لە دوای خۆی بە ناوی مەحممەد کوڕی حەسەنی عەسکەری لە لای شیعەکان ناسراوە بە "موحمەدی مەهدی" بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد، ئیتر هیچ ئیامێکیان نەما لەناویاندا لە ساڵی (٢٦٠) کۆچی بۆ ئەوەی بزووتنەوەکەی بەردەوام بێت بۆ دەسەڵات دژی عەباسی و ئومەویەکان. ئەم بزووتنەوەیە سەرەتا هیچ سەرچاوەیەکی لە بیروباوەڕی نەبوو تەنها بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێری بوو بۆ دەسەڵات هەوڵی ئەداو بەناوی بنەماڵەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەسەڵات وەربگرێت، ئیتر لەو سەردەمەوە چەند بیروباوەڕێك بڵاوکرایەوە کە گوایە محەممەد کوڕی حەسەن عەسکەری ناسراو بە مەهدی، چۆتە شاخێك لە "سەماڕا"و دوایی خۆی کردووە بە سەردابێکدا. ئیتر لەو سەردەمەوە لەو سەردابەدا دەژی تا ئێستا، وا بڵاوکرایەوە کە چوار کەس دەچن تەشریع و ئامۆژگاری لەم ئیمامە وەردەگرن کە ڕاستەخۆ شیعە لەلایەن ئەوەوە ئاڕاستە دەکرێن، مەهدیش ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە وەحی بۆ دێت، ئەو چوار کەسە ناسراون بە " باب المهدي" واتا دەرگاکانی مەهدی یاخود بە "سفير المهدي" واتا سەفیرەکانی مەهدی بۆ خەڵکی..

ئەم بیرە بڵاوبوویەوە لەناو شیعەدا بەگشتی، بەڵام لەدوای ئەوەی کە محەممەد نوصەیری ئەم بیرەی گۆڕی وای بڵاوکردەوە کە ئەو بۆ خۆی بە تەنها لەگەڵ مەهدی قسە دەکات و هیچ سەفیر و دەرگایەکی نیە بێجگە محەممەدی نوصەیری، پاشان بەوەشەوە نەوەستا، محەممەدی مەهدی کردە خوا و خۆشی کردە نێدراوی ئەو کە گوایە پێغەمبەرە، پاشان زیاتر ئەم بیرە خورافیەی نووسیەوە بە ناوی ئەوەی کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب خوایە و محەممەدی پێغەمبەری ناردۆتە سەر زەوەی، نوصەیریەکان کە ئێستا ناسراون بە عەلەوی، پاشان وایان بڵاوکردەوە کە سەلمانی فارسیش خوایە؛ چونکە دەبێت بنەمایی ئەم بیرە بگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی فارسەکان لە ڕێگای "أبو محمد عبد الله بن محمد الجنان الجنبلاني" کە بۆ خۆی فارسە بە ڕاهیبی فارسی ناسراوە، چووە میسر و ئەم بیرەی لە هاوڕێکەیەوە بڵاو کردەوە محەممەدی نوصەیری، دوای ئەوەی کە بڵاویان کردەوە عەلی خوایە، پاشان خوایەتی داوە بە سەلمانی فارسی، دوای ئەوە سەلمانیش پێنج خوای تری دروست کردووە بۆ ئەوەی کاروباری ئیداری ئەم کەون و بوونە بەڕێوەبەرن بە ناوی.. یەکەم: مقدادی کوڕی ئەسوەد: کە ئەمیان خوای هەورە بروسکەیە، باران و بەفر و ڕووبار و..تاد.

**دووەم:** ئەبوزەری غیفاری: خوای ڕۆژو ئاسمان ئەستێرەکانە، کە دەبێت بیانسوڕێنتەوە ئاگاداری ئەم کەونە بێت!

**سێیەم:** عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە: ئەمیان خوای با و ڕۆح کێشانە، بۆ ئەم کارە دانراوە لە لایەن سەلمانەوە..!

**چوارەم:** عوسمانی کوڕی مەعزوم: ئەمیش سەرما و گەرما و نەخۆشی مرۆڤەکانی بەدەستە.

**پێنجەم:** قەنبەری کوری کادان: ئەمیش ڕۆح کێشان و خستنەوەی ڕوحی مرۆڤەکان بە گینلەبەرانی تر وەك تناسخ لەسەرەوە باسمان کرد.

بە گشتی پێیانوایە هەموو سەرکردەیەکیان تێکلاوە بە ڕۆحی خوا-- خوا تێکەڵ بە سەرکردەکانیان دەبێت، بۆیە عەلەویەکان لە سوریا سوجدەیان بەخەڵکی دەبرد بۆ بەشار ئەسەد، ئەم کارە لە ڕووی ئازار و ئەشکەنجەوە (تعذیب) وە نەبووە؛ بەڵکو لە ڕووی بیرو باوەڕەوە بوو کە پێیان وایە بەشار ئەسەدی موجریم خوایە.

**لە ڕووی بەندایەتیەوە بڕوایان وایە کە :**

- غوسڵ و لەش پیسی و دەستنوێژیان نیە.

- لە نوێژدا سوجدە نابەن بەس ڕکوعیان هەیە، نوێژیان وەك نوێژی موسڵمانان نیە، پینج فەرزەی نوێژ واتا ( عەلی و حەسەن و حوسێن و موحسین و فاتیمە) وشەی موحسین کە بە کاریدێنن ڕەمزە بۆ دەستنویژ و غوسڵ

- بڕوایان بە حەج نییە، ئەوەی بچێتە حەج بە کافری دەزانن، پێیان وایە موشریکن و خەریکی بت پەرستین.!

- پیاوانیان ڕۆژ و ناگرن تەنها ڕۆژ و لەسەر ئافرەتان فەرزە.

- شەراب لایان زۆر پیرۆزە، خواردنەوەی بە بەندایەتی دەزانن ڕێزی ڕەزە ترێ و ترێ بە گشتی دەگرن و پیرۆزە لایان.

- بڕوایان بە زەکات نییە، بەڵام بڕە پارەیەك دابین کراوە لە لایەن شێخەکانیانەوە کە دەبێت وەك زەریبە ساڵانە بیدەن..

- ڕقیان لە هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ بەگشتی و بە بەندایەتی دەزانن جنێو بدەن بە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و خاتوو عایشەی دایکی موسڵمانان ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت.

- لە کاتی شایەتومانیاندا پەنجە بەرز دەکەنەوە ئەم سێ وشەیە دەڵێن (ع،س،م)[١] کە ڕەمزێکی عەلەویەکانە.

- دەڵێن سەلمانی فارسی قورئانی فێری محمد کردووە لە ژێر ناوی جوبرئیل دا.

- ئەقیدەیان باطنیە هەمووکەس بۆی نیە لێی بکۆڵێتەوە تەنها زاناکانی خۆیان نەبێت، ئەوی کە ظاهیرە بۆ گشتی دەریدەخەن.

ئەمە مشتێك بوو لە خەرواری نوصەیرییەکان کە ئێستا ناسراون بە عەلەویەکان، کە لەسوریادا حوکمی ئەو خەڵکە دەکەن بە ئاگر و ئاسن، کوشتنی ئەو ٦٠ هەزار کەسەی بە دەستی بەشاری موجریم شەهید بوون، عەلەویەکان بە بەندایەتی دەزانن بۆ خۆیان، لە سەردەمی باوکی تاوانباری کەناسرابوو بە (حافز ئەسەد) ٣٠ هەزار کەسی لە شاری حەما شەهید کرد، لەگەڵ ئیسرائیلدا دەستیان تیکەڵە و لە ڕێگای شیعە دروزەکانەوە بەشدارن لە حوکومەتی ئیسرائیلی لە ناو کەنیسەدا بە ناوی شیعەی دوروزی کە سەرۆکەکەیان باوکی وەلید جومبلادە، ئێستا وەلید سەرۆکایەتی ئەو تایفە شیعەیە دەکات.

ئەم تایفە شیعە تاوانبارە ناسراون بەنوصەیری(عەلەوی) ئەمانە لە ئێستا کەمینەی ناو سوریان، لە ساڵی (١٩٨٥) کە سەرژمێری سوریا

---

(١) نووسەر- بۆم نەدۆزرایەوە مانای ئەم سێ وشەیە چییە زۆر هەوڵمدا.

کراوە پێك هاتوون لە (١١٪) کە لەڕاستیدا ئەم ژمارەیە هیچ ڕاستییەکی تێدا نیە بەڵکو لە دوای ئەوە کە پرسیار کرا لە(٥٪) بۆ ئەوەی ڕای گشتی پێ چەواشە بکەن، ناوی عەلەویش بۆ پیرۆزی نوصەیرییکان ئیستعماری فەرەنسی ئەم ناوەی بۆ داناون کە هەموو مێژووەکەی ناگەتە (١٠٠) ساڵ ڕاستی ناوی ئەم تایفەیە نوصەیرییە نەك عەلەوی.

### ئایا ئەم تایفەیە کافرن یان موسڵمان؟

بەدرێژایی مێژووی ئەم ئیسلامە زانایان کە ئەم گروپە دەرکەوتن، هیچ کاتێك بە موسڵمان هەژمار نەکراون..

زانایان بە گشتی دەڵێن: بە هیچ شێوەیەك سەربڕاویان جائیزنیە و نانی دەستیان ناخورێت، ژن و ژنخوازیان لەگەڵدا جائیز نیە، نوێژیان لەسەر ناکرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێن، بەهیچ شێوەیەك پاسەوانی و سەنگەرنشینیان پێناگیرێت لەگەڵ موسڵماناندا، ئەمە ڕای زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەیە.

لەبارەیانەوە شیخو لئیسلام پیاوچاکی کوردان، قەڵەمی ئەم ئومەتە ئیبن و تەیمییە دەفەرموویت:

هؤلاء القوم المسمَّون بالنصيرية -هم وسائر أصناف القرامطة الباطنية- أكفر من اليهود والنصارى، بل وأكفر من كثير من المشركين، وضررهم أعظم من ضرر الكفار المحاربين مثل التتار والفرنج وغيرهم.. وهم دائماً مع كل عدو للمسلمين، فهم مع النصارى على المسلمين، ومن أعظم المصائب عندهم انتصار المسلمين على التتار، ثم إن التتار ما دخلوا بلاد الإسلام وقتلوا خليفة بغداد وغيره من ملوك المسلمين إلا بمعاونتهم ومؤازرتهم».

واتە: ئەم گەل و هۆزە کە ناسروان بە نوصەیری، بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ شیعەی قەرامیطە- کافرترن لە یەهود و نەسارا، بەڵکو کافرتریشن لە هاوبەشدانەرەکان (موشرکین) زەرەر و زیانیان بۆ موسڵمانان لە زەرەری کافری شەڕکەر، هاوشێوەی تەتار و فرنجە و سەلیبی کە دونیای ئیسلامیان تێکوپێکدا، ئەمانە خراپترن، لەوانەش بە هەمیشەیی دژی موسڵمانان بوون، تێیاندایە لەگەڵ نەسارەکاندا بوون دژی موسڵمانان ئە، لەگەڵ تەتار دەستیان تێکەڵ بوو بۆ ڕوخاندی خەلافەتی عەباسی و هەمیشە دەستی دوژمنانی ئیسلامیان گرتوە بۆ ئەوەی سەربکەون بەسەر ئەمیرو سوڵتانی موسڵمانادا هەمیشە لە گەڕو پلان و گێرەشێوێنیدا بوون دژی موسڵمانان.

### جێگاو شوێنی نوصەیرییەکان لە ئەمڕۆدا

**یەکەم:** لازقییەی سوریا ناسروان بە(عەلەوی).

**دووەم:** ئەنادۆڵی شەرقی و ئازربایجان (قزڵباشی) واتا کڵاوسوورەکان.

**سێیەم:** کوردەکانی تورکیا بەشێکی کەم بەناوی (عەلی خوایەکان) کە دەڵێن (عەبدوڵا ئوجالان) لەم کۆمەڵەیە!

**چوارەم:** تورکیا و ئەلبانیا ناسراون بە (بەگتاشیەکان).

**پێنجەم:** هەنێکی تریش لە لوبنان و فەڵەستین دەژین.

## باطنیەکان بناسە

(باطنی)یەکان دوو کۆمەڵە بوون لە (فاطمی)یەکان جیاببوونەوە، کۆمەڵێك یان کوڕانی(مستعریە)یان پێ ئەوترێ، کۆمەڵەکەی تریش پێیان ئەوترێ (نزاریة)، موستعرییەکان توانیان سوڵتە و دەسەلاتی فاطمی بگرن بەدەستەوە، بەڵام نزارییەکان لەڕێگای مونەزیرێك یانەوە کەناسراوە بە(حەسەن کوڕی صەباح)یان ئیبنو صەباح لەگەڵ (ئیبنو عەطاش)دا هەردووکیان جیائەبنەوە و دێن بۆ ناوچەکانی شام، لەوێ بەدرۆ خویان بەئەهلی سوننەت نیشان ئەدەن تا ئەچنە ناوجەرگەی دەوڵەتی ئیسلامی‌یەوە، دوای ئەوەی چەند قەڵا و جێگە و قولەیەك ئەگرن لەموسڵمانان، لەوێدا دەوڵەتی خۆیان درووست ئەکەن، (حەسن کوڕی صەباح)یەکەم کەس بوو حەشیشەی دۆزییەوە بۆیە پێیان ئەوترێ شیعەی حەشاشین، یان شیعەی ئیسماعیلی حەشاشین، سەرەتا کە ئەم گوڵەی دۆزییەوە باخچەیەکی دروست کرد و ناوی نا(بەهەشت) گوڵەکە ناوی خەشخاشە.. ئافرەتی ئەکردە ناو ئەو باخچەیە بەردەوام خەڵکی خومار ئەکرد و پێیانی دەگوت ئەگەر ئێوە لەم بەهەشتە بمێننەوە بەخۆشی و شادی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا ڕائەبوێرن و بەردەوام خوماریشن، هەرکارێکی پێ بکردنایە ئەی ناردن و دواتر بەهۆی تلیاکەکەوە ئەبوایە بگەڕیانەتەوە بۆلای حەسن کوڕی صەباح و زۆربەی زۆریش یان ئەکوژران یان ئەگیران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وازیان نەئەهێنا، لەبەر ئەوەی حەسن کوڕی صەباح هەموویانی فێری تریاك و حەشیشە کردبوو، بۆیە ئەمانە لەمێژوودا ناسراوان بە(ئیسماعلی حەشاشین) زوربەی زۆری

ئەهلی سوننە و جەماعەت بەدەستی (باطنی) یەکان شەهید ئەبوون، ئەوە ئەو تواناو هێزە حەشیشەییە بوو کە لەو سەردەمەدا تازە دۆزرابووەوە.

شایەنی باسە حەسەن کوڕی صەباح و ئیبنوعەطاش دووکەسی پیس و ناپاك بوون، زۆرێك لەئەهلی سوننەت و جەماعەتیان شەهیدکرد، بەردەوام دەستیشیان تێکەڵ بوو لەگەڵ صەلیبیەکاندا ئەمانە باوەڕیان بەنوێژی ئیسلام و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)نەبوو، هەر دین و بیروباوەڕێکی تایبەت بوو بۆ خویان دروستیان کردبوو، هۆکارێك بوو کە خۆشیان نەیان دەزانی باسی چی ئەکەن هەتاوەکو (ئیمامی غەزالی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت کەخۆی چووە ناویانەوە ، کتێبێکی نووسی بەناوی(فضائيح الباطنيه) دواتر زانی ئەمانە چەنە خراپەکارن کتێبیکی لەسەر نووسین.

## خەواریج و ڕوێبضە بناسە

زانایان بەتایبەت ئەبو لحسەنی ئەشعەری.. ئەم گروپە بە دەرچوو لە ژێر سایەی دەسەڵات سیستەمی خەلافەتی ئیسلامی هەژمار دەکەن.. بە تایبەت لە خەلافەتی چوارەمی ڕاشیدین پێشەوای موسڵمانان عەلی کوری ئەبوطالیب، عیللەتی ناوەکەیان لەوە سەرچاوەی گرتوە کە دەرچوون لە خەلافەتی ئیسلامی، واتا ئیخراجیان کردووە لەو دەسەڵاتە بۆیە پێیان دەترێت خەوارج!!

ئەمە دەقی وتەکەی ئەبو لحسەن ئەشعەریە (قال ڕحمە اللە تعالی: «والسبب الذي سموا له خوارج خروجهم على علي لما حكم“)

ئەم گروپە لە دوای ڕووداوی صەفین لە عەلی کوری ئەبوتالیب جیابوونەوە، داوای ئەوەیان دەکرد دەبێت خوا لەنێوانماندا فەرمانڕەوابێت تەکفیری ئیمامی عەلیان کرد، لەگەڵ ئەمیری موسڵمانان عوسمانی کوڕی عەفان..، بەڵام لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر ڕەزامەندی خوایان لێبێت بە خەلیفەی موسڵمانان دەزانن.

بۆ زانیاری زیاتر ئەم گروپە لە مێژوودا تەنها بە خەواریج نەناسراون بەڵکو چەند ناوێکی تریان هەیە...لەوانە (حرورية، شەرات، ئیباضية، ماريقة..هتد) تەنها بە ناوی ماریقە ڕازینین چونکە ئەو وشە بە واتای ئەوەی کە چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت ئەمانیش لە دین دەرچوون، دەنا بە هەموو ناوەکانی تر ڕازین.

هەرچەندە کۆمەڵێك لەزانایان پێیان وایە ئەم گروپە سەرلێشێواوە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری ئازیز(صلى لله عليه وسلم).

لەو زانا بەرێزانە وەك ئیبن قەیم، شەهرستانی، ئەبو محەممەدی کوڕی حەزم، هتد..

دەفەرموون ئەم گروپە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە دروست بوون، کەسێك بەناوی (خویصرة) کە لە خزمەتی پێغەمبەردا دانیشتبوو، بێڕێزی کرد لە مەجلیسی پێغەمبەردا و ڕووەو پێغەمبەر وتی موحەممەد لە خوا بترسە.. فەرموودەکە دوورودرێژە بەوەندە کۆتایی پێدینم..بەڵام فەرموودەکە وەك خۆی دادەنێم کە لە ئەبی سعیدی خودریەوە.. گێراوەتەوە..( بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ مِنَ الْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ. لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا. قَالَ: فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنٍ وَالأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ، وَالرَّابِعُ إِمَّا عَلْقَمَةُ بْنُ عُلاَثَةَ وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلاَءِ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ r، فَقَالَ: "أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ، يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً". قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ نَاشِزُ الْجَبْهَةِ كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقُ الرَّأْسِ مُشَمَّرُ الإِزَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اتَّقِ اللَّهَ! قَالَ: "وَيْلَكَ! أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ").

پاشان سەروەرمان لەباسی ئەم گروپە سەرلێشێواوە دەفەرمووێت، ئەم کۆمەڵە سەرلێشێواوە نوێژ دەکەن..، قورئان دەخوێنن..بەڵام قورئانەکان لە قورگیان بەرزنابێتەوە..، وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت ئەمانە دەرچوون لە دین، پێغەمبەر دەفەرمووێت: ئەگەر بۆمان هەڵکەوت و ئەوانەمان بینی دەیان کوژین، وەك کوشتنی سەمود واتا دەبێت لە ناوبچن.. ئەمە دەقی فەرموودەکەیە (قَالَ: ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ قَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟! قَالَ: "لاَ، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي". فَقَالَ خَالِدٌ: وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ

"إني لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوب النَّاس وَلاَ أَشُقَّ بُطُونَهُمْ". قَالَ: ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْه وَهُوَ مُقَفٍّ فَقَالَ: "إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُون كتَابَ اللَّه رَطْبًا لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجرَهُمْ، يَمْرُقُونَ منْ الدِّين كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ". وَأَظُنُّهُ قَالَ: "لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ)

## ڕوێبضە چــییە؟

روێبضە واتا خەڵكانێكن كە پێغەمبەر دەفەرمووێت تافهن واتا زۆر سووكن، لە كاروباری موسڵمانان دەست وەردەدەن بەناوی موسڵمانانەوە ئاخافتن دەكەن، زانایان ئەم ڕوێبضانە بە مستەشریقین یاخود سیاسییە بێباوەڕەكان كە دەست وەردەدەنە ناو كاروباری موسڵمانان و ئیسلام بەگشتی، بۆ نمونە دەڵێن دەبێت ئیسلام دیموكراسی بێت پەنا بەخوا، یان ئیسلامی ڕادیكاڵی، توندرەو، میانەڕەو ئەو ناوانەی كە بۆی دادەتاشن، زۆرێك لە نمونەی تر وەك بەناو موسڵمانان فڕیان بە ئیسلامەوە نییە، خۆیان خەڵكێكی تافهن وەك زوڕنا ژەنن! بۆ دەسەڵات زوڕنای لێئەدەن، دیارە مەبەستم خودی زوڕناكە نییە، بەڵكو مەبستم فووكردنە بەو ڕیكلامانەی كە ئەمان بۆ زاڵمەكانی دەكەن، خەڵك دەستەمۆ دەكەن كە دەستبگرن بەكڵاوەكەی خۆیانەوە با كەس زلەیان لێنەدا، وەك خۆیان ترسنۆك و جەبان بن لەبەرانبەر بێباوەڕكاندا، زرنگ و شێر بن بەرانبەر بە موسڵمانان، لە دەزگاكانی عەلمانی بەناوی موسڵمانەوە تەحقیق لە موسڵمانان بكەن، سوێند بەخوای گەورە دوو برای هەولێری گیرابوون لەشاری هەولێر ئەوەی كە تەحقیقی لەگەڵ كردبوون ئەم جەماعەتی بەناو سەلەفیانە بوون كە خۆی بۆی گێڕامەوە، ئەوەندە بەلاتانەوە سەیر نەبێت زۆرن لەو نمونانەی بە ئاشكرا لە ڕاگەیاندن و پێگەكانەوە خۆیان و نووسینەكانیان

دەبینرێن، خوای گەورە هیدایەتیان بدات ئەگەر قابیلی هیدایەتن خۆ ئەگەر نا خوایە گیان بە زووترین کات لە ناویان بەرێت..ئامین.

ئەمانە پێیان وایە هەر کەس کەسێکی کافر بە کافر زانی و کافر کرد ئەوە خەواریجە، لەکتێکدا کافرکردن حوکمی شەرعییە، کە خەڵکی بڕوای بە بچوکترین حرف نەبوو لەم ئیسلامەدا بێهیچ شك و گومانێك کافردەبێت، جا ناکرێت کەس کافر نەکەیت بۆ ئەوەی ئەمانە کە خۆیان مورجیئەن دڵیان پێی خۆشبێت، مەبەستم ئەوە نییە دوای بیکەن بە قالو قیل بڵێن ماکوان لەخۆیەوە خەڵکی کافر دەکات، دیارە مەبەستەکەم پێوەری شەرعی ئیسلامە، چونکە پەنا بەخوا خەواریج خەڵکیان لەسەر تاوان کافر دەکرد ئەگەر چی تاوانەکە لەتاوانی بچووك هەژماربکرایە.

فەرموودە زۆرە لەسەر خراپی خەوارج لەو فەرموودانەی سەروەرمان صلى لله عليه وسلم دەفەرمووێت (سَيَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَّةِ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ؛ فَإِنَّ فِي قَتْلِهِمْ أَجْرًا لِمَنْ قَتَلَهُمْ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)

ئەم خەواریجانە لەدوای ئەوەی کە هێزیان جیاکردوە لە پێشەوای موسڵمانان عەلی کوری ئەبوتالیب،دەیانوت دەبێت خوا لە نێوانماندا فەرمانڕەوابیت، ئەم وتەیە خۆی بۆخۆی شتیکی جوان و چاکە، بەڵام وەك ئیمامی عەلی دەفەرمووێت: ڕەزامەندی خوای لێبێت وشەیەکی حەقە بەڵام مەبەستەکەی پێ باطڵە، وەك سەلەفییەکانی مەدرەسەی شا عبدوڵای سعودی ئێستا، هەموو دەڵێن باخوای موتەعال فەرمانڕەوابێت، ئەوان وەك خەواریج دەمدرێژی دەکەن بەسەرماندا گوایە ئەوان ئەهلی

سەلەفن و بە کیتاب و سوننە دەرۆن بەڕێوە ئێمەیان پێ جاهیلە، کەچی پێیان وایە لە دەسەڵاتێکی عەلمانی کافر ڕاپەریت وەك حوسنی موبارەك و زین عابیدین طاغوتێکی کافری وەك موعەمەر قەزافی و بەشاری کەلب، کە لەم ڕۆژانەدا زیاد لە (٤٥٠٠٠) کەسی لە خەڵکی سوریا شەهید کردووە، خوای گەورە بە شەهید قوبوڵیان بکات، ئەوانە بە موسڵمانان دەزانن ئەوەی کە کوژراوە جاهیلە و خەواریجە پەنا بە خوای گەورە لە مەکری ئەم شینە نا سەلەفیانەی خەلیج و ئیخوان بە دوژمنی دین دەزانن، پێ دەچێت زۆرێك لەو کاربەدەستانەی ئێمە کە خۆیان دەڵین ئیسلام بە کەڵکی دەسەڵات نایەت دەبێت دین لە دەوڵەت جیا بکرێتەوە، ئەوانە بە ئەمیری موسڵمانان هەژماری دەکەن، موسڵمانان بە خوارج ڕوەیبضە و ئاماژەیان بۆ دەکەن، دەی خۆتان بڵێن خەڵکی نا.. ئەم گروپە سەرلێشێواوانە.. ئەو وتەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب نایانگرتەوە، کە دەڵێن سەلەفین شوێنکەوتووی کیتاب و سوننەتین، قسەکە حەقە بەڵام لە ناواخندا چەواشەی موسڵمانانە!.

پێیان وایە ئەگەر دەربچیت لە دەسەڵاتیکی زاڵم ئەوە خەواریجی! لێردە ئەوە بیری ئەو گروپە دەخەمەوە کە سەرلێشێواوێکی وەك تەیموری لەنگ کە هەموو قورئانی لەبەر بوو بە هەردوو دەست شمشێربازی دەکرد، زۆربەی دنیای خستە ژێر فەرمانڕەوای خۆی، بەڵام ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت کافرە چونکە لە دەسەڵاتەکەیدا کاری بە قورئان نەدەکرد، بەڵکو سیستەمی وڵاتەکەی یاسقی جەنگیز خان بوو نەعلەتی خوای لبێت..! یان حەجاجی کوری یوسفی سەقەفی ئەگەر بە حسابی ئەو بەناو سەلەفیانە بوایە ئەو هەموو تابیعە بەرێزە دژی ئەو دەسەڵاتە بوون، بە وتەی ئەوان بێت هەموو جاهیلن، یاخود کەسێکی وەك عەلقەمە کە

پێشەوای موسڵمانە ئەهلی سەلەفە، لەدەسەڵاتێکی وەك عەبدولملەلیکی کوڕی مەروان شوڕشی کرد، دەڵێن ئەگەر عبدولملەلیکی کوڕی مەروان خەلیفە نەبوایە ئەوا یەکێك بوو لە زانایانی ئەم ئوممەتە، بۆیە ئەو وتەیەیان وەك فلسی قەڵب وایە تەنها سەرچاوی خۆیان پێ دەگرێتەوە کە گوایە هەرکەس خەبات و شورش بکات ئەو بە خەواریج ئاماژەی بۆ بکرێت..

ئیتر باسی شوڕشەکانی ناو ئەندەلوس ناکەم کە عەبدولڕەحمانی کوڕی داخل کردی بەسەر هەموو والییەکانی ئەو وڵاتە کە زیاد لە (٢٢) والی لەو ولاتەدا بوون دژی هەموویان شوڕشی کرد، خۆشی لە خەلافەتی عەباسی جیا کردەوە، وە هیچ زانایەك نە لە دوژمانی ئەو پیاوە نە لە یاوەرانی بەم عەبدوڕەحمانی داخلەیان نەوت تۆ خەواریجی!!

یاخود شورشی ئیبراهیمی جودالی، کە شورشی کرد دژی گەلەکەی خۆی، موسڵمان بوون بەڵام دەسەڵاتەکەی خراپ بوو، یان شێخ عەبدوڵڵا یاسین و یوسفی کوڕی تاشفین، ئەبوبەکری عومەری لەمتونی...هتد

کە لەو سەردەمەدا پیاوانی وەك ئیمامی غەزالی هەبوون کەسیان ئەوانیان بە خەوارج نەزانی!!

کوتایی وتەم لەم تەوەرەدا بەوە دێنم کە سیستەمی خەلافەت لەسەردەمی عەباسییەکان وێران بوو بوو بەدەست شیعەوە، بەڵام هەر موسڵمانی ئەهلی سونتەت و جەماعە خەلیفە بوون، پاشان سوڵطان دامەزرا وەك سوڵطان مەحمودی سەلجوقی فەرمانڕەوای دەکرد یان سوڵطانەکانی خەواریزم، یاخود سوڵطانەکانی هند کە بە غورییەکان ناسرا بوون، لە هەمان کاتدا ئەمیر دامەزرا کە هیچیان پەیوەندییان بەسەریەکتر نەبوو وەك مودوحی کوڕی تونتەکین و عیمادەدین زەنکی، لەمێژووی ئەم ئیسلامەدا کەسێك

بەمانەی نەوتووە دەرچوون لەفەرمانڕەواکان و دەسەڵاتداران، ئیتر بە خەوارج حساب دەکرێن، کە ئەو زەمەنە هەموو موسڵمان بوون کەس جورئەتی ئەوەی نەکردوە بڵێت دین و دەوڵەت لەیەك جیا دەکەمەوە وەك سەرکردەکانی ئێستای کورد بە ئاشکرا ئەوە دەڵێن گوێمان لێیان بووە لە کەناڵەکانەوە زیاد لە دەیان بەڵگەی تر لەبەر دەستان، تەنانەت ناوەکانیان دیارە وەك ئەو حیزبە بەناو لیبرال و سۆسیال دیموکراتانەی کوردستان.

خاڵێکی تر کە زۆر گرنگە لە جاسوسی ئەمانە کە دەیکەن بۆ دەسەڵات جا ڕاستەوخۆ بێت یان ناراستەوخۆ کە جیاوازی نیە لای من، وەك یەك حسابیان بۆ دەکەم، عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب لە جەنگی جەمەل و صەفین دا زۆر ناڕەحەت بوو، خەفەت بار بوو، بەڵام لە شەڕی نەهرەوان کە سەرکەوت بەسەر خەواریجدا زۆر دڵخۆش بوو چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتە دی، جا ئەم بەناو سەلەفیانە کە خەڵکی بە خەوارج دەست نیشان دەکەن بۆ ئەوەیە هەر یەك لە ئەفرادانی مەدخەلی موسڵمانێك بدەن بە دەستەوە بۆ زیندانەکانی دەسەڵات، ئەوان بە خێر و پاداشتی دەزانن، لای ئێوە ئاشکرایە موسڵمانانی زێدە ئازیز کە جاسووس حوکمی لە ئیسلامدا کوشتنە، تەنها زانایان لەوەدا ڕای جیاوازیان هەیە کە لە گۆڕستانی موسڵمان بنێژرێن یان نابێت لەوێش بنێژرین، جا ئەم سەرلێشێواوانە وا هەست نەکەن هەروا بە ئاسانی بۆیان دەڕواتە سەر بیرلەوە بکەنەوە، کە ڕۆژانێك دێت موسڵمانان دادگای شەرعیان هەیە..!

ئەم جاشایەتیەش لە بیر موسڵمانان ناچێتەوە بە هەموو هێزوو توانەیەکتان بونەتە کاسەلێس و دەتانەوێت پێگەی موسڵمانان لاواز بکە خوای گەورە تۆڵەتان لێبستێنێت..ئامین. موسڵمانان هەروا لاواز نابن.. (وتلك الأيام ندولها بين الناس)

## سەلەفی ناسراو بە مەدخەلیەکان بناسە

لە کۆتایی ساڵەکانی نەوەدەکانەوە کۆمەڵێك لە کوردستان وەك خەڵکانێکی سەلەفی سەریان هەڵدا و ناسران بە (مەدخەلی)، کۆمەڵە گەنجێکی دیندار کە تەنها بیروبۆچوونیان وابوو کە دەبێت خۆت فێری زانستە شەرعییەکان بکەیت واز بهێنرێت لە سیاسەت و هەوڵدان بۆ دەسەڵات، ئەم دید و مەنهەجە کەسێك داینا.. ناوی ڕەبیع کوڕی هادی مەدخەلی بوو کە ئێستا لە وڵاتی عەرەبستانی سعودی ژیان دەباتە سەر بە زانایەکی سەلەفی، ئەو قوتابخانەیەی کە بە مەدخلی ناسراوە ئاماژەی بۆ دەکرێت کە دەڵێن شارەزایە لە زانستەکانی پیاوناسی (علم الرجال)، هەروەها پێش ئەمیش پیاوێك کە ناوی محەممد ئەمان ئەلجامی کە مامۆستای ڕەبیع بووە خەڵکی حەبەشەیە و دواتر هاتۆتە سعودیە لە ساڵی ١٩٩٦ کۆچی دوای کردووە.

### ئەم قوتابخانەیە کە ناسراوە بە مەدخەلی چون دروست بوو؟

ئەم کۆمەڵە خەڵکە سەرەتا لە ململانێی نێوان بنەماڵەی عەبدالعزیز دروست بوون لەسەر دەسەڵات، کۆکردنەوەی خەڵکی لە دەوری ئەو بنەماڵەیە لە ناو خاکی سعود دا، ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی کە بنەماڵەی عەبدولعزیز و بنەماڵەی بن لادن و بنەماڵەی بەندەرسوڵتان کە سێ بنەماڵەی دەوڵەمەندی ناو ئەو وڵاتەن. لە ناو بنەماڵەی عەبدولعزیزدا بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان مەلیك فەهد و مەلیك عەبدوڵڵا و لەگەڵ ئەمیر نایف بوون بەیەك دژی ئەمیر تەلاڵ کە ناسرا بوو بە مەلیك ئەحمەر کە ئێستا بەردەوام لە سعودیە بە ئاشکرا دژایەتی دەسەڵاتی مەلیك

عەبدوڵڵا و نایف دەکات و هەموو ناوەندی ڕاگەیاندنەکان درکیان بەوە کردووە، ئەمیر تەلاڵ پێشتر لە وڵاتی سعود دەرکرا چوو بۆ میسر، زۆر کاریگەری (ناسری) لەسەر بوو پاشان گەڕاندیانەوە بۆ سعودیە، پاشان تاوانبار کرا بەوەی کە دەستی هەبووە و تەدەخولی کردوە لە سیاسەتی سوریادا، ئێستا لەگەڵ بنەماڵەی بەندەرسوڵتان دەستی تێکەڵ کردووە بۆ دژایەتی کردنی مەلیك عەبدوڵڵا و ئەمیر نایف، ئەمانە بە ڕیفۆرمخواز ناو دەبرێن کە داوای دەستوری مەلەکی دەکەن. زۆرێك لە خەڵکی سعودیە پشتگیری لەم خەتە دەکەن کە هەندێك لە لایەنگرانیان لە ناو دەسەڵات دایە، زیاتر خەڵکانی ڕۆشنبیر پشتگیری لەمان دەکەن، دەیانەوێت دەسەڵات لە دەست ئەمان وەربگرنەوە، پێشتر بنەماڵەی بن لادن لەو کێشە و ململانیەدا بەشدار بوون، بەڵام بە هۆکاری ئەوەی ئوسامە بن لادن لە جیهانی ئەمڕۆدا ناوی بە تیرۆرست دەرچوو ئەو بنەماڵە ئێستا تا ڕادەیەك بە بێدەنگی ماونەتەوە.

ئەوەی کە ماوە بڵێین خەتی مەلیك عەبدوڵڵا و ئەمیر نایف بۆ مانەوەی دەسەڵاتی خۆیان و هەموو وڵاتانی دەوروبەریش پشتگیری لەم بەرێوەبردنەی دەسەڵاتی پێشتری فەهد و عەبدوڵڵا و نایف دەکەن ئەمانیش پەنایان بردۆتە بەر چەند زانایەکی ئایینی کە هەرکەسە لە دەسەڵاتی ئەمان یاخی بێت ئەوە بە بیدعەچی یان کافر وە یان خەواریج ناوزەدیان دەکەن، لەوانە مەدخەلیەکانن کە خۆیان بە شوێنکەوتووی ڕەبیع بن هادی مەدخەلی دەزانن، ناوی مەدخەلی لەم پیاوە وەرگیراوە بۆیە پیان دەوترێت مەدخەلی کە سەر بە دەزگای موخابەڕاتی ئەو وڵاتەن.

خاڵێکی گرنگی تر کە بووە هۆی دەرکەوتنی زیاتری ئەم مەدخەلیانە یاخود جامیەکان، کاتی هاتنی سوپای ئەمریکا بوسعودیە، کە هەندێك لە

عولەمایان و خەڵکی سعودیە دژی ئەمە بوون، بۆیە دەنگۆیەکی ناڕەزایی دروست بوو، حکومەتی سعودیەش زۆر لەمە ترسا کە ئیسلاحیەکان لەگەڵ ئەم خەڵکە نارازیە شتێك بکەن بۆیە بۆ دژایەتی ئەو خەڵکەی کە لەگەڵ دەوڵەت نین زۆر پێویستیان بە مەدخەلیەکان بوو بۆیە ئەمانیش ئیتر دیفاعیان لە هەڵوێستی حکومەتی سعودیە کرد و کەوتنە تەشهیر کردن و بە گومڕا دانانی ئەوانەی کە دژی حکومەتن، کۆمەڵێك زاناو گەنجی سعودیەیان بە گرتن دا بە هاوکاری لەگەل وەزارەتی ناوخۆی سعودیە.

**بیروباوەڕیان؟**

ئەم کۆمەڵە سەرەتا جیاوازییان هەیە لەگەڵ زۆربەی عولەمایانی ئەهلی سوننە لە ڕووی پێناسەی ئیمان کە پێیان ئەوترێت مورجیئە، چونکە پێیان وایە تەرککردنی جنسی عەمەل کوفر نییە، ئەم گروپە بە شێوەیەکی بەرچاو وشەی بیدعە بەکار ئەهێنن بۆ هەر کەسێك دژی دەسەڵات یا وەلی ئەمر بێت و هەر کەسێك لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئەوان نەبێت، بەکۆمەڵێك عولەمای زۆری ئەم ئوممەتە ئەڵین بیدعەچی، هەتا ئەو زانایەیانە ڕەبیع بن مەدخەلی شریتێکی هەیە بە زانایانی گەورەی وەك نەوەوی و ئیبنو حەجەریش ئەڵێت بیدعەیان هەبووە، زۆر تەقدیسی عولەماکانیان دەکەن و بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نادەن خەڵك ڕەخنەیان لێ بگرێت، هەروەها ئەڵێن: نابێت بە هیچ شێوەیەك موسڵمان بچێتە ناو دنیای سیاسەتەوە، چونکە سیاسەت بیدعەیە. دەبێت خۆیان سەرقاڵ بکەن تەنها بە وانەی شەرعییەوە و واز لە حاکمیەت بهێنرێت بو وەلی ئەمر و جیهادیش ناکرێت هەتا وەلی ئەمری موسڵمانان ئەمر نەکات !.

### کێ بەوەلی ئەمری موسڵمانان دەزانن؟

قوتابخانەی مەدخەلیەکان ئەوانە بە وەلی ئەمر دەزانن کە ئیستا لە دەسەڵاتن وەك حاکمە عەلمانییەکان و دەڵێن نابێت هیچ ڕەخنەیەکیان لێ بگیرێت، گەر بێت و کەسێك قسەیەکی پێ وتن ئەوە فاسقە و لە ئەمری وەلی ئەمر دەردەچێت، خۆ ئەگەر ویستت ئامۆژگاری وەلی ئەمر بکەیت دەبێت بچیتە بەردەمی خۆی نابێت لە پاش ملە قسە بە دەسەڵاتداران بوترێت چونکە غەیبەتە!، ناکرێت بە ڕێگای ڕاگەیاندن یاخود کەناڵەکانی ترەوە قسەیان لەسەر بکرێت. ئەمەش وای کرد کە زۆر نزیك ببنەوە لە دەسەڵاتداران، خۆ ئەگەر ڕاگەیاندن بە کار بهێنرێت بۆ ئەوەی لەو ڕێگایەوە گەندەڵی ئاشکرا بکرێت ئەوەش هەر فیتنەیە!.

بۆیە دەبینیت لەناو ئەم خەڵکەدا ڕۆژێك لە ڕۆژان بە دی ناکەیت ڕەخنە بگیرێت لە ئەدای دەسەڵات، لە دزی کردنی دەسەڵات، لە زیندانی کردنی موسڵمانان لە داخستنی مزگەوت و هەڕەشە و چاوزەقکردنەوەی دەزگا ئەمنیەکان، تەنها ئەوەی کە بەلایانەوە گرنگە گرنگی بدەنەوە بە پایەکانی ئیسلام و زانستە شەرعییەکان، هیچ گرنگی نادەن بە سیستەم و دەسەڵات و گۆرانکاری ناو سیستە مەکۆمەڵایەتییەکان، زۆرێکیشیان لەو واقیعە هەر تێناگەن.

### لەبەرانبەر ئیسلامیەکاندا چۆنن؟

ئەم قوتابخانەیە وتمان ناسراوە بە؛ مەدخەلیەکان، چەندە بەرانبەر بە عەلمانیەکان بێ دەنگن ئەوەندە ڕەخنە لە ئیسلامییەکان دەگرن، پێیان وایە هەرچی ناوی حیزبایەتی هەیە لە ئیسلامدا قەدەغەیە بۆ هیچ کەس ناشێت خۆی لە حیزبی ئیسلامیدا ببینێتەوە، چونکە لە ئیسلامدا کۆمەڵ و

گروپ و ڕێکخستن نییە و ئیسلامییەکان بە گشتی بە بیدعە چی دادەنێن و دەسەڵاتدارانی وڵات بە وەلی ئەمر، لە ڕاستیدا ئەدای ڕەخنەیان لەوەیە کە لەسەربنەمای حیزبی ڕۆژئاوا ئیسلامییەکان خۆیان ڕێکخستوە، پێیان وایە لە ئیسلامدا حیزبایەتی لەم جۆرە مۆدێلەی ئێستا بوونی نەبووە، بۆیە ئەوەیش هەر بە بیدعە دەزانن!.

## دەیانەوێت چی بکەن؟

هەتا بۆیان دەکرێت خۆیان لە دەسەڵات نزیك دەکەنەوە، یارمەتی هەموو دەزگا ئاژانسی و هەواڵییەکانی ناو دەسەڵات ئەدەن بۆ ئەوەی خۆیان بەرنە پێش، تا هەرچی مەنهەجی تر هەیە لە ناوی بەرن خۆیان بکەنە دەمڕاستی موسڵمانان، خۆیان بە سەلەفی دەزانن و ئامادەییان تێدایە لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو ئەو موسڵمانانە بکەن کە خۆیان بە جیهادی دەزانن، هەرچی موسوڵمانێك کە بڕوای بە حاکمییەت هەیە لە سیاسەت و دەسەڵات دا ئەمان بە خەواریج و تەکفیری ناویان دەبن!.

## سەلەفی چییە؟

سەلەف واتا پێشین ئەو ڕەوەندە بەڕێزەیە کە لەدوای پێغەمبەر محمد (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵە بەرێزەکانی ڕەزامەندی خوایان لێبێت، ڕەوەندی دوای ئەوانیش بە گشتی ئەمانە پێیان دەوترێت ڕەوەندی سەلەف.

## لە کوردستان بوونیان هەیە؟

لە کوردستاندا بوونیان هەیە و بە مونەزەمی کار دەکەن؛ هیچ هەوڵێکی سیاسی یان چوونە ناو پۆستەکانیان نییە، زیاتر گرنگیان داوە بە زانستە

شەرعییەکان و زۆرێکیش لە لاوەکان لە دەوریان کۆبونەتەوە، تاڕادەیەکی باش خەڵکی فێری زانستە ئیسلامییەکان دەکەن، هەوڵی زیاتریان گەڕاندنەوەی سیمای ئیسلامییە، بەڵام ناهێڵن بە هیچ شێوەیەك خەڵکی توخنی سیاسەت و حیزبایەتی بکەوێت، هەڵبەت سیاسەت بە مانای ئەمڕۆ خۆیان دەڵێن: ئێمە بڕوامان بە سیاسەتی شەرعی هەیە، پێیان وایە حیزبایەتی لە ناو ئیسلامدابوونی نییە، لە ڕاستیشدا ئەمە کاریگەری نێگەتیڤ دروست دەکات لە سەر خودی موسڵمانان، چونکە ئەو ڕۆحییەتەی بۆ دروست دەکات کە توانای گۆڕانکاری بنەڕەتی نەبێت لەم سەردەمی مەزڵومی موسڵمانانە کە عەلمانیەت فەرمانداریان دەکات.

**بە هۆکاری چی بەرەو پێش دەچن؟**

ئەو کەسەی کە بەشێخ و ڕابەری خۆیانی دەزانن ئاماژەمان بۆ کرد کە ناوی ڕەبیع مەدخەلیە دکتۆرای هەیە، دەڵێن: کاتی خۆی لەگەڵ ئیخوان موسلمین دا بووە، ئێستا سەر قاڵە بە زانستی جەرح و تەعدیل (جەرح واتا ناساندنی لاوازی زانایەکە یان لێسەندنەوەی متمانەیە لە فەرموودەوانێك. تەعدیلیش بەخشینەوەی متمانەیە بە فەرموودەوانێك یان باسکردنی لایەنە چاکەکانی زانایەکە تا لەگەڵ باسکردنیدا بەرچاو نەکەوێت و کەسایەتی لەکەدار نەبێت).

ئەم ڕێگای داوە بە خۆی بە ئارەزووی خۆیان خەڵکی چاك و خراپ وەك ئەوەی لێهاتووە چۆن کاتی خۆی پاپاکان پسوولەی لێخۆشبونیان دەفرۆشت بە ئارەزوو و ویستی خۆیان، ئەمانیش بە ئارەزووی خۆیان بەس جەرح دەکەن.

شیکاری:

لەگەڵ ئەوەی کە ئەمانە خۆیان بانگەشەی دوور بوون لە حیزبایەتی دەکەن، خۆیان تا سەر ئیسقان حیزبی ( لا حیزبین ) و هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی بچنە دەسەڵات لە ڕێگای خۆ نزیککردنەوەیان لە دەسەڵات، یارمەتیدانی دەسەڵات لە ڕووی کاری موخابەراتیەوە.

ئەم مەدخەلیانە کە ناوی خۆیان ناوە سەلەفی، ئەمە تەنها بۆ چەواشەکردنی خەڵکی یە، چونکە سەلەفیەت مەنهەجە یاخود بڵێین ئەو ڕەوندە بوون کە لەسەر مەنهەجی خوا و پێغەمبەر بوون نەك پاشکۆی ناو بێت بۆ کۆمەڵ و گروپێك، بەڵام دەکرێت بۆ وەسفی کەسێکی باش کەسێکی تر پێ بڵێت کەوا سەلەفییە نەك خۆی ئەو ناوە بۆ خۆی دابتاشێت، خەڵکانی تر بە گومڕا و بیدعەچی بزانێت، هەر وەك چۆن زانایانی کۆن خەڵکیان پێ پێوەر کردووە بەو مەنهەجە نەك پاشکۆی ناوبێت، ئەمان کە خۆیان ناو ناوە سەلەفیەت ئەمەش خۆی بۆ خۆی جیاکردنەوەیانە و کاری ڕێکخراوەییانە، چونکە وەك گروپەکانی تر هەر یەکە ناوێکیان هەیە، ئەمان خاوەنی ناوی سەلەفی مەدخەلیەکانن لە ڕاستیدا..

بە هەمان شێوە سەید قوتب بە گومڕا و سەر لێشێواو دەزانن لەسەر ئەوەی کە تەنها باس لە حاکمیەت دەکات، پێیان وایە تیۆری تەکفیری لەسەر دەستی ئەم کەڵە پیاوە داهاتووە.

بە نیسبەت شێخەکەیانەوە ئێستا هیچ ئاماژەیەکی بۆ ناکرێت وەك ئەوەی کە زانا بێت، چونکە دەرکەوتوە کە پێشتر لەگەڵ ئیخوان موسلمین بووە پاشتر تەجمید کراوە، لە کاردانەوەی ئەوە ئەم گروپەی دروست کردووە لە بەر هۆکاری ئەوەی کە زۆربەی مەجلیسی زاناکانی تر خەڵکی

لێکۆبۆتەوە لای ڕەبیع مەدخەلی کەمترین کەس بووە، ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی کە ئەو بارە دەروونییەی بۆ دروست بێت.

زانایانی ئێستا زۆربەیان ئەم پیاوە بە جاهیل لە قەڵەم ئەدەن، چونکە دوای ویست و ئارەزووەکانی خۆی کەوتووە، لێرەدا نمونەی زانایەکی ناوداری ئیسلام و سەردەمتان بۆ دەهێنمەوە کە چۆن فتوای داوە لەسەر کارەکانی ئەم پیاوە...

فەتوایەکی شێخ ئیبن جیبرین لەمەڕ شێخ ڕەبیع ئەلمەدخەلی!

بەڕێزان! ئەمە فەتوایەکی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی جیبرینە کە لەمەڕ شێخ ڕەبیعی کوڕی هادی ئەلمەدخەلییەوە دەریکردووە، کە ئایا لە جەرح و تەعدیلدا قسەی قبووڵە یان نا، زانراویشە کە شێخ ئیبن جیبرین هەر لە سەردەمی شێخ ئیبن باز و ئیبن عوثەیمیندا لە دوای ئەوانەوە بوو، جگە لەو دووانە؛ لە زانست و مەنهەج ڕێکیدا کەسی دیکەی لە پێشەوە نەبوو، لە نێو زانایان و زانستخوازانی عەرەبستانی سعوودییەدا.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده.

فەرموون ئێوە و وەرگێڕاوی دەقی فەتواکە:

فەتوای ژمارە:١١٠٨

بابەتی فەتوا: جەرح* و تەعدیل** و شێخ ڕەبیع بن هادی ئەلمەدخەلی.

پرسیارەکە: پ: زانراوە کە شێخ ڕەبیع بن هادی ئەلمەدخەلی شێخی جەرح و تەعدیلە، وە گوێبیستی شریتێکی بووم بە ناونیشانی «هەڵوێستی ئەهلی

سوننەت لە بیدعەت» لەو شریتەدا لە بارەی شێخ عەدنان عەرعوورەوە ئاگاداریی داوە (کە ئەهلی بیدعەتە)، ئیدی ئەم کارەی هەرایەکی نایەوە لێرە لای ئێمە لە جەزائیر، جا لێدوانی بەڕێزتان چییە لەسەر ئەمە ئەی شێخی بەڕێز؟

وەڵام:

ڕەبیع ئەلمەدخەلی لە جەرح و تەعدیلدا قسەی وەرگیراو نییە، لە کتێبەکانیدا هەڵەی وای هەیە ؛ کە بەڵگەن لەسەر جەهلی ئەو یان خۆگێلکردنی لەو قسانەی کە دەیانکات!!! هەندێك دانراوی هەن کە توانج و تەشەری تێدا گرتووەتە بانگەوازکاران و زانایانی بەناوبانگ، لەوانە عەدنان عەرعوور کە لە زانایانی ئەهلی سوننەتە و خێر نەبێت چی دیکەی لێوە نازانین، تەزکییەی پەنهانیی هیچ کەسیش ناکەین لە لای خودا، ئەهلی عیلم ئەوەیان باسکردووە کە دروست نییە توانج و تەشەری خەڵکانی هاوسەردەم لە حەقی یەکتریدا قبووڵ بکرێت، ئەگەر ڕکەبەرییان لە نێواندا بوو، وەك ئەوەی کە لە نێوان ئیبن ئیسحاق و مالیکی کوڕی ئەنەس و لە نێوان ئیبن حەجەر و عەینی و هەروەها لە نێوان سەخاوی و سیوتی و هی وەك ئەواندا هەبووە، ئەوە قسەیان لە حەقی یەکتری وەرناگیرێت، پێویستە لەسەرمان کە هەوڵی چاکسازی بدەین لە نێوانیاندا، هەر خوداش تۆفیقبەخشە، وە خودا زاناترە.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان ئەلجیبرین ( ئەم فتوایە لە دەنگی ئیسلام وەرگیراوە)

ماوەتەوە بڵێین کە ئەم گروپە نارێکخراوە بانگەشەکانی کە دەیکات بۆ ئەوەی حیزبایەتی نەکرێت، خۆیان ئەوپەڕی حیزبین ئەگەر وایە دەسەڵاتداران بە وەلی ئەمر دەزانن، بۆ قسە لەسەر حیزبەکانی ئەوان ناکەن؟

## عەلمـانیەت بناسـە

لەو کاتەی کە بێ دینەکان بە گشتی و چەپەکان بەتایبەتی لەهەوڵدان بۆ هێنانەکایەی بیری سیکۆلاریزم ( عەلمانیەت SECULARISM) زۆر بەگەرمیش هەوڵ بۆ سڕینەوەی ناسنامەی موسڵمانیی گەلی کورد دەدەن.. کەچی بەداخەوە گێلەجاهیلانی ئێمەیش دەڵێن باشە با دین لەدەوڵەت جیابێتەوە، نازانن ئەم وشەیە بەپێوەرەکانی دین و دەقەکانی قورئان و سوونەت کوفرە و هەر کەس باوەڕی وا بێت کافر دەبێت و لەئیسلام دەردەچێت!!..

سەرەتا دەمەوێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە پێناسەی ئەم بیرە چییە و هۆکاری دروست بوونی چییە؟ چۆن پێگەیشتوە و سەری هەڵداوە و بۆ هاتووە؟ لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ لەدژی کێ کاری بۆ کراوە؟ کێن ئەوانەی کە کاریان بۆ کردووە؟ لەدژی کام ئایین و چۆن هاتۆتە ناو وڵاتی موسوڵمانانەوە و چۆن دەیەوێت خۆی فەرز بکات ؟

کەواتە لەسەرەتاوە با پێناسەی سیکۆلار بکەین..

**سیکۆلار** : بریتییە لەبێدینی و دنیاویستی، بانگەوازە بۆ دامەزراندنی ژیان لەسەر بنەمای هزر.. ئەمە پێناسەیەکی گشتیە.

لەڕووی سیاسییەوە بریتییە: لەجیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت واتا هیچ یاسا و ڕێسایەك بۆ سیستەمی ژیان لەدین وەرناگیرێت.

سەرهەڵدانی ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆنگرەی مەسیحیەوانی شاری نیقیەی ئیتالیا ( مجمع نیقیەم ) بەڵام سەرهەڵدانی لە ئەوروپا لە

سەدەی حەڤدەوە و لە ڕۆژهەڵات لەسەدەی نۆزدەوە دەستی پێ کرد، سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ ئەوەی کە ئەم بیرە زادەی بیرێکە یان ڕەوتێکە لەپاشکۆی فکرێك بۆ جیهان تا دین لەدەوڵەت جیا بکاتەوە. ئەمە ڕێڕەوێکە بۆ ناسینی سیکۆلاریزم.

پێگەیشتنی ئەم بیرەو سەرهەڵدانی سیکۆلار لەسەردەمی قۆسطنطەنیەوە دەستی پێکردووە یان کۆمەڵەی نیقیە کە لەسەر بنەمای ئەو دەستەواژە دەستی پێکردوە، کە دەڵێت: اعط ما لقیصر لقیصر و ما لله لله) واتە: ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر و ئەوی هی خوایە بیدە بە خوا.

بەڵام ئێمە لەدوای سەرهەڵدانی سەردەمی لەدایکبوونی(ڕێنسانس) باسی دەکەین، زیاتر درێژی ناکەینەوە بۆ ئەوەی بە هەندێك باسی باوەڕەوە، لا ڕێمان نەبین..

ڕێنسانس لەدوای شۆڕشی فەرنساوە دەستی پێکرد کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوەبۆ (١٧٨١)زایینی کە بە یەکەم دەوڵەتی سیکۆلاریزم واتا لادینی دادەنرێت.

ئەمە وەك میژوو، بەڵام با بزانین کێ لەم زەمەنەدا زادەی ئەم بیرەبوون؟

ئەوکەسانەی کەدەستیان لەم بیرەدا هەبووەو بنەمای فکری و فەلسەفیان بۆ داڕشتوە زۆرن، بەڵام بەناوبانگ و پێشەنگەکانی بریتین لە:

- جان جاك ڕۆسۆ : لەساڵی ( ١٧٨٧ )زایینی کتێبێکی نوسی بەناوی (گریبەستی کۆمەڵایەتی ) کە بە عەرەبی کراوە بە( العقد الاجتماعي).

- مۆنتسکۆ: ئەویش ئەو سەردەمە کەڕاڤەی فیکری سیکۆلار بوو کتێبێکی بەناوی (ڕۆحی یاسا) نووسی کەبەعەرەبی پێی دەوترێت: ( ڕوح القوانیین).

- سبینوزا: ئەمە بەڕەچەڵەك جووە، بەڵام لەجیهانی سیکۆلاردا بەپێشەوا دەژمێرریت، لەڕاستیدا یەکێك بوو لەوانەی کە ئەم بیرەی لە یاسادا دارشت ئەمیش کتێبی نووسیوە وەکو ( الحیاة والسلوك ) و (ڕسالة فی اللاهوت).

- ڤۆڵتێر: ئەمیش یەکێکە لە ڕابەرانی ئەم بیرە کە کتێبی ( یاسای سروشت) ی نووسی کە لەڕووی سیاسییەوە خاوەنی ئەو یاسا سروشتیە ئەقلانیەیە کە بانگێشەی بۆ دەکرا.

- کانت: بە خاوەن مەنهەجێکی ئەم بیرە دادەنرێت یان بڵێین خاوەنی مەنەفێستی تایبەتی خۆیەتی کە لەساڵی (١٨٠٤)زاینی دا بەناوی ( ئایینی کانت لەسنووری هزردا )ی نووسی.

- ولیەم جودین: سەرهەنگی زانایانی ئەم بیرەیە کەلەساڵی (١٧٩٣)زاینی دوو کتێبی نووسی بەناوی ( دادپەروەری لە ڕامیاریدا ) و بانگەواز بۆ بێدینی یان ( جودایی دین لەدەوڵەت ) کرد.

- تیۆری پێشکەوتن ( نظریةالتطور ) بۆ زیاتر پشتگیری لەم فیکرە خۆی نواند، ئەوەبوو کە( داروین ) لەساڵی ( ١٨٥٩ ) زایینی دا کتێبێکی بەناوی (اصل الانواع) نووسی.

- نیچەیان نیتشە: بانگەوازی ئەو فەلسەفەی کرد کە گوایە خوا مردووە و مرۆڤ بەرز دەبێتەوە.

- دوورکایم: کە ئەمیش جووە و پێی وایە بەرپرسێتی ناکەوێتە سەر تاکی کۆمەڵگە( وەك فەلسەفەیەکی بەرەڵایی بوو بۆ بەپیرۆز نەهێشتن و تێکشکاندنی بنەما دینییەکان ).

- فرۆید: كە لەسەر بنەمای سێكس دیدی خۆی ناساند كە گوایە پاڵنەری سێكسی بەهێزترین پاڵنەری ناكۆكییەكانە.

- كارڵ ماركس: خاوەنی ڕاڤەی مێژووی مادەیە و بڕوای بەگۆڕانكاری حەتمییە و ئەوە كەدەڵێت: (دین تریاكی گەلانە).

- جان پۆڵ سارتەر: بانگەوازی بۆ بێباوەڕی وجودیەت كرد.

بەگشتی ئەمە ئەو بیرمهندانە بوون كە لەسەدەكانی پێشوودا لە ئەوروپا بوون و هەوڵیان بۆ پیادەكردنی سیكولار دا، ئەو سیكۆلارەی ئێستا لە ئەوروپا كاری پێ دەكرێت كە دەخوازرێت ئەم بیرە لە وڵاتانی ئیسلامیشدا بچەسپێنرێت.

ئەوەی كە گرنگە ئاماژەی بۆ بكەین ئەوەیە كە ئەم بیرلە وڵاتانی ڕۆژهەڵات زۆر نامۆیە و هیچ بە ژینگەكەی ئاشنا نییە بۆیە هەرگیز بڕوام نیە بچەسپێت چونكە زادەی بیرێكە كە لە جێگا و كاتی تایبەتی خۆیدا لە بەرانبەر ئایینی مەسیحی هاتە ناو كایەی ڕامیاری.

لە فكریشدا هەر وایە، كاتێك دەتەوێت بیرێك بڵاو بكەیتەوە دەبێت پێشتر خوێندنەوەیەكت بۆ ناسینی كۆمەڵگاكەی هەبێت ئەم بیرە لە وڵاتانی ئیسلامیدا وەك داری توو وایە كە هەرگیزاو هەرگیز ناتوانیت لە وڵاتێكی وەك نەرویج یان سوید بیڕوێنیت، لەبەر ئەوەی بە ئاو و هەواكەی نامۆیە و هەرگیز بەر ناگرێت.. وە ئەو هاوكێشە كە سیكۆلارەكان لە بەرانبەر ئیسلامدا بەكاری دێنن، بەچاوی ئایینی مەسیحی سەیری دەكەن، ئەوەندەی تر خۆیان دەخەنە ناو گێژاوی فكر و دەرباز بوونیان زۆر ئەستەمە، لەبەر ئەوە وا تێگەیشتون كە(١+١=٢) یەك كۆ یەك دەكاتە

دوو لەڕاستیدا لە بنەمای بیرکاریدا وایە، بەڵام لا بنەمای فکریدا ئەمە ئەستەمە چونکە یەك پرتەقاڵ و یەك سێو ناکەنە دوو پرتەقاڵ یان دوو سێو لە بەر ئەمەیە بیرەکە لە جێگای خۆیدا وەك خۆی دەمێنێتەوە لەوانەیە لە شوێنی خۆی سەرکەوتوو بووبێت بەڵام لە ژینگەیەکی تردا سەرکەوتنی مەرج نیە بێتەدەست.

با بزانین هاتنەکایەی بیری سیکۆلاریزم لە ڕۆژهەڵات لەسەر دەستی کێ بوو لە کوێوەدەستی پێکرد ؟.

هاتنەکایەی لەڕۆژهەڵات لەساڵی (١٨٨٣) زایینی دا لەسەر دەستی (خدێوی ئیسماعیل) بوو، ئەم پیاوە عەشقی غەرب بوو دەیویست میسر بکاتە ئەورپای سەردەم ! ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەمە لەسەردەمی هێرشی ( ناپلیۆن) دا بوو بۆ میسر کە هۆکاری سەرەکی هاتنی (عەلمانیەت) بوو.

لە هندستان لەساڵی (١٧٩١)زایینی بوو.

لە جەزائیر لە ساڵی (١٨٣٠)زایینی دا و(١٩٠٦)زایینی دا لە تونس و مەغریب دەستی پێکرد.

لە دوای ڕوخاندنی سوڵتانی عوسمانی یان خەلافەتی ئیسلامی لەتورکیا لەسەر دەستی (مصطفی کمال ئەتاتورك) بوو بەسیستەمی ڕەسمی وڵات!!

پاشان هەر لەسەدەی بیستدا لە وڵاتانی عێراق و ئێران و لوبنان و وڵاتانی تری ئیسلامی دەستی پێکرد.

ئەو کەسانەی لەم وڵاتانەدا کاریان بۆ کرد ناسراوترینیان بریتی بوون:

لە میسر : احمد لوطفي سید، ئیسماعیل مظهر، قاسم امین، طه حسین، عبدالعزیز فهمی، ئینجا دەیانی تری وەك د: فواد زکریا و فرج فودە.

ئەو ڕێیانەی ئەم بیرە گرتیە بەر

**یەکەم:** نەهێشتنی پیاوانی دینی.

**دووەم:** ڕێگا گرتن لە زانست.

**سێیەم:** کوشتن و زیندانی کردنی زانا ودانشمەندەکان و بیرمەندەکان و فەیلەسوفە بەرهەڵستکارەکان.

**چوارەم:** بەزۆر فەرزکردنی وەکو سیستەمی وڵاتان.

ئەمانە بووە هۆی ئەوەی کە ئەم بیرە لە وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی کڵێسا و قەیسەرەکان و بەگزادەکاندا زووتر سەرهەڵبدات..

بەڵام کەسەرنج دەدەیتە بارودۆخی وڵاتی موسوڵمانان دەبینیت ئەم بیرە سەرکەوتوو نابێت، چونکە دیدی پیاوانی وڵاتی موسوڵمانان وەکو دیدی پیاوانی دینی مەسیحێتی نەبوون و نین.. پیاوانی دینی مەسیحی بە ناوی خۆیانەوە یاساو ڕێسایان دەردەکرد تا وای لێهاتبوو بەهەشت و دۆزەخیان بە مەتر دەفرۆشت و سەروەت و سامانی خەڵکیان داگیر دەکرد، لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە پیاوانی دینی پیرۆزیان دەدا بەدەسەڵاتی قەیسەرەکان و تا خەڵکی دەستەوەسان بن لەبەردەمیاندا! بەڵام لە ئیسلامدا لە هیچ زەمەنێکدا پێشەوایانی ئیسلام پیرۆزیان نەداوە بە دەسەڵاتداری ستەمکار و هەمیشە شەڕیان بووە لە سەر مافەکانی خەڵکی بە هەزاران نمونەمان هەیە. کەوا بوو لە وڵاتی موسوڵماناندا سیکۆلارەکان بەهانەی یەکەمیان دەست ناکەوێت.. بۆیە بە زۆر دەیچەسپێنن..

سەرتای دابەزینی ئایەتی قورئانی پیرۆز بە زانست دهست پێدەکات، هەرگیز لە ئایینی ئیسلامدا دەقێك نەبووە و نییە کە زانستێك ڕەت بکاتەوە

كە بەزانستیانە سەلمێنرا بێت نەك خەڵكێك ناوی زانستی لێ بنێت.. ئیسلام هەمێشە پشتگیری زانست و هەموو فەرهەنگە زانستیەكانی تر بووە لە مێژووی چواردە سەدەی ئیسلامدا ئەوە دیارە و كەس ناتوانێت نكوڵی لێ بكات، بە هەزاران دانیشمەند و فەیلەسوفی بەرهەم هێناوە، نمونەكانی دیارن.

ئیسلام هەرگیز كەسێكی ئازار نەداوە خاوەنی داهێنان بووبێت، هەمیشە لە بەیتولمالی موسڵمانان یارمەتی دراون، كار ئاسانیان بۆ كراوە، ئەوەش هۆی ئەوەیە كە مێژووی ئیسلام خاوەنی چەندین زانكۆ بووە چەندین زانستی پزیشكی و ئەندازیاریی و جەبر و فیزیا و كیمیا و ماتماتیكی تێدا خوێندراوە تا ئێستاش لە وڵاتانی جیهاندا وەك بیردۆز دەخوێندرێنەوە، ئەمەش جێگای شانازی موسوڵمانانە. كەچی لە ڕۆژئاوا كەسێكی وەك (گرادانۆ) كەلەساڵی(١٦٤٢) زایینی دا تلسكۆبی دروست كرد بە دەستی كلێسا كوژرا ! نمونەی وا زۆرن خوێنەرانیش كەم تا زۆر ئاگاداری ئەوەن كە ئیسلام لەمێژووی خۆیدا داهێنەرێكی نەكوشتوە بەڵكو دەستگیرۆی خەڵكانی بێباوەڕی كردووە بۆ داهێنانی زانست.

زۆر جار نمونەی (حەلاج) دەهێننەوە گوایە ئەوە نیە ئیسلام زانایانی كوشتوە لەڕاستیدا (حەلاج) كەسێكی داهێنەر نەبوو بەڵكو دەیوسیت دەستكاری بیر و باوەڕی ئیسلامی بكات، لە كاتێكدا دادگاكەی زیاد لەحەوت ساڵی خایاند و چەندین مەزهەب لەسەر كوشتنی كۆك بوون، هۆكارەكەی زانست نەبوو بەڵكو لادان بوو لە بابەتەئیمانییەكان كە هەموو موسەڵمانان لەسەری ڕێكەوتبوون !! ئەمە جگە لە تۆمەتبار كردنی بەجاسوسی كردن بۆ شۆڕشی یاخیانی زنج لە بەسرە..

کەواتە ئەو ڕێگایانەی سیکۆلار بۆ سەرخستنی بیرەکەی خۆی دەتوانێت بیگرێتەبەر و بەئومێدە کاریگەری هەبێت، هیچیان لەسەر ئێمە دروست نابن. چونکە تێڕوانینی فیکری ئیسلامی ئێمەی موسوڵمان بەهەموو پێوەرێك لە تێروانینی فیکری ئایینی مەسیحییەکان جیاوازی هەیە و ناکەونەتای یەك تەرازوو.

## جۆرەکانی سیکۆلاریزم ( عەلمانیەت )

دوو جۆر سیکۆلاریزم هەیە:

**یەکەم:** سیکۆلاریزمی ڕێژەیی وەك ئەوەی ئەورپا و ئەمریکا کە ئازادی لە کونجی مزگەوتێکدا خواپەرستی بکە، بەڵام کە بوویت بە زۆرینە لەسەرت دەدەین و تەنانەت دروشمە سادەکانتان پێشێل دەکەین وەك فەرەنسا چۆن سەرپۆشی قەدەغەکرد لە زانکۆدا، کە سەرەتایترین مافی مرۆڤە، ئەوەیە کە مرۆڤ چی حەز پێبکات بیپۆشێت، بەڵام کە سیمای ئیسلام پیشان بدات، بێگومان دەبێت قەدەغە بکرێت بانێکە چی و دوو هەوا !

**دووەم:** سیکۆلاریزمی توندڕەوی شیوعیی یان کۆمەنیستیی: وەك ئەوەی سۆڤیەتی کۆن، کە موسوڵمان نویژیان دەکرد دەبوو باج بدەن! چونکە ئایین بە هەموو شێوەیەك قەدەغە بوو!

تێبینی: لەڕاستیدا دەڵێن با هەموو بیروبۆچوونێك ئازاد بێت بەڵام لە بەرانبەر ئیسلامدا ئەو جورئەتە ناکەن! دەیانەوێت ئیسلام لە سیاسەت و دەسەڵات پەراوێز بکەن لە کاتێکدا توانای بەڕێوەبردنی حوکمڕانی هەزار ساڵی هەبووە، لەسەرەتای هاتنیەوە بۆ ساتێك لە دەسەڵات دانەبڕاوە گەر بەناویش بووبێت، هەر فەرمانڕەوایی خۆی کردووە کەم تا زۆر، گروپ

و مەداریسی فیکر و مەزهەب لە سەر بنەمای ئایینی ئیسلام دروست بوون و ئێستاش پارت و گروپ و کۆمەڵکاری تر هەن کە هەر ڕوو لە زیاد بوونن وێڕای ئەو هەموو هێزە کەدوژمنان دژی ئیسلام بەکاری دێنن ئەو هەموو ناو ناتۆرەی کە بۆ دروست دەکەن ڕۆژ بەڕۆژ لە برەودایە لە هەموو هەواڵ و ئاژانسەکاندا باسی ئیسلام هەر یەکەمە و موسوڵمانان چۆن چالاکی دەکەن.

کەواتە وازمان لێ بێنن با کاری سیاسی خۆمان ئەنجام بدەین یان لەوە دەترسن کە لەوان باشتر بین؟ چونکە ئەگەر هزر و ئەقڵ نەما ئەو کات بە چەك دێنە پێشەوە کەواتە بەهەموو پێوەرێك ئێوە دۆڕاون، ئەوەی کە بۆ خۆتان ڕەوایە بۆ مۆسڵمانانی بەڕەوا ببینن ئیمەی موسوڵمانان بێشك تەنها مزگەوتەکانی خۆمانمان بەسە بۆ کاری سیاسی، دەتوانین لە مینبەرەوە دەسەڵات بگرینەدەست! لەوانەیە بڵێن با مزگەوت نەبێتە جێگای سیاسی، لە کاتێکدا کە یەکەم کاری پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لێ بێت دروست کردنی مزگەوت بوو بۆ کاری سیاسی، تا دەسەڵاتی موسڵمانانی پێ ڕێکبخات و کردیشی.. لەو مزگەوتەوە توانی گەورەترین دەسەڵاتی ئیسلام دروست بکات تا ئێستا لێرە و لەوێ هەر کاری خۆی دەکات..

لەوانەیە بپرسن خۆ ئایینی مەسیحی کەم تا زۆر دەسەڵاتی هەبوو.؟ ئەمە وا نییە! لەڕاستیدا ئایینی مەسیحی خۆی حوکمی نەکردووە بەڵکو پیرۆزی داوە بە دەسەڵاتی سەردەم، بۆیە رۆژئاواییەکان کە ئایینیان پەراوێز کرد بۆ ئەوەیان بوو کە لەپیرۆزی دەسەڵاتی قەیسەر و بەگزادە نەجاتیان بێت.

بەڵام ئیسلام خۆی خاوەنی حوکم و یاساو ڕێسای تایبەت بەخۆیەتی، لە هیچ بەرنامەیەکی سەر زەوی ناچێت، قسەی لە سەر هەموو چالاکییەکانی تاك و کۆی کۆمەڵگە کردووە و ئاراستەکانیشی هەر لە مزگەوتەوە سەرچاوەی گرتووە.. چونکە مزگەوتَ لە ڕاسیدا جێگای پەرلەمانی موسوڵمانانە.. هەر لەوێوە هەموو یاساکان بەویستی خوا دەردەچن نەك بەئارەزووی خەڵکی سەرخۆش وشەڕواڵ پیس..

ئەوانەی کە دەڵێن با دین لە دەوڵەت جیابێتەوە خۆیان مزگەوتەکان بۆ مەرامی گڵاوی خۆیان یان بۆ پڕوپاگەندەی حزبی خۆیان بەکار دێنن!!

## خۆ سەپاندن وپاساوی سیکۆلاریزم ( عەلمانیەت )

ئەو پاساوانەی سیکۆلار دەیەوێت خۆی پێ بسەلمێنێت ئەوەیە:

**یەکەم:** دەڵێن سەردەم زەمانی پێشکەوتن و زانستە و باوی دین وسرووش نەماوە.

**دووەم:** دەڵێن ئایین نەگۆڕە و دەبێت وازی لێ بهێنرێت تا ژیان بەرەو پێش بڕوات.

**سێیەم** : دەڵێن تەنها سیکۆلاریزم هاندانە بۆ پێشکەوتنی ڕەهایی!

بۆ وەڵام دانەوەی ئەم خۆسەپاندنەی سیکۆلارەکان وتمان هەرگیز ئیسلام ڕێگا لە پێشکەوتن ناگریت، لە هەمان کات دا سەیری چەمکە قورئانییەکان بکەین هەرگیزا و هەرگیز خۆی لە ئەفسانە و خورافاتدانابینێتەوە، چونکە باس کردنە لەناخی مرۆڤ، هاندانی مرۆڤە و دوور خستنەوەیانە لە هەموو خورافاتێك ئەمەیشی پراکتیزە کردووە، لەسەردەمی هاتنیەوە خەڵکی فێرکردووە کەواز لە شتی پڕوپوچ بێنن.

کە دەڵێن ئیسلام ناگۆڕێت و بنەماکانی وەك خۆی وایە ئەمیش لە ڕاستیدا وانییە.. ئەحکامی ئیسلام لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر گۆڕاوە، ڕاستە وەك بیروباوەڕ نەگۆڕە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە بنەمای فیقهی نەگۆڕە، نا چونکە شەرع بە گوێرەی ژینگە و کۆمەڵگاکە دەگۆڕا، ئێستاش وایە.. بۆ نمونە ئیمامی‌شافعی لەبەغداد بۆچوونێکی فیقهی پیادە کردووە لە میسر شێوەیەکی تر..

سیکۆلار لەم خاڵەیدا هەر هەگبەی زۆر بەتاڵە.

بۆ خاڵی کۆتایی ڕەهابوون، بێگومان لە ئیسلامدا ڕەهایی شتێك نییە سنووری نەبێت، شتی وا لای ئیسلامدا دەست ناکەوێت، تا کومەڵگا بەرەو وێرانی نەڕوات و ناکازاکی و هێرۆشیمایەکی تر دروست نەبێتەوە..!

## شەیتان پەرستەکان بناسە

ئەم گروپە لە لایەن کەسێکەوە دامەزراوە بەناوی کراولی ولیەم پالتث؛ خەڵکی بەریتانیایە..کراولی ولیەم بە موفەکیر و پێشەنگی ئەم گروپە دادەنرێت؛ پیاوێکی سروشت شاز بوو، شووی کرد بە پیاوێکی تر بەناوی» ئالم پێنکس» کە بەیەکەوە هەرچی کاری خراپە بوو دەیانکرد لە ئیتالیا لەبەر چاوی خەڵکی لە دوورگەی سیسلیا کاری نەشیاو و شازیان دەکرد بە ئاشکرا..تا حکومەتی ئیتاڵیا بەفەرمی لە وڵاتەکەی دەریکردن و دوایی چوونە بیابانی جەزائیر گوایە لەوێ.. وتیان: لەگەڵ شەیتان قسە دەکەن و بیرێکی نوێیان دامەزراند هەردووکیان بەیەکەوە واتا ( کراولی ولیەم و ئالم)بە ناوی خاچی خونچە گوڵ.. هەرسێکیان وتیان خوا مانای نیە دەبێت ئێمە شەیتان بپەرستین ئەوەی لاشەمان پێی خۆشە بیکەین، چونکە ئەیانگووت خراپەکار و شەڕخوازی ئیتر دەست پێدەکات ئێمە تۆ دەپەرستین شەیتان بۆ ئەوەی بە خلودی بمێنینەوە.. ئەمە بنەما فەلسەفییەکەیان بوو.. گوایە شەیتان شەڕانگێز و خراپەکارە ڕێزی لێدەگرن بۆ ئەوەی لەشەڕ و خراپەکاری شەیتان دووربن..!

ئینجا کراولی لە فرەنسا لە ناو شووشەی عارەقی ئەو کەسانەی کە مادەی هۆشبەریان دەخوارد مرد، لەسەر شەقامەکانی فەرەنسا لە دوای خۆی نووسیبووی تا دەتوانن مەشروب بخۆنەوە تا دەتوانن هێرۆین بەکاربێنن بۆ ئەوەی لە شەیتان نزیك بنەوە..!

لە دوای ئەوان کەسێك بە ناوی «ئەنطۆان لیڤی» کە جولەکەیە خەڵکی ئیسرائیلە، بەڵام ئیسرائیل دەریکرد و لە ئەمریکا دەژی، لە ساڵی ١٩٩٩ بە

ڕەسمی کەنیسەی شەیتانی بۆ کرایەوە لە ئەمریکا، پاشان چەند کتێبێکی نووسیوە لەوانەی کە کراون بە عەرەبی و زمانی فارسی و بەشێکیش کوردی..

**یەکەم:** کش شەیتان.

**دووەم:** توقوصاتی شەیتان.

**سێیەم:** حەشری شەیتان.

**چوارەم:** یاداشتەکانی شەیتان..

زۆریك لەم بیرو بۆچوونانە کە بەداخەوە.. ئێستا لە هەولێر و سلێمانی و کەلار ئەمانە وجودیان هەیە..

- لە سابونکەران لە سلێمانی زیاد لە ٢٠ لاوی کوڕ گیراون لە ماڵێکدا کە هەموو بەیەکەوە کاری سێکسیان کردووە هەمووشیان کوڕن..!

- لە هەولێر بە ئاشکرا هەن و لە هەفتەنامەی باس دا چاوپێکەوتن و ڕاپۆرتیان لەسەر کرابوو.. لە ناوچەکانی تر لە شێوەی گروپ و ڕێکخراودا دەردەکەون..

- لە کۆتایدا ئەو کەسانەی کە دەچنە ناو ئەم گروپەوە دەبێت خۆیان بکوژن یاخود شێت بن..

**هەندێك زانیاری لەسەر ئەم گروپی شەیتان پەرستانە لە جیهاندا:**

ئەمانە تەنانەت لە ناو شاری مەککەی پیرۆزدا هەن، لە یەکێك لە کۆڵانەکانی شاری مەککە من ئاڕمەکەیانم بینیوە لەسەر دیوار بۆیەخ کراوە.. کە ئەستێرەیەکی پێنج چوکڵەیە و بۆ خوارەوە شۆڕە و پێچەوانەی ئەستێرەکەی داود..

- بارەگای سەرەکیان لە ئەمریکایە و پاشان ئیسرائیل و ئینجا وڵاتی میسر.. لە ئەوروپادا زۆرن بەڵام پۆلیس چاودێریان دەکات، لەڕاستیشدا کۆنترۆڵ ناکرێن..

ڕۆژێکیان هەیە لە هـــاویندا هەموو بە کاری شـــاز و ئـــاشکرا و قیزەونەکانیان دێنە دەرەوە..

- ئەوی هاوکاریان دەکات ڕیکخراوی ماسۆنیەتە..

- ئەمانە ژمارە سفریان زۆر لا پیرۆزە..

- هەموویان گۆرانیەکیان لەبەرە بە ناوی ڕێگای فراوانی دۆزەخ..

- لە کاتی عیبادەتیاندا بۆ شەیتان ئافرەتێکیان بە ڕووتی خۆی خوێناوی دەکات و دەست ئەدات لە پێشی پیاو و ژنان، بۆ پیرۆزی بەندایەتیەکەیان، گوایە شەیتان ئەمەی پێ پیرۆزە.

- مۆسیقایەکیان هەیە بەناوی ڕێگا بەرەو بەهەشت کە دەبێت وەك موناجات و قورئانی موسڵمان و ئینجیلی مەسیح و تەوراتی جولەکە گوێ لێبگرن ڕۆژانە..

- دەبێت تەنها گوێ لەیەك تیپی موسقا بگرن ئەویش ناوی ڕۆکی «لیدز بینغن“

- باشترین گۆرانی بێژیان کە دەبێت گوێ لێبگرن ناوی»ڕۆڵین ستونە» هەر گۆرانییەکەی قسە وتنە بەخوا و بەرز ڕاگرتی شەیتانە و فێرکردنی ئەو خەڵکەیە بە خۆویستی و ئەنانیەت.

جۆری مۆسیقاکان سێ جۆره که پزیشکه‌کان ده‌ڵێن ئه‌م جۆری مۆسیقایه کارده‌کاته سه‌ر دڵ و مێشکی مرۆڤ، وای لێده‌کات که خۆی بکوژێت بێ ئه‌وه‌ی بترسیت،

ناویان بریتیه له‌..

**یه‌که‌م:** مه‌عده‌نی ڕه‌ش به‌ئینگلیزی پێیده‌وه‌ترێت( بلاك میتڵ).

**دووه‌م:** مه‌عده‌نی ڕه‌ق به ئینگلیزی پێیده‌وترێت(هارد میتڵ).

**سێیه‌م:** مه‌عده‌نی مردن به‌ئینگلیزی پێیده‌وترێت(ده‌ێث میتڵ).

- دژی هه‌موو جۆره ئایینێکن..

- ده‌مو چاوی خۆیان وه‌ك شه‌یتان نیشان ئه‌ده‌ن و جۆرێك له به‌ندایه‌تیان ئه‌وه‌یه که ده‌بێت خاڵ بکوتن له‌سه‌ر شان و ده‌ست و ده‌م و چاویان ئه‌و خاڵه له ئه‌ده‌بیاتی شه‌یتانپه‌رسته‌کان پێیده‌وترێت «تاتو».

- ئه‌و که‌سه‌ی که ده‌یه‌وێت زیاتر له شه‌یتان نزیك بێته‌وه‌، ده‌بێت هه‌موو جۆره مه‌ی و مه‌شروب و ماده‌ی هۆشبه‌ر بخوات و بخواته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی زۆر مه‌ست بێت تا له شه‌یتان نزیك بێت، پاشان خوێنی یه‌کتر ده‌خۆنه‌وه‌.. هه‌موو جۆره سێکسێك ده‌که‌ن به پیاو و ژن و گه‌نجیان... پیاو، له‌گه‌ڵ پیاو ژن له‌گه‌ڵ ژن هیچ جۆره قه‌ده‌غه‌کراوێك نیه‌، هه‌موو کارێکی نه‌شیاو ده‌که‌ن، به کۆمه‌ڵ ده‌یکه‌ن پێیان وایه شه‌یتان ئه‌و کاره‌ی پیرۆز کردوه‌.. له که‌ناری ده‌ریاکاندا ئه‌و کارده‌که‌ن.

- ئافره‌تیان که سکی پڕ ده‌بێت له پێنج مانگیدا، سکه‌که‌ی پێ له‌بارده‌بن ده‌بێت خۆی له خوێنه‌که‌ی بخواته‌وه‌..

- منداڵ سەر دەبڕن گۆشتەکەی دەخۆن دەیکەنە قوربانی بۆ شەیتان بەدەستی دایکی خۆی..

- هەوڵی زۆریان بۆ فێربوونی سیحرە و جادووە.

- خاوەنی زیاد لە ٧٤٧٥ پێگەی خۆیانن لە هەموو دونیادا بەر بڵاون.

لە بەناوبانگترین.. پێگە فەرمێکانیان.. کەنیسەی شەیتان و خوامرد...هتد.

ئەمەی کە باسم کرد پەیامی منە بۆ دایك و باوکان بۆ لاوەکان خۆیان بپارێزن لەم جۆرە فیتنانە، بەتایبەت ئەوانەی لە ئەوروپان، نەهێڵن منداڵەکانیان تیکەڵ بین بەم جۆرە خەڵکانە..

## یەزیدیەکان بناسە

### ئایا یەزیدی کوردن؟

**یەکەم** : بەنیسبەت ئەوەی یەزیدیەکان کوردی ڕەسەن نین ئەمە ڕاستە، چونکە ئایین ئیلاقەی بە نەتەوەوە نییە وەك ئەوە وایە من کە کوردم ئیتر نابێت ئیسلام بم، خۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام - ئایینێکە لە وڵاتی عەرەبەوە سەرچاوەی گرتووە کتێبەکەی عەرەبیە..

- یاخود ئایینی عیبرانی ئەشێت جولەکەی ڕوس و کورد و ئینگلیز و..تاد.. پەیڕەوی ئایینی جولەکە بکەن و خەڵکی ئیسرائیلیش نەبن..

- یان مەسیحی و نەصرانییەکان دەشێت خەڵکی بەرازیل و نەتەوەی ئەرجەنتین و ئەوروپیی و ئاسیایی بن ئەو ئایینە هەڵبژێرن پەیڕەوەی بکەن لە نەوەی ئیسرایلیش نەبن..

یەزیدەکانیش لە بنەرەتدا بزووتنەوەیەکی ئومەوین و سەر بە یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانن - ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت- کە دژی بزووتنەوەی عەباسی و طالیبینیەکان دروست بوون، هەندێکیان لە ناوچەکانی لالش کۆبوونەوە لەسەر دەستی پیاوچاك و خواناسی ئیسلامی عەدەی کوڕی موسافیر ڕەحمەتی خوای لێبیت..

گومانی تێدا نییە کە پەیڕەوکارانی ئەم ئایینە کورد بن و پاشان عەرەبن و ئینجا ئەرمەنی و دواتر تورك و تەنانەت ئەڵمانیش وەك ڕەگەز یەزیدیان تێدایە.. تاد

لە سەرچاوە مێژووە موعتەبەرەکانی ئیسلام و کورددا تەماشام کردووە ئەم ئایینە هیچ پەیوەندی بە کوردەوە نییە..

لە دوای ئەوەی کە سەیری مێژووی مادەکانم کرد دیار بوو کە هیچ پەیوەندێکیان بەو سەردەمەوە نەبوو هەر ناویان لە هیچ مێژوویەکدا تۆمار نەکراوە، وە ئایینی مادەکان ئایینی (ودا)یان (وارنادا) بووە یان بە گوێرەی ئەو ناوەی کە مێژوو نووسەکان بۆیان داناوە لەدوای ئەوان سەیری قۆناغی دەوڵەتی پارسیا و پاشان پێش هاتنی ئیسلامم کرد لە هیچ مێژوویەك باس نەکراوە بێ هیچ شکو گۆمانێك و سەیری مێژووی دەسەڵاتی ڕۆماکانم کرد بۆ ماوەیەك لە ناوچەی ڕۆژئاوای کوردستان هیچ گەل و هۆزێك نابینرێت بەناوی یەزیدی. لەدوای هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە بەتایبەت لەو ناوچەیە کە ئێستا تیدا دەژین دۆڵی لالش بۆتە ڕووگە و حەجیان، لە مێژووی ئیسلامدا باسێك نیە لەو بارەیەوە، زۆر سەرنجی ڕۆژ هەڵاتناسەکانم دا ئەوانیش بە هیچ شیوەیەك باسیان نەکردووە لەو سەردەمەی کە ئایینی ئیسلامیش هاتۆتە ناوچەکە، بەڵام هەموو مێژوونووسان لە سەر ئەوە کۆکن کە یەزیدییەکان بەشێکن لە ئەمەویەکان و لەدوای شۆڕشی عەباسییەکان جیا بوونەتەوە، ئەمە سەلمێنراوە....

## گەشەکردنیان:

کاتێك لەساڵی ١٣٢کۆچی دەوڵەتی ئەمەوی لەشەڕی (زێی گەورە) دا لە سەرووی عێراق ڕووخا، ئەمیر ئیبراهیم کوڕی حەربی کوڕی یەزید بەرەو کوردستانی عێراق ڕایکرد. لەوێ ئەمەوییە ڕاکردووەکانی کۆکردەوە و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە یەزید لەپێشتر و حەقترە بە

خەلافەت و دەسەڵات. وە ئەو (یەزید) ئەو سوفیانییە چاوەڕوانکراوەیە کە دەگەڕێتەوە سەر زەوی و پڕی دەکاتەوە لە دادپەروەری و یەکسانی، بۆیە یەزیدی بە سۆفی ناو برد بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو ناوچەیە لە دەوری کۆببنەوە، چونکە زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچە سۆفی بوون.

هۆی هەڵبژاردنی یەزیدییەکانیش بۆ کوردستانی عێراق ئەوەیە کە دایکی مەروانی دووەم کە لەسەردەمی ئەودا دەوڵەتی ئەمەوی ڕووخا، کورد بووە، لای هەمووان ئاشکرایە کە شۆڕشی یەزیدیەکان لە کوردستانەوە دەستی پێنەکردوە، بەڵکو لە زۆر جێگای ترەوە سەر هەڵدا بۆ نمونە لەسەر دەستی عەبدوڕەحمانی داخل لە ئەندەلوس سەری هەڵداو ئەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دیارە لەدوای ڕاکردنی لە دەستی عەباسیەکان توانی زۆربەی ئەمەویەکان لە ئەندەلوس کۆ بکاتەوە و هەندێکی تریان ویستیان لە کوردستانەوە ئەو کارە بکەن.

**دووەم:** بەنیسبەت دانی کچیان بە بێجگە لە خۆیان (دوعا)ی شەهید کە موسڵمان بوو شاهیدە..! هەموو دەزانین چۆن و چەندە دڕندانە ئەو خوشکەیان بەردباران کرد.. پێویست بەزیاتر بەڵگە ناکات بەڵگەیەکی زۆر زیندووە لە بەر دەستدا کە (دوعایە)..

**سێیەم** : پێناسەیان: یەزیدییەکان تاقمێکی لادەرن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەساڵی ١٣٢کۆچی دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئەمەوی دروست بوون. لەسەرەتاوە بزووتنەوەیەکی سیاسی بوون بۆ هێنانەوەی دەسەڵاتی ئەمەوییەکان، بەڵام لە پاشاندا بارودۆخ و شوێنەکە و هۆکاری لەڕێ لایدان و گەیاندنییە ئەوەی یەزیدی کوڕی مەعاویە بەپیرۆز بگرن و پاشانیش لەوەدا نەوەستان و کەوتنە بە گەورەگرتن و پیرۆزگرتنی شەیتان

و ناوی (مەلیكە تاووس) یان لێ نا؛ واتە بە گومانی خۆیان شەیتان تاووسی مەلائیكەتەكانە و لە هەموویان بەڕێزتر و گەورەترە!

بۆ ئەوەی كە خۆیان ناشۆن گوایە بە تەشهیر دراوتە قەڵەم: ئەمە سوكایەتی نییە بەڵكو ئەمە بوونی هەیە لە ناو هەموو ئایینەكانی تردا تەنانەت ئیسلامیشدا..

لە ناو ئایینی مەسیحیدا هەندێك ڕاهیبەكان خۆیان نەدەشۆرد بۆ ئەوەی ئەو چڵكە كاتێك كۆدەبوەوە لە سەر لاشە پێیان وابوو خێریان دەگات..

لە هەندێك ناو جولەكەكاندا ئەوانەی نووسەری تیلموت و هەڵگری تیلموتەكانن بەچەند ساڵ ئینجا خۆیان دەشۆرد..

لە ئیسلامیشدا ئەو سۆفیانەی كە بڕوایان بە حلول هەبوو كە دەچوونە خەڵەوەت نەزریان دەكرد كە خۆیان نەشۆن بۆ ئەوەی دوای خەڵوەتیان بە چەندین ڕۆژ خۆیان پاك دەكردەوە لە تاوانەكانیان ئینجا خۆیان دەشۆرد..

**هەندێك لە بیرو باوەڕی یەزیدیەكان :**

**بیروباوەڕییان:**

• لەسەردەمی یەزیدی كوڕی مەعاویە شەڕی كەربەلا ڕوویدا و حوسەینی كوڕی عەلی لەگەڵ زۆرێك لە ئالوبەیت تێیدا شەهیدكران خوا لە گشتیان ڕازی بێت.

مێژوویان لێرەوە دەست پێدەكات، وە مێجەر سۆنیش لە ڕاپۆرتەكەیدا بۆ دەوەڵەتی بەریتانیا، هەروا دەڵێت كە بەشێك لە موسڵمانەكان جیابونەتەوە، بەشێكن لە موسڵمانان..

• لێرەوە شیعە دەستیان کردە نەفرەتکردن لە یەزید و تۆمەتی مەیخواردن و زەندەقەیان دایە پاڵی.

• پاش ڕووخان و نەمانی دەوڵەتی ئەمەوی، یەزیدیی لە شێوەی بزوتنەوەیەکی سیاسیدا سەری هەڵدا.

### شەیتان لە بیروباوەڕی یەزیدییەکاندا:

- شەیتان پێگە و پایەیەکی تایبەتی لە بیروباوەڕی یەزیدییەکاندا هەیە، بیرۆکەی شەیتانیش لای یەزیدییەکان پەیوەستە بە بیرۆکەی خێرو شەڕەوە، ئەوان وا دەبینین کە شەیتان هۆی شەر و خراپەیە و ئەوەندە بەهێزە کە توانای کێبڕکی لەگەڵ خوادا بکات و بەو هۆیەشەوە لە بەهەشت دەرکرا، لە بەر ئەمە لێی ئەترسن و دەیپەرستن و لێی دەپاڕێنەوە تا لەشەڕی بە دوور بن.

- چونکە کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، لەبەر ئەوەبووە کەسێکی یەکخواناس و ئەو ڕاسپێرییەی لە یاد نەچووبوو کە خوا هەر لە ئەزلەوە پێی وتبوون کە کڕنووش بۆ کەس نەبەن، کڕنووشی فریشتەکانیش تەنها بۆ تاقیکرنەوە بووە و ئیبلیسیش – تەواو پێچەوانەی بیروباوەڕی موسڵمانان- لەوەدا دەرچووە و بە یەکتاپەرستی ماوەتەوە، لەبەر ئەوەی بۆتە تاووسی فریشتەکان و لە هەموویان باڵادەست ترە.

- بە توندی ڕوو بە نەفرەتکردنی شەیتان لە قورئاندا وەستانەوە، هەر نەفرەتێکی شەیتان لە قورئاندا هاتبێت سەرەتا نەیانهێشت و لایان برد و پاشان وتیان ئەمە خۆی لە ئەسڵی قورئاندا نییە و موسڵمانەکان بۆیان زیاد کردووە.

- ئەشیپەرستن لەبەر ئەوەی زۆر جوامێر و بە جەرگ بووە لە پشت هەڵکردن و ملنەداندا!!.

- شەیتان لەبەهەشت دەرنەکراوە، بەڵکو و خۆی هاتۆتە خوارێ ئەویش بۆ پاراستن و پارێزگاریکردنی تایەفەی یەزیدیی.

- هەروەها باوەڕیان وایە کە لە کۆتایی دنیادا شەیتان تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە و حاڵی باش دەبێت و وەك یەکەمجاری پێگەو پایەی خۆی وەردەگرێتەوە.

شەیتانیش لای یەزیدییەکان بە (مەلیکە تاووس) یان (تاووسی فریشتەکان) ناو دەبرێت.

• لە کاتی بەندایەتیاندا شێوەی تاووسێکی لە مس دروست دەکەن و دەیهێنن و جاری وایە ناوی دەنێن (سنجق) بە ئەندازەی لەپەدەستێکی قونجاو و بە شار و لادێکانیاندا دەیگێڕن و بە دەوریدا دەخولێنەوە؟ ئەمەش چەند شتێکی پیرۆزی لێ دەنووسرێت کە ئەمانەن: (الله، شمس الدین، ناصر الدین، فخر الدین، سجادالدین، قدیم القدیم،...)

• یەزیدییەکان وازیان لە پەرستنی خوای تاك و تەنها هێناوە و جەختیان لەسەر پیرۆزکردن و پەرستنی شەیتانە، پاساوی ئەم کارەشیان ئەوەیە کە خوا بەخشندە و لێبوردەیە، بەڵام شەیتان بۆ ئەوەی لەشەڕ و خراپەی دوور بین، دەبێت خۆمانی بدەینە دەست و بیکەینە سەرپەرشتیاری خۆمان!

• باوەڕیان وایە ئەگەر یەکێك لە موسڵمانەکان وتی (پەنا ئەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرەتلێکراو) ئەو یەزیدییەی گوێی لەمەیە ئەگەر توانی دەبێ دەستبەجێ ئەو موسڵمانە بکوژێت، بەڵام ئەگەر نەیتوانی ئەوە دەبێ خۆی

بکوژیت تاکو بەم کارەی گوزارش لە ناڕەزایی توندی ئەو قسەیە بکات، خۆ ئەگەر هەردووکیانی بۆ نەکرا، ئەوە تاوانێکی ئەنجام داوە.

• کتێبێکیان هەیە بە ناوی (کتێبی ڕەش) زۆر پیرۆزە لایان و وەك قورئانی موسڵمانان تێی دەڕوانن.

• قەدەغەیە لەسەر یەزیدی تف بکاتە سەرزەی یان ڕوو بە مرۆڤێك یان ئاژەڵێك، چونکە لە باوەڕی ئەواندا ئەم کارە بێڕێزی و ئیهانەکردنە بە مەلیکە تاووس.

• ئایینی یەزیدی لای ئەوانە دەبێت نهێنی بێت و کەسی تری جگە لە یەزیدی پێ ئاشنا نەکرێت.

• یەزیدییەکان باوەڕیان وایە کە حەشر و گردبوونەوەی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا لە دێی (باتوت) دەبێت و خەڵکی هەموو دێنە بەردەم عەدی کوڕی موسافیر و تەرازوو دادەنرێت و ئەو کات هەموو یەزیدییەکان بەرەو بەهەشت دەبات.

• بە لای ئەوانەوە نابێت میزی پیاو لەگەڵ میزی یەکێك لە مەحرەمەکانیدا تێکەڵ ببێت لە کاتی سەرئاودا.

• حەرام و قەدەغەیە ژنخوازی لە نێوان چینەکانی یەزیدییدا و هەرچینە دەبێت لە خۆی بێت، بۆ یەزیدیش هەیە لە یەك کاتدا چوار ژنی هەبێت، بەڵام ئەمیرەکانیان بێ سنوور بۆیان هەیە خێزانیان هەبێت و لێپرسینەوەیان نییە، هەروەها بۆیان هەیە دوو خوشك بە یەکەوە کۆ بکەنەوە هەروەك (سەعید بەگ)ی ئەمیریان کردبووی.

• شووکردن و ژنهێنان لای یەزیدییەکان لە ڕێی ڕەدووکەوتنەوە دەبێت، سەرەتا بووك دەڕفێنرێت و هەڵدەگیرێت و پاشان ئیتر ڕێکدەکەون و پێك دێن.

• ڕەنگی سەوز بە لایانەوە حەڕامە چونکە دیارترین ڕەنگەکانی تاووسە، هەروەها خواردنی کاهو (الخاس) یان سەیرکردنی حەرامە، هەرکەسێکیشیان ئەوە بکات پێی دەڵێن بێباوەڕ بووە، چونکە باوەڕیان وایە کە یەکێك لە پێغەمبەرانیان ناوی (الخاسیة)بووە.

• خواردنی هەریەکە لە ترێ، فاسۆلیا، گۆشی کەڵەشێر... هەروەها گۆشتی تاووس حەرام و قەدەغەیە لایان.

• هەروەها گۆشتی مریشك و ماسی و ئاسك و گۆشتی بەرازیش ناخۆن.

• حەڕامە لای یەزیدیی سمێڵ تاشین.

• ئەگەر بازنەیەکت لە چواردەوری یەزیدییەکدا کێشا، لێی دەرناچێت تا لە لایەکەوە بەشێکی نەسڕێتەوە، چونکە باوەڕیان وایە ئەوە شەیتان فەرمانی پێداویت ئەو کارە بکەیت.

• خوێندنەوە و نووسین بە فەرمانێکی ئایینی قەدەغەیە، چونکە ئەوان پشت بە زانیاری سینە (علم الصدر) دەبەستن و دەڵێن پێویستمان بە خوێندەواری نییە.

• یەزیدییەکان دوو کتێبی پیرۆزیان هەیە، یەکەم بە ناوی (الجلوة) کە باس لە سیفات و ڕاسپێرییەکانی خوا دەکات، ئەوی دیکەش(پەڕاوی ڕەش) کە باس لە دروستکردنی بوونەوەر و فریشتە و مێژووی یەزیدی و بیروباوەڕیان دەکات.

• یەزیدییەکان باوەڕیان بە خۆشۆردنی دوای لەشپیسی نییە.

• نابێت یەزیدی لە کاتی خەو یان کاری سەرجێی یان سەرئاودا ڕوو لە نزرگەی شێخ عەدی کوڕی موسافیر بکات، هەروەك نابێت کەسێکی یەزیدی ماڵ و کەل و پەلی خۆی بە کەسێکی نا یەزیدی بفرۆشێت.

• لای یەزیدی قەدەغەیە ژنهێنان و شووکردن لە مانگی نیساندا، چونکە باوەڕیان وایە کە لەم مانگەدا فریشتەکان هەندێکیان دەچنە لای هەندێکی دیکەیان.

• ئینکاری پێغەمبەرایەتی گەورەمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەکەن و دان بە پەیامەکەیدا نانێن.

• باوەڕیان وایە کە شیوی لالش کە نزرگەی شێخەکەیان عەدی کوڕی موسافیری لێیە، شیوێکی پیرۆزە و هەموو شتێکی تێیدا قەدەغەیە وەك کاری خراپ، عەرەق خواردنەوە، ڕاو، هەڵکەندنی دار و دڕەخت و گژو گیا...هتد.

• شایەتمانیان بریتییە لە: أشهد واحد الله، سلطان يزيد حبيب الله.

• نوێژ: لە شەوی نیوەی شەعباندا نوێژ دەکەن، وا دەزانن کە ئیتر ئەوە لە بریتی نوێژی یەك ساڵی تەواوە، هەموو یەزیدییەکانیش لەسەریان نییە نوێژ بکەن، هەوڵ دەدەن کەسیش چاوی لێیان نەبێت کە چی دەڵێن و چی دەکەن.

• ڕۆژوو: دەکرێت بە دوو بەشەوە: یەکەم: ڕۆژووی خەڵکی گشتی: لە هەموو ساڵێکدا و لە مانگی کانونی یەکەمدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبن، کە ڕێکەوتی لە دایکبوونی یەزیدی کوڕی مەعاوییەیە.

دووەم: ڕۆژووی تایبەت: ئەمە هەشتا ڕۆژە و ئەمیش ئەکرێت بە دوو بەشەوە:

-٤٠ ڕۆژ لە کانونی یەکەمدا، دەچنە لای نزرگەی شێخ عەدی لەوێ سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبن و پاشان دەگەڕێنەوە و ئەوەی تری تەواو دەکەن.

- بەشەکەی تر لە مانگی تەمووزدا بە هەمان شێوە دەگرن.

• لە کاتی ڕۆژوو شکاندنیاندا بە شتێکی کەم لە خۆڵی نزرگەی عەدی کوڕی موسافیر ڕۆژووەکەیان دەشکێنن، یان بە نانێکی هەڵێکشراو لە خوێ کە ئەمە هەمان ئەو شێوەیە کە جوولەکە ڕۆژووی پێ دەشکێنێت.

• حەج: یەزیدییەکان هەموو ساڵێك لە کێوی عەرەفات لە مەرجەی نوورانی لە لالش دەوەستن و حەج دەکەن، وەرزی حەج هەموو ساڵێك لە ٢٣ ئەیلول دەست پێ دەکات و لە ٣٠ ئەو مانگەدا تەواو دەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش شەوی کۆتایی هەموو دەچنە سەر کێوی لالش و لەوێ یەکێك بە ناوی (بابا جاویش) پێشیان دەکەوێت، کۆمەڵێك دوعا و قسەی خۆیان دەکەن و پاشان دەگەڕێنەوە، هەموو یەزیدییەکیش دەبێ حەج بە جێ بێنێت، ئەگەر نەچێت بۆ حەج بە کافر دەناسرێت و دەردەکرێت. کاتێکیشی دەچنەوە لای نزرگەی عەدی کوڕی موسافیر دەبێت پێڵاوەکانیان دابکەنن.

• گڵ و خۆڵی نزرگەی شێخەکەیان زۆر لایان پیرۆزە، پێش ئەوەی بگەڕێنەوە بەشێك لە خۆڵەکەی دەکەنە قوڕ و بە ئەندازەی دەنکە چوالەیەك یان زیاتر هەڵیدەگرن و پێی دەڵێن(بەرات) و بۆ پیرۆزی لە ماڵەکانیاندا دایدەنێن یان هەڵی دەگرن لەگەڵ خۆیان، لە کاتی ئاشتی نێوان دوو تیرەدا هەر یەکێك لەوانە (بەرات)ەکەی خۆی ئەداتە ئەوی تر مانای ڕێککەوتوون و ئاشتی لە نێوانیان سەقامیگر دەبێت، سەندنەوەی (بەرات)یش لە هەر یەکەیان مانای هەڵوەشانەوەی سوڵح و ڕێککەوتنی نێوانیانە. خۆ ئەگەر یەکێك دوژمنیشیان بێت و بە ناویاندا تێپەڕێت بەڵام بزانن کە ئەو (بەرات)ی پێیە، وازی لێ دێنن و هیچی لێ ناکەن تا پێی نامێنێت یان لێی دەستێنن.

• کەعبەش لای یەزیدییەکان گۆڕی عەدی کوڕی موسافیرە و کێوی لالشیشی کێوی عەرەفاتە و ئەو ئاوەش لە کێوەکە هەڵدەقوڵێت ئاوی زەمزەمە.

• زەکات: بە هۆی تاوسەوە کۆ دەکرێتەوەو دەبرێت بۆ سەرۆکی تایەفە.

• ڕێزو ئیحترام لە ئایینی نەسرانی دەگرن، تەنانەت جاری وایە دەستی قەشەکانیشیان ماچ دەکەن، ئامادەی ئاهەنگی (العشاء الرباني) دەبن لە گەڵیاندا، باوەڕیان وایە ئەو عەرەقەی لەو ئاهەنگەدا پێیان دەدرێت خوێنی حەقیقی مەسیحە، لەبەر ئەوە ناهێڵن دڵۆپێکیشی بکەوێتە سەر زەوی یان بە ڕیش و سمێڵییانەوە بمێنێتەوە.

• ڕێوڕەسمی (تەعمید)یان لە نەسرانییەکانەوە وەرگرتووە، کاتێك منداڵیان لە دایك دەبێت دەیبەنە سەر ئاوێك کە پێی دەڵێن (سەرچاوەی سپی) تا لەوێ تەعمیدی بکەن، جا پاش ئەوەی تەمەنی دەبێتە هەفتەیەك دەبرێتە لای نزرگەی شێخ عەدی و لەوێ لە ئاوی زەمزەم هەڵدەکێشرێت و بە دەنگی بەرز ناوەکەی دەڵێنەوە و داوا دەکەن کە ببێتە کەسێکی یەزیدی و باوەڕی بە مەلیکە تاووس (شەیتان)ببێت.

ماوەتەوە بڵێین ئەمانە هیچ پەیوەندیان بە ئایینی کوردەوە نییە..

## زەردەشـتی بناسـە

کورد لە ڕەگەزی ئارییە لە سەردەمێکی نەزانراوە وە یان چەند هەزار ساڵێك پێش زایین کۆچیان کردووە بۆ کوردستان، کورد لە مادەکانیش کۆنترن کە بە کورد و مادیان وتوە مادیان، بەڵام زۆر جار لە سەر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی کەوتونەتە شەڕەوە، بەڵام بەگشتی ئاوانیش هەر بە ماد ناسراون.

کوردستانیش دەکەوێتە خوارووی ئەرمەنستانەوە، بە درێژایی ڕووباری دیجلە و چیاکانی زاگرۆس و تا کەنداوی عومان ڕۆشتوە، لە ڕۆژئاواش بە درێژایی ڕووباری فورات ڕۆیشتووە بە درێژایی زنجیرە شاخی (تورسب) تا سوریا و شامات و کەناری دەریای سپی بڵاو بۆتەوە.

ئەمە بەگشتی جوگرافیای کوردستان دەگرێتەوە کە تەنها ئینساکلۆپیدیای ئیسلامی دانی بەم جوگرافیایەدا ناوە، وە لە مێژووەکەی ئەمین زەکی بەگدا لە سەرەتادا باسی لێوە کردوە.

هۆزەکانی کورد بریتی بوون لە حەوت هۆزی سەرەکی هەرچەندە مێژوونووسان کورد بەوە زیاتر ناوزەد دەکەن لەو حەوت هۆزە، بەڵام ئەوەی کە هەموو مێژوونووسان لە سەری یەکگرتوون بە ڕۆژهەڵاتناسەکانیشەوە وە بەهەمانشێوە مێژوونووسانی ناوچەکە و مێژوونووسانی کورد.

**یەکەم:** گۆتی یان (جودی) ئاراراتی.

**دووەم:** لۆلۆ.

**سێیەم:** سیرەتی یان کورتی بەمانای دڕندە و ئازاردانی خەڵکی ناویان دەرکردووە، لە زمانی هەورامی دا سیرەت واتە دڕك.

**چوارەم:** کاردۆخی یان کاری.

**پێنجەم:** هۆری.

**شەشەم:** سۆبارتۆ یان کاسی.

**حەوتەم:** ماد.

بەو نیشتمانەی کە پێی دەوترێت کوردستان بڵاوبوونەتەوە.

### ئەو سەردەمانەی کە کوردی پێدا تێپەڕ بووە :

بەڵگەی مێژوویی پاشماوە دێرینەکان وا باسیان کردووە کە کوردیان بە پێنج سەردەمدا دابەش کردووە.

**یەکەم:** سەردەمی پێش مێژوو: کە چەند هەزار ساڵێك پێش زایین تا ساڵی ٣٦٠٠ی پێش زایین کە گۆتیەکان دوو سەدە حوکمیان کردووە، ئەویش بە لە ناوچوونی فەرمانڕەوای (نەرامسینی کوڕی سەرگۆن) بە دەستی گۆتیەکان کە ئەم مێژووە زۆر ڕوون و ئاشکرا نییە.

**دووەم:** سەردەمی پەیوەندی کورد لەگەڵ ئەکەد و ئاشوری و عیلامیەکاندا ساڵی ٣٦٠٠ی پ.ز تا ساڵی ٨٥٣ی پ.ز واتا کاتی فەرمانڕەوایی (کەیقوبادی کوردی) یان سەردەمی دروست کردنی دەوڵەتی ماد.

**سێیەم:** لە ساڵی ٨٥٣ی پ.ز تا ٥٥٠ی پ.ز بە سەردەمی لە ناوچوونی فەرمانڕەوای ماد بەدەستی (کەیخوسرەوی گەورەی پارسیا کە بە سیروس اعظم ) ناوبانگی دەرکردبوو دەست پێ دەکات لە دوای ڕووخاندنی

دەوڵەتی مادد بەدەستی(کەیخوسرەوی گەورە) مادەکان دەبنە بەشێك لە دەوڵەتی پارسیا.

**چوارەم:** ٥٥٠ی پ.ز تا سەردەمی کەیخوسرەوی گەورە، کوردەکان جاروبار فەرمانڕەواییان کردووە بەڵام زیاتر هەر ژێردەستە بوون.

**پێنجەم:** کوردەکان لە سەردەمی ئایینی ئیسلام بەدواوە: ئەویش مێژوونوسان بە سێ قۆناغی گرنگ باسیان کردوە.

ئەمانەی کە خستمانە ڕوو تەنها بۆ ناساندنی کورد بوو ئەگەر بمانەوێت لە ڕووی سیاسی و دەسەڵات و فەرمانڕەوای کوردەکانەوە بدوێین لە ڕاستیدا ناتوانین بەچەند نووسینێك، بەڵکو بەچەند کتێبێکیش ڕوونیان بکەینەوە، ئەم ڕەهەندە تەنها بۆ ناساندنی کورد و کوردستانە.

### ئایینی کورد :

لەبەر ئەوەی کوردەکان زیاتر لە ناوچە شاخاویەکاندا ژیاون، زۆر تێکەڵ نەبوون بە نەتەوە و هۆزەکانی دەوروبەریان، بە تێڕامانی خۆیان پەرستنیان کردووە..

پەرستنەکانیشیان بریتی بووە لە شتە سروشتیەکان وەك (دار، مانگ، ڕۆژ،گا..هتد) هەموو جۆرە شتێکی سروشتی لەم بوونەدا سوودی بە مرۆڤ گەیاندبێت ئەوان دەیان پەرست، بەڵام مێژوونوسان سەرەتای ئایینی کورد دەگەڕێننەوە بۆ( فیتیشیزم/ fetichism = تميمة = نوشتە) یان (ئەنیمیسم/ Animism = روحانيات) یان ( ئیدۆلاتری / idolatry = بت پەرستی)، پاشان ئایینی کورد لەگەڵ تێکەڵ بوونیان بە هۆزەکان و دروستکردنی فەرمانڕەوایی ماد.. یان ئایینی ئارییەکان لەو ناوچەدا

بە گشتی بریتی بووە لە ئایینی (ودا) کە لە هیندەکانەوە وەریان گرتبوو، پاشان ئەم ئایینە وابەست بوو بە کوردەکانەوە کە گۆڕا بە ئایینی (واردنا) کە ئەم خوایە تەنها پەیوەست بوو بە مادەکانەوە.

هەرچەندە دەڵێن؛ هندەکانیش پەرستویانە، پاش سەرهەڵدانی ئایینی بودایی لە ناو ماددەکان و پارسەکاندا دەستی پێکردوە و بە ''مهرپەرستی'' خۆی ناساندوە.

مادەکان و پارسەکان بڕوایان وابووە کە ''مهرپەرستی'' خوایەکی گەورەتر بووە لە هەموو خواکانی تر.. پاشان ئەم ئایینەشیان بەجێ هێشتوە ڕوویان کردووەتە ئایینێکی کە کە ئەمەش سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هیندەکان ئەم ئایینە ناوی (میترا ئیسیسم) بووە، کە لە سەر بناغەی ئاگرپەرستی هێزە سروشتییەکان دانراوە وەك ( باو تۆفان و جوانی و ئاسمان و چیا و جەنگەڵ و شەو)..

کورد بەسەردەمێکیدا تێپەڕیوە کە پێی دەوترێت سەردەمی جادوو سحربازی.

ئەم ئایینە زۆر برەوی هەبووە خەڵکی سادە و پیاو چاکەکانی کوردیش دەبوو لە سحر و جاد و شارەزا بونایە تەنانەت پیاوە ئایینییەکانیش لە سحر شارەزا بوون واتا سحر پیشەی ئەو سەردەمەی کۆمەڵگا بووە.

ئەم ئایینە لەسەر بنەمای خوایەك دامەزراوە کە دوو فریشتەی لە ژێر دەستا بووە بە ناوی ( ڕاشنو وە سەر ئوشنا) لە ژێر فەرمانڕەوای خواکەیاندا بووە کە ناوی (میترا دانە) کە فریشتەکان سزای خراپەکاران دەدەن، بێجگە لەم خوایە بڕوایان بە خوای خواکان بووە کە ناوی (ئێزدی یان ئێزدەکان) بووە.

ئەو خوایەی تریش بریتی بووە لە (میترا) کە خوای ڕووناکی بووە و (ئاگنی) خوای ئاگر و(ئیبن دارا) کە خوای سروشت و هەورەبروسکە بووە، خوای (وارونە) خوای ئاسمان و (ئاناهیتا) خوای ئاو، بێجگە لەم خوایانە خوای کەشیان پەرستووە و هەروەك باسمان کرد خوای خواکان (ئێزدی) بووە، بەڵام خوای ئاگر بەڕێزترین خوا بووە لای کوردەکان، وە ئاگریش ڕێزێکی تایبەتی هەبووە، پیاوانی ئایینی ئەو سەردەمەی کورد بە (ئەتروبان یان ئاگرەوان) ناو دەبران، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەم دروشمە ئایینیە لەو سەردەمەدا دروست بووە (وتەی چاك، کرداری چاك) کاریان پێ کردووە واتا پێش ئایینی زەردەشتی ئەمانە هەمووی ئایینی کورد بوون، بەڵام لە دوای ئەم ئایینانە گرنگترین ئایین کە سەرچاوەی گرتووە لە ناو کوردەکاندا ئایینی (شوشانگ) بووە واتا خوای هەمەچەشنە.

مێژوونووسی دانیمارکی... (کریستیانسن)و مێژوونووسانی تریش لەسەر ئەو ڕایەن کە ئەم ئایینە سەرچاوەکانی ئایینەکانی پێشوو بووە، پیاوە ئایینەکان و سحربازە کوردەکان بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات ئەم ئایینەیان دامەزراندوە، بناغەی ئەم ئایینە (میترا)یە.

**ئایینەکانی کورد بە گشتی بریتی بوون لە :**

**یەکەم**- پەرستنی هەموو دیاردە سروشتیەکان.

**دووەم**- پیاوەکانی ئەم ئایینە جاد و سحرباز بوون.

**سێیەم**- تەنها ڕۆحانیەکانی ئەم ئایینە پاکن.

ئایینی (شوشەنگ) لە هەموو جیهاندا بڵاو بۆتەوە، بە تایبەت لە ناوەندی ئەوروپا لە ساڵی ١٠٧ی ز وە دەستی پێ کردووە، باکوری باڵکان

و ئیتالیا و ئیمپراتۆریەتی ڕۆم ئایینی (شوشەنگ یان میترایان) هەبووە. ئەمەش بریتی بوو لە ئایینی سەرەکی کورد پێش هاتنی زەردەشت.

**هاتنی زەردەشت، زەردەشت کێیە؟**

زەردەشت لە ڕاستیدا بە چەند ناوێك لێکدراوەتەوە بە وشتری زەرد یان ئەستێرەی زێڕین یان پیر وە یان دەسەڵاتی زێڕین، خاوەنی وشتر یان گەشەوە باسیان لێوە کردوە.

مێژوونوسان وا دەگێڕنەوە کە زەردەشت کوڕی پیاوێکی جوتیار بووە لە ڕەگەز و ڕەچەڵکدا ئاری بووە..ناوی لە بنەڕەتدا زرواستر)ە یان (زراتشتر) ە، واتا خاوەنی وشتری زەرد یان وشتری کۆن یاخود پیر دێت.

لە ڕاستیدا مێژووی لە دایکبوونی زەردەشت زۆر ڕوون نیە، بەڵام مێژوونووسان دەیگەڕێننەوە بۆ(٦٦٠)پ.ز لە ئازربایجان لە دایك بووە بنەماڵەکەی (ئەسپیاما)یە کەلە ڕەچەڵەکدا هەموو ئارین، باوکی زەردەشت ناوی(پورشاسپا)ی ئازەربایجانیە، دایکی زەردەشت ناوی (دغدو یان دگدو) بووە خەڵکی (ڕەمی) ئازەربایجانە، خێزانی سێیەمی زەردەشت ناوی (هۆیوی ) بووە کە کچی پاشای ناوداری فارسەکان(فریشا ئوشتر) ی برای (جاماسب )بووە.

زەردەشت لە تەمەنی پازدەساڵیدا دەستی بە خوێندن کردووە لای مامۆستایەك کە ناوی (کوشتی )بووە، سەیر لە وەدایە کە ئەم ناوە بە کار هاتووە بۆ مەراسیمی پشتوێن بەستن لە ئایینی زەردەشتی دا، تا تەمەنی بیست ساڵی بەردەوام بووە لە خوێندن، لە دواییدا زەردەشت دایك و باوك و خێزانەکەی بە جێ هێشتوە و گەڕاوە بە جیهاندا یان دەڵێن کەسێکی گۆشە گیر بووە لە چیاکان و ئەشکەوتەکاندا ژیانی بردۆتە سەر.

لەتەمەنی سی ساڵیدا بەپەیامبەر خۆی ناساندووە بانگەشتی بۆ پەیامبەرێتی و ئایینەکەی کردوە.

مێژوونووسان دەڵێن لە کەناری دەریای (دیتا) لە نزیك نیشتیمانەکەی خۆی لە ئازربایجان لە لەلایەن فریشتەیەکەوە کراوە بە پەیامبەر، ئەو فریشتە ناوی (هومنە یان بەهمەن)ە واتای لە زمانی پارسی کۆندا بە مانای بیری چاکە هاتووە.

لەدوای هەشت ساڵ پەیامبەرایەتی لەگەڵ شەش فریشتە ناسراوەکەی (ئەمشاسپندان) نوێژی کردوە.

لە دوای ١٠ساڵی تری پەیامبەرایەتی مێژوونوسان دەڵێن؛ خەڵکی زۆر ئازاریان داوە، تەنها یەك کەس باوەڕی پێ دێنێت ئەویش نزیکی خۆی بووە، یان دەڵێن ئامۆزای خۆی بووە کە ناوی(مینیدی نیمون ها) بووە.

لە پاشان سەری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوودەکاتە ئەوروپای ئێستا لە ناو یۆنان و ڕۆمەکاندا دەست بە بڵاو کردنەوەی ئایینەکەی خۆی دەکات.

زەردەشت لە ناو یۆنانیەکاندا بە (زۆرۆئاسترس) ناسراوە، لە ناو ڕۆمەکانیشدا بە هەمان شێوە پێیان وتوە(زۆرۆ ئاستر).

کارناسی فەڕەنسی ئاوێستای (جێمس دار مێستەر) دەڵێت: لە دوای بەجێ هێشتنی زەردەشت لە ناوچەکەدا توانی ڕۆمەکان و یۆنانیەکان ڕێکبخات وە کۆکیان بکات لە سەر خوایەك کە لە زەردەشت دایان تاشی ناویان نا(هوم) کە لە شێوەی مرۆڤ دا بوو.

(کرن) مێژوونووسی فەڕەنسی دەڵێت: زەردەشت پەیامبەر نەبوو بەڵکو ڕۆشنبیرێکی ڕووناك پەرست بوو؛ لە گەڕانەوەیدا بۆ خۆرهەڵات ناونرا بە خوای خۆر.

ئەفلاتون لە ٤٢٩تا ٣٤٧ی پ.ز بە ڕاشکاوانە باسی زەردەشتی کردوە ئەو بە فەیلەسوفێکی پارس و هندەکانی دەزانێت وە بە دامەزرێنەری ئاایینی (مەزد یەسنا) ی زانیوە کە تا ئێستاش لە هندستان و ئێراندا ئەو ئاایینە ماوە.

مێژوونووسی سەدەی سێیەمی زایین (برۆسوس) زەردەشت بە پاشایەکی خوازراوی پارس و ماددەکان دەزانێت.

مێژوونوسە بەناوبانگەکانی جیهان هەموو لە سەر ئەوە کۆکن کە زەردەشت خەڵکی ئازەربایجانە، مێژوونووسەکانیش بریتین لە (براتلمە، مولون، سیستان، گلدزهیر، جاکسون وە پیریتیا)، بەڵام ڕایەکی کە هەیە کە دەڵێن زەردەشت خەڵکی شاری (ڕەێ) واتا تارانی ئێستا بە زمانی ئاوێستای باسی کردوە بە شاری تارانیان توە (وغ) و بە زمانی پەهلەوی پێی دەڵێن(ڕکا) کە گوایە زەردەشت لە وێ لە دایك بووە.

ئەو مێژوونووسانەش بریتین لە (ئەفلاتون، دیۆجین لەگەڵ هرموودرس) کە قوتابی ئەفلاتون بووە، هەر ئەوانیش وشەی زەردەشتیان لێك داوەتەوە بە مانای ئەستێرەی زێڕین یان نیاز پاك وە یان بە زەوی کێڵەرێکی باش لێکیان داوەتەوە.

لە ناو مێژوونوساندا تەنها مێژوونووسی ئەڵمانی کە ناوی ( دۆمارێنی) یە دەڵێت زەردەشت خەڵکی (باڵخ)ی ڕۆژهەڵاتی ئێرانە یان (ئورومیە) وە زەردەشتیشی بە مانای سووتان و گەشاوە ناوزەند کردووە.

بە هەر جۆریك بێت دەگەڕێمەوە سەر باسەکە تەنها ویستم سەرنجی خوێنەر ڕابکێشم بۆ باسکردنی جێگە و ڕێگای زەردەشت.

بەمیش دەركەوت كە زەردەشت كورد نیە، بەڵكو زۆرێك پێیان وایە كە ڕەگەزی زەردەشت ئارییە و لە بێخدا ئازەریە!!

لە پاش گەڕانەوەی بۆ ناو مەڵبەند و زێدی باوو باپیرانی وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ كردبوو لە هەرێمی خۆرهەڵاتی ئێران گەیشتە بارەگای پاشای ئەو هەرێمە.

كە پاشای پارسەكان بوو ناوی ( ویشتاسب) بوو..

زەردەشت بەهۆی زیرەكی و لێوەشاوەی خۆی توانی لە دەسەڵاتی ئەو پاشایەدا جێگای خۆی بكاتەوە تا دوو ساڵ بە نهێنی كاری كرد، تا ئەو پاشایە بهێنێتە سەر بیروبۆچون و ئایینەكەی خۆی، بەڵام دەسەڵات داران و فەرمانڕەوایان وە پیاوانی ئایینی ئەو دەڤەرە زۆر دژایەتی زەردەشتیان دەكرد..

لە دوای ئەوەی كە زەردەشت كچەكەی خۆی دا بە ( ویشتاسب) كە بە تەمەن ٤٨ساڵ لە كچەكەی زەردەشت گەورەتر بوو كچەكەی ناوی (یوروچیست) بوو.

لە پاشاندا تەواوی هێزو دەسەڵاتی خۆی خستە ژێر دەستی زەردەشتەوە تا ئایینەكەی بڵاو بكاتەوەو وە خۆشی بڕوای پێ هێنا و ئایینی زەردەشتی بووە ئایینی ڕەسمی "ئێران" و بۆ بڵاو كردنەوەی ئەم ئایینە كەوتنە جەنگ و كۆشش كردن لە ماوەی ٢٠ ساڵدا خەریكی بانگەواز و داگیركردنی وڵاتانی چواردەوریان بوون، كە زەردەشت تەمەنی گەیشتە ٧٧ ساڵ لە جەنگێكدا بەرانبەر بە تورانیەكان و مادەكان كە لە ڕاستیدا سەركەوتن بەسەریاندا، پارسەكان توانیان ماددەكان و تورانیەكان تێك و پێك بشكێنن و زەردەشتیش لە تەمەنی ٧٧ساڵیدا كە یەكێك بوو لە سەركردەی ئەو لەشكرانە بە دەستی تورانیەكان كوژرا.

**کتێبێکی ئاوێستا :**

وشەی ئاوێستا لە بنەڕەتدا واتاکەی بە "بێخ" دێت یان "ئەسڵ" وە یان "پەنا" یان "دۆستایەتی" هاتووە.

کتێبی ئاوێستا کتێبی ئایینی زەردەشتە کە هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئەم کتێبە هیچ سەرچاوەیەکی نەماوە، بەڵگەشم بۆ ئەمە، مێژوونوسان دەڵێن لە سەردەمی خۆیدا لە تەختی جەمشیدا لەو ئاتەشگایە هەڵگیراوە لە سەر پێستی گیانلەبەران نووسرابووەوە کە کاتێك ئەسکەندەر لە ٣٣١ی پ.ز دا کە هەخامەنشینەکان، بابلیەکان و پارسەکانی گرت ئەو ئاتەشگایەی سووتاند و ئاوێستاکەی لە ناو برد.

ئەو ئاوێستایانەی تریش کە لە ئاتەشگاکانی تردا مابوونەوە وەك ئاتەشگاکانی هندستان، ئازەربایجان، یۆنانیەکان دزیان بۆ خۆیان، مێژوونوسەکان دەڵین زۆربەی زۆری فەلەکناسەکانی یۆنانی لە کتێبی ئاوێستاوە فێری فەلەك ناسی بوون.

**دەڵێن ئاوێستا سەرچاوەیەکی باش بووە بۆ گەردووناسی:**

لە سەردەمی (ئەردەشیر) پاشای ئەشکانیەکان کە لە دوای نەمانی دەسەڵاتی ئەسکەندەرەوە ویستی سەر لە نوێ ئاوێستا کۆ بکاتەوە، فەرمانی دا بە ڕۆحانی و موغەکان کە دەست بکەن بە کۆکردنەوەی ئاوێستا ئەمەش موغەکان و ڕۆحانیەکانی هاندا کە خۆیان بکەن بە زەردەشت و ئەوان سەر لە نوێ داڕشتنەوەی ئاوێستا بکەنەوە.!

مێژوونووسی کورد مەردۆخی دەڵێت: ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە چەند زەردەشتێك دروست ببێت تا بە ئارەزووی خۆیان چەند ئاوێستایەك بنووسنەوە.!

لە دەوڵەتی ساسانیەکاندا زۆر برەویان دا بە ئایینی زەردەشتییەت، کەسێکی ڕۆشنبیر کە بە ڕەچەڵەك کورد بوو بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە ساسانیەکان و دەسەڵاتی کوردی بێنێتەوە کایە و وتی: من زەردەشتم؛ ئاوێستایەکی نووسراوەی جوانی بەدەستی خۆی خستە بەردەست ساسانیەکان، خۆشی کردە گەورەی موغەکان و ڕۆحانیەکان، زەردەشتیەتی کردە یاساو ئایینی کیشوەری ساسانی.

ئەمە سەری نەگرت، پاشان لە سەردەمی (شاپور)دا گەڕانێکی زۆریان کرد لە یۆنان و هیندستان و ئاتەشگاکانی تری زەردەشتی دا تا بەم شێوەیە کۆیان کردەوە کە لە ڕاستیدا ئاوێستا نەبوو، بەڵکو تەنها قسەو باس بوو لە سەر زەردەشت هەر قسەیەکی گێراوە بوو هیچی تر.

ئاوێستایان دروست کرد لە ٣١ ”نسك“ یان بەش تا سەردەمی ئایینی ئیسلام.

کە ئایینی ئیسلام هات ئاوێستا کاریگەری ئیسلامی لە سەر بوو، یان یاسای (فیتودت) بەکار دەهێنرا کە کوڕ دەیتوانی دایك و باوك کچی خۆی مارە بکات و خۆشك و برا لەیەك مارە بکرێن، لەسەر ئەو بنمایەی کە ڕەچەڵەك ون نەبێت لەوسەردەمەدا ئەم کارە باو بوو بۆنمونە مێژوو نووسان دەڵێن؛ هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە ئەو چاکەیەی لەگەڵ میللەتی کورددا کرد، کە مەحرەمی دروستکرد لە ناوچەکەدا لە یاسای شەریعەتی زەردەشتیدا بە ناوی یاسای (فیتودت)، کە دایك لە کوڕی خۆی مارە دەکرا وە کچ لە باوك وە خوشك لە برا، (کامبوزیا) کە کەسایەتیەکی ئایینی بوو خوشکەکەی خۆی هێنا و پاشان کوشتی (هەرۆدۆت) لە ٤٨٤ تا ٤٨٩ ی پ.ز باسی کردووە، (ئەردەشیری دووەم)

کچەکەی خۆی مارە کرد کە مێژوونووسی یۆنانی (کتیزیاس) پێنج ساڵ پێش زایین ژیاوە و ئەم مێژووەی نووسیوەتەوە پاشان ( قوباد) کچەکەی خۆی مارە کرد، مێژوونوس (ئاگاتیاس) باسی لێوە کردوە ( ئەنەوشێروان) ئەویش کچەکەی خۆی مارە کردووە، پرۆفیسۆر (ڕالینوم) باسی کردووە کە وەرگێڕی مێژوی (هۆرۆدۆت)ە بۆ زمانی ئینگلیزی، زۆری تریش هەن کە کەسایەتی ئایینی بوون و ئەو یاسایەیان بەکار هێناوە کە گوایە ئێستا زەردەشتیەکان دەڵێن ئەمە لە ناو ئایینی زەردەشتیدا باو نەبووە بەڵکو لە ناو ئارییەکاندا باو بووە خۆ ئەگەر واش بێت زەردەشت پەیامبەری ئارییەکانیش بووە.!

ئایینی ئیسلام ئەو چاکەیەی هەبووە بۆ گەلی کورد کە ئەو یاسایەی نەهێشت.

ئەو چوار بەشەی ئاوێستا کە هیچ شەرع و یاسایەکی تێدا نەماوە بەڵکو تەنها چیرۆکی بەر ئاگردانن بریتین لە مانەی خوارەوە:

١- دینکرد.

٢- نەتەر.

٣- ویستاگ.

٤- یەزدەك.

هەروەها لە ناو ئەو چواربەشەی ئاوێستادا پێنج بنەمایی سەرەکی هەیە بۆ بەندایەتی:

١- یەسنا: واتا نزا و پاڕانەوە کە لە بەرانبەر ئاگردا دەخوێنرێت.

٢- ویس پزد: واتا بەندایەتی بۆ ئاهورامەزدا، ئەمە تەواوکەری یەسنایە.

٣- وەندیدان: ئەمەیان دەستوری ئیش و کار و سەرکەوتنە بەسەر دێو و درندەکاندا.!!

٤- پشت یان سروود وە یان گاتە: ئەمە بۆ ئەو شەش فریشتەیە دەخوێنرێت کە زەردەشت گفتوگۆی لەگەڵ کردوون.!!

٥- خوردە ئاوێستا: واتا ئەو نوێژانەی لە بۆنە و جەژنەکاندا دەخوێنرێت.

بە کورتی ئەمە باسێکی ئاوێستا بوو.

**باوەڕی زەردەشتی :**

لە ئایینی زەردەشتیدا ئاهورامەزدا بە خوای چاکە ناوزەد کراوە، ئەهریمەن بە خوای خراپە دانراوە.

هەمیشە ئەم دوو دەسەڵاتە کە لە ناو زەردەشتیەتدا بە خوا ناسراون لە کێشمە و وەرگرتنی دەسەڵاتدان بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە دەست یەکتری.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەم دوو خوایە لە خوایەکی کەوە سەرچاوەیان گرتووە کە ناوی ( زەروان)ە، دەڵێن "زەروان" لەمەولاوە دەسەڵاتی خۆی بەخشیوەتە دەست ئاهورامەزدا بۆ چاکە، بەڵام ئەهریمەن ئەمەی پێ ڕەوا نییە بۆیە کەوتۆتە گیانی شوێنکەوتووانی ئاهورامەزدا.

ئەگەر باوەڕێك لە سەر ئەم شێوەیە دابمەزرێت خواکان لە دەسەڵات لە یەکتری سەندنەوەدا بن ئەو کات ژیان بەرەو لە ناو چوون و مرۆڤەکانیش بەرەو فەتارەت دەچن؛ کەواتە ئەم ئایینەی کە ئێستا بانگەوازی بۆ دەکەن هەڵخڵەتاندنی گەلی کوردی موسڵمانە و بیرێکی پوکاوەی سەردەمی ساسانیەکانە کە ئێستا ئەیانەوێت بە ناوی هێنانەوە

کایەی دەوڵەتی کوردی کە گوایە وەك زەردەشت بانگەوازی بۆ دروست بوونی دەوڵەتێکی کوردی کردبێت وا ئێستا دەیانەوێت بە بیری زەردەشتی دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنن، کە تەنانەت بنەمایەکی یاسایی لە ناو ئەو ئایینەدا نەماوە یان بە سروودی ئەی ڕەقیب کە شانازی بە کەیخوسرەوە دەکەن و خۆیان بە نەوەی ئەو دەزانن کە لە کاتێکدا دەوڵەتی ماد بە دەستی ئەو لە ناو چووە.

کە ئیسلام هات کۆتایی هێنا بە پیرۆزترین شتی زەردەشتی کە بریتی بوو لە میزی گا، ئایینی پیرۆزی ئیسلام چاکەیەکی تری خستە سەرشانی کورد یاسایەکی تری ئاوێستای و زەردەشتی تریشی نەهێشت کە بریتی بوو لە ( ڕەدوو) یان (هەڵگرتن) کە لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا وای لێهاتبوو کچەکان و ژنەکان لە ماڵەکاندا زیندانی دەکران نەکو پیاوێك ئایینی زەردەشتی وە یان موغێك یان ئەتروبانێك وە یان ڕۆحانییەك ڕەدوی کات و ئیتر کە دووری خستەوە لە جێگای خۆی ئەوکات ئەو دەبێتە خاوەنی ئەو ئافرەتە، هەرچەندە بە داخەوە ئێستاش لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا ئەو مەراسیمە ماوە، بەڵام گۆڕانکارییەکی تەواوی بەسەردا هاتووە، ئێستا دەڵێن ئەگەر دوو کەس یەکتریان بە دڵ بێت هەڵی دەگریت و دەیبات بەڵام بۆ دەیبات بۆ لە خۆی مارە ناکات خێرا.

پاشان بە نەمانی ئەم ئایینە و مەراسیمەکانی کورد ڕزگار بوو، بەتایبەت لاوانی کورد بە کچان و کوڕانیە وە لە دەست بە قوربانی کردن، چونکە ئەگەر ئاتەشگایەکی تازەی زەردەشتی بکرایەتەوە دەبوو کچێك بکرایەتە قوربانی و پێشکەشی ئاتەشگەکە بکرایە خۆ ئەگەر کچێك دەست نەکەوتایە ئەوا کوڕێکی نابالغ یان دەکردە قوربانی (ئولاف ئوشیم) لە کتێبی مێژووی گەیشتن بە دەسەڵاتی خۆیدا باسی کردووە.

گەلی کوردی موسڵمان هەمیشە شانازی کردووە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە لە بەرئەوەی ئەوەندەی ئێمە سودمان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بینیوە ئەوەندە سوودمان لە هیچ بیروباوەڕێکی کە نەدیوە بە تایبەت نازانین ئێستای بیری زەردەشتی و لە پێشینەشدا چ خزمەتێکی بە میللەتەکەی من کردوە تا ئەو بیروباوەڕە جێگەی سەرنجی من بێت، تەنها ئێستا وەك قسەی زل یان ڕەق یان قسەی نەزۆك یان زۆڵەك دەیدەن بە گوێی میللەتەکەمدا کە تەنها دەیانەوێت داماڵینی ئەو کولتورە موسڵمانیەی گەلی کورد دابماڵن.

(مەودودی) دەڵێت: ئێمە ناتوانین هیچ شتێك بە زەردەشت بڵێین وەك موسڵمان، لەبەر ئەوەی ئەگەر پەیامبەر بووبێت ئەوە پەیامی پەیامبەرێتی تەواو بووە کۆتایی پێ هاتووە، خۆ ئەگەر فەیلەسوفێکیش بووبێت وەك زۆربەی فەیلەسوفەکانی تر ئێمە سوودی لێوەردەگرین.

## بەهائییەکان بناسە

بیروباوەڕی بەهائییەکان وایە : کە- بەهاء- دامەزرێنەری ئەم بیروباوەڕە هەموو شتێکی دروستکردووە بە وشەیەی کە دەیڵێت، بڕوایان وایە کە خوا تێکەڵ بوو لەگەڵ ڕۆح و لاشەی بەهائی دامەزرێنەری ئەم گروپە، بڕوایان وایە کە سزا و پاداشت تەنها بۆ ڕۆحە.. ئەویش لە شێویەکی نیمچەخەیاڵیدا باسی لێوە دەکەن.

### مێژووی دروست بوونیان و پێگەیشتننیان:

دامەزرێنەری ئەم بیروباوەڕە کەسێکە بەناوی «حوسێن عەلی» یە؛ لە دایکبووی ئێرانە لە لادێیەك لەو وڵاتە لە دایك بووە ناسراوە بە (بەهاء) لە مانگی ١١ نۆڤەمبەری ساڵی ١٨١٧ ز لە دایك بووە کە بەرانبەرە بە ٢ محەرەمی ساڵی ١٢٣٣ کۆچی.

ئەم پیاوە لەسەرەتاوە لە لای باوکی فێری خوێندەواری بووە و خوێندوویەتی.. لە هیچ قوتابخانە و دانشگایەکی سەردەمی خۆی یاخود لای هیچ زانایەك لەو سەردەمدا نەیخوێندوە، بەڵکو – هەمیشە لەگەڵ باوکیدا خەریکی کاری ماڵ و ماڵداری بووە وەك کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، بەڵام خۆی دەستی کردووە بە خوێندنەوەی کتێب و لێووردبوونەوە لە کتێبەکان و زۆرێك لە پەرتوك و نووسراوەکانی ئەو سەردەمی خوێندۆتەوە، بەتایبەت لە کتێبی صۆفی و شیعەگەراکان، پاشان خۆشەویستییەکی زۆری هەبووە بۆ نووسینەکانی گروپی ئیسماعیلی، لە دواییدا زیاتر گرنگی داوە بە فەلسەفەی کۆن، کاریگەری زۆری بوزا و زەردەشتی لەسەر بووە.

ئەم پیاوە کە ناسراوە بە حوسێن لە لاوێتیدا لە ناو بانگەوازی "بابەیەکاندا» بووە خۆی لە ناو بانگەشەی ئەواندا دۆزیوەتەوە، لەناو ئەواندا کاری کردووە، بابەیەکانیش بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك کەناوی «عەلی محەممەد شیرزای: بووە ناسراوە بە «باب» کە بانگەشەی پەیامبەرایەتی دەکرد بۆ خۆی و خەڵکی زۆری لە دەور کۆببوویەوە لە باطنیەکان، ئەوانەی کە نەزان و جاهیل بوون زیاتریش ئەوانەی کە زۆر دەمگیربوون بۆ شیعەی باطنی.. لەدوای لە سێدارەدانی عەلی محەممەد شیرازی لەساڵی ١٨٥٠ز بەهۆکاری کاری فەساد و گەندەڵی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی زشت (ناپەسەند).. ئەوکەسەی کە ناسراوە بە حوسێن عەلی خۆی ناونا بە «بەهائو اڵڵا « و وتی: من جێگری عەلی محەممەد شیرازیم، لەمەودواوە پەیام بۆ من هاتووە ڕوحی خوایەتی تێکەڵ بە من بووە کە ناسراوە بە حلول.. لەدوای ئەوەی بەهائیەکان وردەوردە خەڵکێکی نەزانو جاهیلیان لە خۆیان کۆکردوە وەك زانای پایەبەرز ئیحسان ئیلاهی زاهیری دەڵێت: ئەمانە هەرگیز باسی بیروباوەڕی خۆیان بۆ هیچ کەس ناکەن، کە نزیك دەبنەوە لە خەڵکی سەرەتا بە ئیسلامەتی دەست پێدەکەن ئەگەر مەسیحی بێت بە مەسیحیەتی قسەی لەگەڵ دەکەن وەهەروەها.. خیلافەتی ئیسلامی عوسمانی ١٨٦٨ ز لە ناوچەکانی خۆیدا ئەم پیاوەی دەستگیر کرد بۆ ئەوەی واز لەم کارە زشت و خراپانەی بهێنێت دووری خستەوە بۆ ناوچەکانی « عەکا» ئەو ناوچانە جولەکە و یەهودییەکی زۆری تێدا نیشتەجێبوون، کە زانیان ئەم کەسە لە سەر بیروباوەڕی باطنی دوور خراوتەوە ڕێزیان لێگرت و زۆر بەدەمیەوە هاتن و پێشوازی باشی لێکرا لە لایەن جولەکەکانەوە، پارەیەکی زۆریان بۆ کۆکردەوە، لە ڕووی ئەمنی و ئاسییشەوە دەیانپاراست، لەوکاتەوە بە هاوکاری یەهودییەکان لە شاری عەکا بوو، بۆ

دواجار بارەگای سەرەکی بانگەشەی بەهائییەکان لەوێوە سەرچاوەی گرت. لەدوای ئەوەی کە هەستی بە هێمنی و ئەمانی تەواوەتی کرد و بانگەوازە پیسەکەی پەرەپێدا لە ڕێگای یەهودەکانەوە...بەوە نەوەستایەوە تەنها داوای پیغەمبەرایەتی بکات، بەڵکو- داوای خوایەتی کرد وتی من خوام و بە هەتاهاتایی دەمێنمەوە، بەڵکو - ئەم کە بەهائییە ڕۆحی خوایە و بووە بە خوا!، ئیتر لەمەودوا ئەو پێغەمبەر دەنێرێت و ئایینەکان بۆ سەر زەوەی ڕێکدەخات..!

بەهاء – دەستی کرد بە دانانی بەندایەتی بۆ خەڵکی.. وایکرد لە ڕۆژێکدا خەڵکی سێ جار نوێژ بکات، هەر نوێژێکیش سێ ڕکعاتە، پاشان نوێژی جەماعەتی نەهێشت، تەنها مەگەر بە جەماعەت لەسەر مردوو نوێژ بکەن.. دەستنوێژی کورتکردەوە تەنها بۆ دەمو چاو دەستەکان بشۆیت و لەگەڵ دوعایەکی کورتدا، حەجیش بۆ شاری عەکا خەڵکی ڕووبکەنە ئەو شارە، فەرزی کرد لەسەر پیاوان بۆ ئافرەتیش بە گوێرەی توانا، هیچ کات و زەمانێکی دانەنا بەڵکو هەمووکات دەتوانن حەج بکەن لە عەکا و مەوسمی نیە! بێجگە لەو هەموو خورافات شتی زشت و هیچو پووچانەی کە دایمەزراند کە هەمووی قسەی شەیتانی و جاهیلانە بووە، هەموو ئەم شتانەی کە داینا و لە کۆتاییدا بەم بانگەوازە پیسەی.. وتی جیهاد هیچ مانای نیە کۆتایی هاتووە، جەنگی بە هەموو شێوەیەك حەڕام کرد، کە دیارە ئەم پرۆژەیەش هەر لەسەر پرۆژەکانی داگیرکەری ئیستیبدادی و ئیستعماری بۆی دارشتبوو لەلایەن ئینگلیزەوە..!

بەهاء- کۆمەڵێك کتێبی بۆ شوێنکەتووانی بیروباوەڕکەی.. لە دوای خۆی بە جێهیشتوە لەوانە (الإيقان)و (مجموعة اللوائح المباركة) و(الأقدس) جا ئەم کتێبی ئەقدەسەی یەکێکە لە کتێبە ترسناك و سامناکەکانی کە

لەدوای خۆی بە جێیهێشتوە، لێرەدا باس لەوە دەکات هەموو ئایینە ئاسمانی و کتێبەکانیان کۆتایی پێهاتووە، لەسەرو و هەمووشیانەوە قورئان..!

**بیروباوەڕی بەهائییەکان :**

بیروباوەڕی بەهائییەکان وایە کە تەنها بڕوایان بە بەهاء هەیە کە خوایە و دروستکەری ئەم بوونەوەرەیە لە دەربڕینی وشەکانیدا هەمووشتێك دروست دەکات، بڕوایان وایە خوا تێکەڵ بوو بە بەهائی دامەزرێنەری ئەم گروپە پیسە، هەروەها بڕوایان وایە کە ڕۆحی مرۆڤەکان پاداشت و سزا وەردەگرێت لە دوای مردن..

لای بەهائییەکان ژمارە ١٩ زۆر پیرۆزە، ژمارەی مانگەکان لای بەهائیەکان ١٩ مانگە.. ژمارەی ڕۆژ لای ئەوان تەنها ١٩ڕۆژە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی بوزاو زەردەشت هەیە، هەموو ئەو ئایینانانەی کە لە چین و هیندستاندا هەیە.. بڕوایان پێیەتی، بە هیچ شێوەیەك بڕوایان بە فریشتە و و پەرییەکان نییە واتا (مەلائیکەت و جنۆکە) بڕوایشیان بە هیچ شێوەیەك بە موعجیزەی پێغەمبەران نیە، بڕواشیان بە ئاگرو دۆزەخ و بەهەشت نیە، هەروەها حەرامیان کردووە حیجاب کردن لەسەر ئافرەت، موتعە و ڕابواردن لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا بێت بەرەزامەندی هەردوولا حەڵاڵە، ئافرەت توانای موڵکایەتی هەیە لەئایینی ئەماندا.

بەهاء – لە کۆتایی تەمەنیدا شێت بوو، نەخۆشی شێتی گرت، لە ٢ مانگی زیلئەقدە ساڵی ١٣٩٠ کۆچی بەرانبەر بە ٢٩ مانگی مایی ساڵی ١٨٩٢ زایینی بە هەلاکەت چوو مرد، لەدوای خۆی کوڕەکەی بەهائی بەناوی عەباس کەناسراوبوو بە بەندەی بەهاء بووە جێنشینی باوکی.

عەباسی بەهائی دەستی کرد بە بانگەوازی بەهائییەکان، بەشداریکرد لە کۆنگرەی سەهیۆنی «بال» لەساڵی ١٩١١ ز.. لە سویسرا، هەر ئەو دەمە جەنەڕاڵێکی ئینگلیزی بەناوی» نەبی» پێشوازی لێکرد کە چووە فەڵەستین ئەو دەمە ئینگلیز داگیری کردبوو، پێشوازی گەرمی لێکرا؛ لەگەڵ ئەوەشدا بەریتانییەکان زۆر ڕێزیان لێگرت و دیاری زۆریان پێشکەش کرد و ناو و پلەی گەورەی درایە و لەو لەقەبانەی کە (ناسناو) پێبەخشرا ناونرا بە «گەڕۆکی خێرا» زۆرێك لە وڵاتانی دوونیا چووە، وەك لەندەن، ئەمریکا، ئەڵمانیا و مەجەر و نەمسا و ئەسکەندەریەی میسر و زۆرێك لە بانگەشەکانی لە وڵاتی ئیسلامیدا بوو، پاشان لە شاری شیکاغۆ گەورەترین سەنتەری بەهائی دامەزراند، چووە قاهیرەی لە میسر لەوێ ئەویش بەهەلاکەت چوو، واتا عەباسی کوڕی بەهائی لە ساڵی ١٩٢١ ز.. بەرانبەر بە ١٣٤٠ ك کۆتایی بە ژیانی هات. لە دوای خۆی عەباسی بەهائی کوڕەکەی خۆی لە دوای خۆی کردە جێنشین بە ناوی ” شەوقی ئەفەندی» کە ئەو دەمە تەمەنی ٢٤ ساڵ بوو، هەر وەك باوکی بوو لەسەر مەنهجی باوکی بوو هەمیشە بانگەشەی بۆ ئەم بیروباوەڕە زشتە دەکرد، ئەویش لە شاری لەندەن بە نەخۆشی دڵ بەهەلاکەت چوو، لە بەریتانیادا نێژرا و بە دیاری بەهائییەکان دایانە حوکومەتی بەریتانی بۆ ئەوەی خەڵکی بەهائی بێنە بەریتانیا بۆ زیارەتی گۆڕەکەی وەك خۆیان دەڵێن.

لە ساڵی ١٩٦٣ ز.. نۆ کەس لە بەهائیەکان کاروباری ئیداری و بانگەشەی ئەو گروپەیان گرتە ئەستۆ، ماڵێکیان ناونا بە ماڵی دادپەروەری بەهائییەکان.. کە پێکهاتبوون لە نۆ کەسە کە لە هەموو جیهانەوە سەرپەرشتیان دەکرد، چواریان لە وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکاوە

دووانیان لە ئینگلیز و سێ دانەشیان لە ئێرانەوە کاروباری ئەو گروپەیان گرتە دەست، بوونە خاوەن بڕیار لەناو بەهائیەکاندا.

**جێگای بڵاوبوونەوەیان :**

زۆربەی بەهائییەکان لە ئێرانەوە سەرچاوەیان گرتووە، پاشان کەمێکیشیان لە عیراق و سوریا لوبنان و فەڵەستینی داگیرکراو، کە ئێستا بارەگای سەرەکیان لەو وڵاتەیە.

**دەرنجام :**

لە ئیسلامدا ئەم گروپە بە سەرلێشیواو و گومڕاو و دەرچوو لە ئیسلام هەژمار دەکرێن، ئەزهەر لە ساڵی ١٩٦٠ فتوای داوە کە ئەمانە کافرن، لە لەچەند ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا لەگەڵ بەهائییەکاندا توانراوە بیروباوەڕیان هەڵبووەشێنرێتەوە، زیاتر نزیك لە بیروباوەڕی شیعەی ئیسماعلی باطنی و هەندێك لەبیروبۆچوونی شیعەی دوانزە ئیمامیشیان تێکەڵ بە بیروباوەڕکانیان کردووە، بڕوایان بە حلول هەیە.. لە کۆتاییدا ئەمانە بە هەموو پێوەرێك لە ئیسلامدا دەرکراون، موسڵمانان بە گشتی بە ئەهلی کوفرو گومڕایان دەزانن.

## ئەحمەدییەکان (قادیانییەکان) بناسە

هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ خەڵکی هیندستان ئاشنا ببوون بە ئیسلام لە ڕێگای بازرگانییان بۆ یەمەن و ئاڵوگۆڕی شتومەك و کەرەستەکانی نیوەدوورگەی عەرەبی.. تا سەردەمی محەمەد قاسم – ڕەحمەتی خوای لێبێت- ئایینی ئیسلامی بە تەواوەتی بردە ناو خاکی هیندستان.. هەڵبەت خاکی هیندستان بریتی بوون لە پاکستان و بەشێکی زۆری ئەفغانستانیش.. ناوچەکانی کرمان و تا دەگاتە تورکستان، پاشان موسڵمانان بەتەواوەتی دەسەڵاتیان لە هیندستاندا گرتە دەست لە ڕێگای سەرکردەی گەورە و داد پەروەر سوڵطان مەحمودی غەزنەوی – ڕەحمەتی خوای لێبێت- بە ئیسلام فەرمانڕەوای کرد، بێ ئەوەی هیچ کەسێك لە خەڵکی هیندستان بەزۆر موسڵمان بکات.. وازی لە خەڵکی هیندستان هێنا بە ئازادی پیادەی ئایینی خۆیان بکەن..زۆربەیان لەسەر ئایینی باوباپیری خۆیان مانەوە، وەك ئایینی هندۆس و بوزی و بەرهەمی، هیندستان لەوکاتەوە لە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوای موسڵماناندا بوو تا هاتنی داگیرکەری بەریتانی کە بەئاگر و ئاسن حوکمی کرد لە ڕێگای کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانەوە.

گومانی تێدا نییە موسڵمانان باشترین بەرگریان کرد لە خاك و دینیان دژی داگیرکەری بەریتانی، دوای ئەوەی بەریتانیەکان تێگەیشتن لەوەی کە ئایینی ئیسلام هۆکاری سەرەکیی و بنەمای هەموو ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی ناو هیندستانە دژی داگیرکەری بەریتانی، دوای لێکۆڵینەوە و لێووردبونەوە لە بیروباوەڕی ئیسلامی.. ویستی ئەم بیروباوەڕە بشێوێنێت بە هەر شێوەیەك

بووە، کێشە لە نێوانی موسڵمانان دروست بکات و نفوزی موسڵمانان لە ناوچەکەدا لاواز بکات، پاشان ئیدارەی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتەدا هەڵسا بە هاندانی بیروباوەڕی دەستکاریکراو و (زشت) لەناو شەریعەتی ئیسلامیدا.. کتێبیان نووسی ناپەسەند بە ساختە و هەموو جۆرە قسەیەکی بێمانا و خورافییان تێدا بڵاودەکردەوە، بەردەوام خەریکی ئەم کارانە بوون تاگەیشتە ئەوەی گروپێك دروست بکەن بەناوی بانگەوازی قادیانی.

### قادیانی چییە؟

دێیەك هەیە ناوی- قادیانە- لە – بنجابی- ئێستای پاکستان، پیاوێك لە دایك بوو بەناوی (غوڵام ئەحمەدی قادیانی) لە ساڵ (١٨٣٩) زاینی.. بەرانبەر(١٢٦٥)کۆچی، ئەم کەسە دامەزرێنەری ئەم گروپەیە بەناوی قادیانی یاخود ئەحمەدی.. ئەم پیاوە کە ناوی ئەحمەد قادیانییە لە خێزانێکی بەناوبانگ لە ناوچەکەدا کە ناسیویانن بە خیانەت و دەستتێکەڵکردن لەگەڵ ئینگلیزدا، بەوە ناسراو بوون کە هەمیشە خیانەتیان لە دین و نیشتیمانیان کردوە، غوڵام ئەحمەد لە ناو ئەم خێزانەدا ئینگلیز هەڵیبژارد و پەروەردەی کرد لەناو خەڵکیدا گەورەکراو تا موسڵمانانی لێکۆبوویەوە، سەرەتا بەناوی جیهاد و دژی داگیرکەر و دوایی دەرکەوت کە بەریتانیا دەستی خێری زۆری هەبووە بۆ خانەوادەکەی، دوایی دەرکەوت خۆی وەلائی هەیە بۆ ئینگلیز.. خەڵکیش ئەیناسی کە پیاوێکی مەزاجی و نەخۆشە و پاشان ئالودەیە (مودمینە) بە مادده هۆشبەرەکان.

سەرەتا غوڵام ئەحمەد دەستی کرد بە بانگەوازی ئیسلام و بەرگریکردن لە ئیسلام ئەوەی قسەی بە ئیسلام دەوت یاخود دەیوست ڕووبەڕوی ئیسلام بوەستێتەوە بە شێوەیەکی زۆر توند ڕووبەڕوی دەبوویەوە..

ئەحەمەد قادیانی بەم شێوەیە بەردەوام بووە لە بانگەواز کردنی بۆ ئیسلام تا ماوەیەکی زەمەنی دوور و درێژ، لەناوچەی خۆیدا زۆر خۆشەویست بوو، خەڵکی لە دەوری کۆبوبییەوە، ئینجا دوای ئەوە وتی من لای خواوە ئیلهامم بۆ دێت..! بەردەوام لە ناو خەڵکیدا خۆی و ئەوانەی لە دەوروپشتی بوون دەیان وت ئەحمەد قادیانی نوێکەرەوەی دینە، هاتنی ئەحمەد قادیان لەم سەدەیەدا ئەو موجەددیدە، پاشان بەوەوە نەوەستا قادیانی ناوی لە خۆی نا مەهدی چاوەڕوانکراو (مهدي المنتظر) بەم ناوەشەوە بانگەوازێکی قادیانی بوو بۆ ناو شیعەکان.!

هەروەها ئەحمەد قادیانی بەم ڕەفتار و کردارانەیەوە نەوەستا پلانی دانا بۆ ئەوەی بگاتە ئەوەی بڵێت : ڕۆحی مەسیح – سەلامی خوای لێبێت- تێکەڵ بووە بە لاشەم.. جا لێکۆڵەرەوان پێیان وایە ئەم پیلانە کە ئینگلیز کێشاویەتی، پاشان بانگەشەی ئەوەی کرد کە شوێن ڕۆحی پێغەمبەری خوا - صلى الله علیەوسلم – کەوتوە و تا تێکەڵ ببێت بە ڕۆحی غوڵام ئەحمەدی قادیانی.

**بیروباوەڕی قادیانی :**

قادیانیەکان بیروباوەڕیان وایە خوا بەرۆژوو دەبێت و نوێژیش دەکات، ئەخەوێت و لەخەو هەڵدەستێت، پاشان دەڵێن خوا دەخوێنێتەوە و دەنووسێت – پەنا دەگرم بە خوای موتەعال لەو قسە بێمانایانەی دەیکەن- ئەحمەد قادیانی بە ئاشکرا ڕایگەیاند خوا ئینگلیزە و بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکات و بانگی خەڵکی دەکات.!!

هەروەها قادیانییەکان پێیان وایە: لەدوای پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله علیه وسلم) پێغەمبەری تر دێت، واتا محمد صلى الله علیه وسلم.. خاتەمی پێغەمبەران نییە، بەڵکو بەردەوام پێغەمبەر دێت، بیروباوەڕیان

وایە: خوای گەورە پێغەمبەر دەنێرێت بە گوێرەی پێداویستی، پاشان غوڵام ئەحمەد باشترین پێغەمبەرە لە ناو هەموو پیغەمبەرەکاندا..! پاشان جوبریل سەلامی خوای لێبێت هاتووە بۆ لای غوڵام ئەحمەد قادیانی، پاشان وەحی بۆ هاتووە لە لایەن پەروەردگارەوە، پاشان وەحییەکەی وەك قورئان بووە، بەڵام ئەو ناوی ناوە بە کیتاب و لموبین(کتاب المبین). پاشان پێغەمبەرەکەیان لە قادیانەوە وەحی بۆ هاتووە ئەو دێیە کە ناوی قادیانە وەك مەککە و مەدینە وایە، بەڵکو فەزڵی زیاتریشە، خاکەکەشی خاکێکی حەڕام کراوە، واتا دەبێت بە ئیحرامەوە خەڵکی بچێتە ناوی.. قیبلەیە و بۆ کاتی حەج دەبێت ڕوو لەوێ بکەن، هەرکەس شوێنی قادیانی نەکەوێت ئەوا کافرە.

پاشان ئامانجی بنەڕەتی لەم هەموو گوفتار و ڕەفتارانەی غوڵام ئەحمەد.. کە هەر لە سەرەتاوە داگیرکەری بەریتانی پشتگیری لێکردووە هەموو سەروەت و سامانێکی خستۆتە بەردەستی، لە بەر ئەوە بوو کە جیهادی حەڕام کرد و جیهاد حەڕامە لە ناو ئایینی قادیانیدا، داوا دەکات بە دواکەوتنی بێ پرسیارکردن و شوێنکەوتنی ئینگلیز و دەسەڵات و حوکومەتەکەی، چونکە وا نیشانیان داوە کە بەریتانیا وەلی ئەمری موسڵمانان و قادیانیەکانە بە دەقی قورئان.

**کەسایەتیە ناسراوەکانی ناو قادیانیەکان :**

غوڵام ئەحمەد قادیانی لە ساڵی ١٩٠٨زایینی بە نەخۆشی طاعون بەهەلاکەت چوو، پاشان زۆربەی خەڵکی ئاواییەکەیان کە ناوی قادیانە بەو دەرد و نەخۆشییە لە ناو چوون، وەك ئەوەی کە خوای گەورە ڕسوای بکات پێشتر خەڵکی لەوە دڵنیا دەکردەوە کە بە هیچ شێوەیەك ناوچەی

قادیان و.. خەڵکی قادیانی تووشی نەخۆشی طاعون نابن گوایە وەحی ئیلاهی بۆ هاتووە لە لایەن خواوە لە کتێبێکیدا بە ناوی (کتاب التبلیغ) باسی کردوە خوای گەورە حەڕامی کردووە لەسەر خەڵکی قادیان.. کەچی خۆشی بە طاعون مرد، خوای گەورە بەدرۆی خستەوە.!

لە کتێبە بەناوبانگەکانی ئەحمەد قادیانی نووسیویەتی بریتیە لە : (کتاب التبلیغ) و (کتاب تجلِّیات إلاهیّة).

لە دوای مردنی ئەحمەد قادیانی گروپەکەی بوون بە دوو بەشەوە؛ بەشێکیان وتیان گوایە پێغەمبەرێکی نێرراوە، کە ئەم گروپەیان درێژکراوەی قادیانیەکانن، کۆمەڵێکی تریان وتیان ئەمە پیاوچاکی خوایە و وەلی خوایە، ئەم کۆمەڵەش ناویان لێنراوە بە ئەحمەدییەکان.

پاشان دوای مردنی ئەحمەد کوڕیکی بەناوی نورەددین دوای باوکی دەسەڵاتی قادیانیەکانی گرتە دەست و خۆی ناونا بە خەلیفەی موسڵمانان و تاجی خەلافەتی بەدەستی ئینگلیز کرایە سەر، خەڵکێك لە دەروێش و موریدەکانیان شوێن نورەددین کەوتن، پاشان لە دوای خۆی نورەددین لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە کەسێکی کردە جێگری خۆی بە ناوی عەلی ڕەزا.. دوای مردنی ئەویش کەسێکی تر چووە جێگای عەلی ڕەزا بەناوی بەشیر ئەحمەد، ئەم بەشیرە کەسێك بوو لە وانەی کە زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە غوڵام ئەحمەد قادیان پێغەمبەر بووە، ئەوەی نەیوتایە پێغەمبەرە دەیگرت و زیندانی دەکرد یاخود دەیکوشت.

بەشیر کتێبێکی نووسی بە ناوی ڕاستییەکانی پێغەمبەرایەتی(حقیقة النبوة) لەو کتێبەدا باس دەکات کە غوڵام ئەحەمەد باشترین پێغەمبەری هەموو پێغەمبەرانە. نمونەی ئایەتی قورئانی هێنایەوە کە گوایە محمدیش

ﷺ بڕوای وابووە کە پێغەمبەرێك دێت بەناوی ئەحمەد نمونەی ئایەتی قورئانی دێنەوە (وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ} ﴿٦﴾ الصف.

هەروەها بۆ یەکەم جار (ظەفەرخان) قادیان بووە یەکەم وەزیری دەرەوەی پاکستانی دەسەڵات و پۆستو مەقامیان پێدرا لە ناو حوکومەتی پاکستانیدا، پاشان حوکومەتی پاکستانی هاوکارێکی باشی ئەم دەسەڵاتە گومڕا و سەرلێشێواوە بوو، پاشان سەنتەرێکی گەورەی تایبەتیان بۆ کرایەوە لە هەرێمی بنجاب بە ناوێکی قورئانی (وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رِبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ) ﴿٥٠﴾المؤمنون.

**ئەو جێگا و شوێنانەی کە قادیانیەکانی تێدا بڵاون :**

قادیانیەکان زۆربەیان لە هیندستان و پاکستانن، کەمێکیشیان لە ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی بڵاون، بانگەوازی قادیانیەکان و چالاکیان لە ئیستادا لە کیشوەری ئەفریقا زۆر بەهێز و بەرفراوانە، هەروەها لە زۆربەی جێگاگانی تری دونیادا بەربڵاون تەنانەت لە کوردستانیشدا بوونیان هەیە و خەڵکانێك بانگەشە و بانگەواز دەکات بۆ ئەم ئایینی قادیانیە، دیاریشە کە دەستێکی داگیرگەری لە پشتییەوەیەتی، ئەم گروپە بە دڵنیاییەوە حوکومەتی ئینگلیزی سەرپەرشتی دەکات و پەروەردەیان دەکات، دامەزراندنیان لە هەموو جێگا و پۆستە حوکومەیەکاندا تەنانەت لە کۆمپانیاکاندا زوو دادەمەزرێن، زۆربەشیان وەك ئەفسەری دەرەجەدار واتا(ظابط) لە موخابەراتەکاندا لە ئیسرائیل و بەریتانیاو ئەمریکا کار دەکەن بە دڵسۆزی بۆ ئەو وڵاتانە.

قادیانیەکان هەموو جۆرە چالاکیەك دەکەن بۆ بڵاو بوونەوەی بیروباوەڕەکەیان، بەتایبەت بەڕای ڕۆشنبیران، زۆریك لە زانا و پزیشك و ئەندازیاریان لەگەڵدایە بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی، هەروەها لە بەریتانیا خاوەنی کەناڵێکی ئاسمانین بەناوی کەناڵی ئاسمانی ئیسلامی کە ئیدارەکەی قادیانەکان دەیبەن بەڕێوە.

**دەرئەنجامی باسەکەمان»**

لە سەرەتایی ئەم بانگەشەیەوە زانایانی ئەهلی سوننەت ڕووبەڕوی وەستانەوە هەرچی درۆ و دەلەسەکانی بوو بۆ خەڵکیان شیدەکردەوە، لەبارەی ئیلهام و وەحی..

ئەوەی کە بەرانبەر ئەم بانگەوازە پیسە وەستایەوە «شێخ ئەبو وەفا سەنائو الله تەیسیری» بوو کە گەورە و لێپرسراوی زانکۆی ئەهلی فەرمووده بوو لە هیندستان، داوای مونازەرە و ڕووبەڕوبوونەوەی کرد لە ئەحمەد قادیانی، دوای دانیشتنێکی دوور و درێژ هەموو بەڵگەکانی ئەحمەد قادیانی بە درۆ خستەوە، شێخ ئەبو وەفا بە درۆزن ناساندنی، هەتا مردیش خەڵکی هەر بە درۆزن ناویان دەبرد..

لەسەر ئاساتی جەماوەریش لە پاکستان شۆڕشێك کرا لە ساڵی ١٩٥٣زاینی دژی ظەفەرخان کە ئەو دەمە وەزیری دەرەوەی پاکستان بوو، بەوەی دەبێت لە کارەکەی لابرێت، بەو ئیعتیبارەی قادیانیەکان کەمینەن نابێت بەسەر زۆرینەی موسڵمانان حوکمڕانی بکەن.. هەر لەو شۆڕشەدا زیاد لە دە هەزار کەس شەهید کران تاکو توانیان قسەکەی خۆیان بسەپێنن بەسەر حوکومەتدا، بە لە کارلابردنی وەزیری دەرەوەی پاکاستان.

هەروەها.. مەجلیسی ئوممەتی پاکستانی هەڵسا بە سازدانی موناقەشەیەك و ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ گەورەی گروپی قادیانیەکان کەماوەی ٣٠ کاتژمێری خایاند، ناصر ئەحمەد دەستەوەسان کەوتوبوو لە بەردەم پرسیارەکاندا توانای وەڵامدانەوەی نەبوو، ئیتر لەوێیەوە دەستەکەیان ئاشکرا بوو دەمامکییان لەسەر لاچوو بە ئاشکرا دانیان بە کوفری خۆیاندا نا هەر لەو مەجلیسەدا بەیاننامەیەك دەرکرا بەوەی کە ئەم گروپە هیچ پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نیە.. گروپێکی کافر و بێبڕوان بە ئیسلام، پاشان بە کەمینەیەك ناساندیانن وەك گروپی قادیانی لە پاکستان.

پاشان ڕابیتەی ئیسلامی جیهانی لە کۆنگرەیەکی بەرفراوانیدا لە ساڵی ١٩٧٤زاینی لەشاری مککەی پیرۆز کە نوێنەری هەموو وڵاتانی ئیسلامی تێدابوو، لەو کۆنگرەیەدا بە ئاشکرا و بێپەردە و بە ڕاشکاوانە ئەم گروپەیان کافر کرد و وتیان هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە لە ئیسلام دەریانکردن.. بە کۆڕای زانایانی هەموو جیهانی ئیسلامی، بەڵکو داواکرا بەوەی کە هیچ مامەڵەیەکیان لەگەڵ نەکرێت و تەنانەت نابێت لە گۆڕستانی موسڵمانان‌دا مردوویان بنێژرێت.. گومانی تێدانییە ئەوەی کە قادیانیەکان دەیڵێن ڕێك پێچەوانەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی ﷺ وە یاخود ئەوەی موسڵمانان لەسەری کۆبوونەتەوە کە بە ئومەتی موحمەد هەژمار دەکرێن، لەسەروو هەمووشیانەوە ئەو بانگەشە شازەی کە بانگەشەی بۆ دەکات گوایە مەسیحی کوڕی مەریەمە..! یەکێك لەو بانگەشانەی کە دەیکرد حوکومەتی ئینگلیز هاوکاری دەکرد، گوایە ئەم یەکێك لە موعجیزەکانی ئەوەیە دەزانی کەی ڕۆژ دەگیرێت یاخود کەی مانگ دەگیرێت، لەکاتێکدا ئەوە بۆ ماوەی دوو سەدەیە زانایان زۆر بە ئاسانی دەزانن ئەو حاڵەتە کەی ڕوو ئەدات.

## شەری هەڵگەڕاوەکان بزانە و بناسە

لەدوای کۆچی پێغەمبەر ﷺ زۆربەی زۆری جەزیرەی عەرەب مورتەد بوونەوە واتە لە دینی ئیسلام وەرگەڕان، یاخود بڵێین پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، تەنها سێ شوێنی نەگرتەوە ئەویش (مدینەی منەورە، مەککەی موکەرەمە، طائف، دێیەك بەناوی جواثی لە بحرین)، بەڵام خوای گەورە منەتی خۆی کرد بەسەر موسڵمانان ئەویش ئەوە بوو لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ئومەتی دایە دەست ئەبوبەکری صدیق کە فیتنەی کافر و هەڵگەڕاوەکان ڕابماڵێت، کە ئەمەش موعجزەیەکە خوای گەورە بەخشیویەتی بەم پیاوە بەڕێزە بۆ ئەوەی بزانین چۆن ئەو دەسەڵاتەی گرتە دەست و بەرامبەر هەموو هەڵگەڕاوەکان و کافرەکان کە لەدوای وەفاتی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ وەستا و وتوانی ئەو بار و ڕەوش و هەلومەرجە ئارام بکاتەوە.

جزیرەی عەرەب لەسەر ئاستی گشتی هەموو پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام لەبەر چەند هۆکارێك بوو، هەندێکیان ئەیان وت زەکات نادەین، بەڵام بڕوامان بە هاتنی محەممەد ﷺ هەیە و بڕوامان بە نوێژ و ڕۆژو و ئەرکانەکانی ئیسلام هەیە، بەڵام لە زەکاتداندا بمانبەخشن، هەروەها کۆمەڵێك لە عەرەبەکان وتیان نا بەتەواوەتی واز لە ئیسلام ئەهێنین، محەممەد بەتەنها بناغەی ئەم دەوڵەتەی دامەزراند و لەدوای نەمانی محەممەد ئەم دەوڵەتە ڕووخاو ئێمە دەست ئەکەینەوە بە پەرستنی بتەکانمان، بەتایبەتی عەرەبەکانی (بەنی حەنیفە) کە ژمارەیان ١٠٠هەزار کەس بوو. دەستیان کرد بە پەرستنی بتەکانیان، کۆمەڵێکی تر لەناو

عەرەبدا پەیدا بوون کە بانگەوازیان بۆ پێغەمبەرایەتی خۆیان دەکرد لە بەناوبانگەکانیان (مسیلمة الحنفي الكذَّاب، الأسود العنسي، طليحة بن خويلد، سَجَاح ) بوون.

## هۆی ڕووداوی هەڵگەڕاوەکان (مرتد) کورتەی باس»

پێش هەموو شتێك بۆ ئەوەی بزانین لە کاتێکدا کە زۆربەی زۆری عەرەب لە سەردەمی جاهیلیەتدا بوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەیامەکەیەوە هات و ڕووداوی پێغەمبەرایەتی خۆی بۆ خەڵکەکە ڕوون کردەوە کە لەماوەی ٢ ساڵدا خەڵکی زۆر هاتە ناو ئەم ئیسلامە، لەماوەی ساڵی (وفود) و سەرەتای جەنگی (موئتە)، خەڵکێکی زۆر ڕوویان کردە ئەم ئیسلامە، لە ڕاستیدا ئەم ئیسلامەش لەلای خەڵکی بە شێوەیەکی سروشتی وەریان گرتبوو، خەڵکێك کە هاتنە ناو ئەم ئسیلامەوە بە هۆکاری هێز و توانای موسوڵمانان سەرسام ببوون، هەروەك لە جزیرەی عەرەبی موسڵمانان توانیان کۆنترۆڵی بکەن بەسەریاندا..

ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی زۆرێك لە خەڵکی موسڵمان ببن، هەندێك کەسیان هەبوو بۆ سەروەت و سامان ئیسلامیان وەرگرت، چونکە ئیسلام لەشەڕ و جیهادابوو بە حوکمی ئەوەی لە شەڕەکانا سەرکەوتوو ببوون لەم ڕێگایەشەوە سەروەت و سامانێکی زۆر دەست موسوڵمانان کەوتبوو، هەبوو ئارەزوویان لە جیهاد و غەنیمەت بوو هەر بۆیە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، هەروەها کۆمەڵێکی تر هەبوون لە ترسی موسڵمانان هاتبوون، کە ئەو هەموو هێز و دەسەلاتەی موسڵمانانیان بینی مەعنەویاتی موسڵمانان بەرزبووەتەوە لە ترسا دەهاتە ناو ئیسلامەکەوە، هەروەها کۆمەڵێکی کە هەبوون بە هۆکاری ئەو کۆمەڵانەی سەرەوە نەبوون کە باسمان کردن

وەکو ئارەزووو و هێز و ترس و.....هتد، بەڵکو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەدواکەوتنی گەورەی عەشیرەت و زەعیم و سەرکردایەتی گەورەی گەل و هۆزەکانی خۆیان بوون بەو هۆیەوە هاتبوونە ناو ئیسلامەکەوە، وەکو دەمامکێك بوو بۆ ئەوان بۆ ئەوەی عەرەب بسازێنن لەگەڵ موسڵمانان.

کاتێك کە دەوڵەتی ئیسلام بەو شێوە گەورەیە دامەزرا، وایان زانی بە کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دەوڵەتە هەڵئەوەشێتەوە!، لەگەڵ ئەو شەپۆلە گەورەیەی کە وەك دەریا ڕژانە ناو ئیسلام.. بەڵام پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، لەم کاتەدا ئەبوبەکری صدیق (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت) هێزێکی سەربازی ئامادە دەکات بەسەرکردایەتی (ئوسامەی کوڕی زەید) بۆ لێدانی ڕۆم کە ئەمەش وەسیەتێکی پێغەمبەری خوا بوو پێش کۆچی دوایی. ئەمەش بە کرداری هاتە دی، سوپاکەی ئوسامە دەرچوو بەرەو دەوروبەری شام، کە زانیان پێغەمبەری خوا ﷺ ناردوونی وەسێتی سەروەرمانە.. بۆیە ئەبوبەکری صدیق ناردنیەوە و شەڕیان نەکرد، بەڵام کە گەڕانەوە کۆمەڵێك هۆزیان بینی کە هەڵگەڕابوونەوە، ئەم گەل و هۆزانە سەروەت و سامانێکی زۆریان دەست کەوتبوو و توانیان سەربکەون بەسەریاندا و بەخێرایی گەڕانەوە لای ئەبوبەکری صدیق بۆ مدینەی منەورە بە دەست کەوتێکی باش و سەرکەوتن لەو ناوچانەدا، پاشان ئەبوبەکری صدیق هێزەکانی دابەش کرد بە ١١ بەشەوە لە جەزیرەی عەرەبیدا، بۆ ئەوەی هێزی موسڵمانان هەڵگەڕاوەکان بترسێنێت کە لەو ناوچانەدا هەبوون، زۆرێك لە هاوەڵان داوای ئەوەیان کرد کە گرفت نیە باکۆمەڵێك لەوانە زەکات نەدەن، چونکە ئێستا زۆرێك لە دەوڵەتی ئسیلامی و دەوروپشتی لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ هەموو هەڵگەڕانەوە لە دینی ئیسلام وە کۆمەڵێکی کەم مابوونەوە لە

مەككە و مدینە و طائف، بەڵام ئەبوبەكری صدیق ڕازی نەبوو. پاسەوان و ئێشكگرێكی زۆری دانا لە دەوروبەری شاری مەدینە نامەی نارد بۆ هەموو هۆزەكان بە زمانێكی زۆر توندوتیژ و هەڕەشەی لێ ئەكردن و ئەیترساندن بە مەبەستی مانەوەیان لەسەر دینی ئیسلام و ئەگەر وانەبێ سوپا ئەنێرێت بۆ سەریان، بەڵام ئەبوبەكری صدیق(ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەیەك كاتدا سوپاكانی نارد بۆ هەموولاكان بە یەكسانی، وە ئەمانەش هەموو ئارەزوویان هەبوو كە جیهاد بكەن و خەبات بكەن لە پێناوی خوای گەورە، ئەم ١١هێزە توانی سەركەوتن بەدەست بهێنێت.

ئالێرەوە پوختەی باسەكەمان دەست پێ دەكات»

**پوختەی باس :**

بابزانین چۆن ئەبوبەكری صدیق (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم كارانە جێبەجێ دەكات كە لەو كاتەدا هەموو جزیرەی عەرەب هەڵگەڕاونەتەوە لە دینی ئیسلام و پاش كۆچی دوایی پێغەمبەری نازدارمان ﷺ ئەبوبەكری صدیق دێتە سەر شانۆی سیاسەت دەبێتە جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**كورتە باسێكی ئوسامە :**

پیش كۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەری خوا سوپایەكی ئامادە كردووە بەسەركردایەتی ( ئوسامەی كوڕی زەید) بۆ شەڕكردن بەرامبەر بە ڕۆم، ئەم سوپایە ڕۆیشتە دەرەوە لە نزیك شاری مدینە.. هەواڵی خۆشەویستمان بەوان گەیشت كە پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كردوە و سوپاكە گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، پاشان ئەبوبەكری صدیق

کرایە جێنشینی پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی ئەبوبەکر کرایە خەلیفەی موسڵمانان بڕیاریدا کە ئوسامەی کوڕی زەید بەهەمان هێزەوە بنێرێتەوە بۆ ناوچەکانی وڵاتی شام، لەم حاڵەشدا کودەتایەك بەسەر موسڵمانان‌دا کرا ئەویش کودەتای هەڵگەڕانەوە بوو واتە(مورتەد) بوونەوە، کە زۆربەی زۆری ناوچەکانی گرتبووەوە، لەم بار و ڕەوشەدا ئەبوبەکری صدیق سوپای ئامادە کردووە بچێتە دەرەوە، هەڵگەڕاوەکانیش ئەیانەوێ هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، لەهەمان کاتدا ڕۆمەکان خۆیان ئامادە کردووە لە شامەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، وە ئەگەر بێتو ئەم سوپایە بەشێوەیەکی ڕووکاری نەچێتە دەرەوە باشترە بۆ موسڵمانان، چونکە موسڵمانان ناتوانن بەرگری بکەن لەشاری مەدینە ئەگەر هێزی تێدا نەمێنێتەوە، بەڵام ئەبوبەکر سووربوو لەسەر ئەوەی کە ئەم سوپایەی ئوسامەی کوڕی زەید بنێرێتە دەرەوە بۆ ئەوەی بچێتە شام، هەرچەندە ئەیزانی شاری مەدینە زۆر نزیکە لە هەڵگەڕاوەکانەوە و هەرکاتێك بیانەوێ دەتوانن داگیری بکەن.

ئەبوبەکر سوپاکەی ئامادە کردبوو بەردەوام بوو لەسەر قسەی خۆی، موسڵمانانی ئامادە کرد لەو هەموو حاڵەتە ترسناکە هاوەڵە بەرێزەکان هاتنە خزمەتی وتیان تۆ چۆن ئەم هێزە ئەنێریتەوە دەرەوە لە کاتێکدا ئەمە بار و هەلومەرجی ئێمەیە، کە هەموو جزیرەی عەرەبی کافر بوونەتەوە و هەڵگەڕاونەتەوە و ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان نییە، تۆ ئەم هێزە ئەنێریتە دەرەوە ئەی کێ چاودێری ئەم شارە بکات؟ کێ چاودێری ناو وڵات و پاتەختی موسڵمانان بکات؟، لەم کاتەدا ئەبوبەکری صدیق (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) قسەیەك دەکات کە دەبوو بە نور وشەکانی بنووسرایەتەوە ئەویش فەرمووی (والله لا أحلُّ عقدةً عقدها ڕسول الله،

ولو أن الطير تخطفنا، والسباع من حول المدينة، ولو أن الكلاب جرت بأرجل أمهات المؤمنين لأجهزَنَّ جيش أسامة) واتە : (بەخوا گرێیەك ناكەمەوە كە پێغەمبەری خوا بەستبێتی، هەتا ئەگەر باڵندەش بمانفڕێنن و شێر لە چواردەوری مەدینەدا بن، سەگەكانیش پێیەكانی دایكی موسڵمانان ڕاكێشن، سوپای ئوسامە ساز دەكەم)

سوپاكەی ئوسامەی كوڕی زەید دەرچوو، هاوەڵەكان بێ دەنگ بوون لەئاستی ئەدەبی ئەبوبەكری صدیق.. هاوەڵە بەڕێزەكان بۆ جاری دووەم هاتنە لای ئەبوبكر، عومەری كوڕی خەتاب (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە ئەبوبەكری صدیقی وت: (ئەگەر بكرێ سەركردەیەكی تر دابنرێت غەیری ئوسامەی كوڕی زەید) لەبەر ئەوەی ئوسامەی كوڕی زەید مناڵە، لەو كاتەدا لەتەمەنی ١٧ و ١٨ساڵیدا بووە، عومەر داوای كرد كە سەركردەی زۆر بەهێزی كەمان هەیە كە زیاتر دەسەڵاتی هەیە، لەبەر ئەوەی ئەم كارە قورس و زەحمەتە. پاشان ئەبوبەكری صدیق توڕە دەبێ و سبحان الله ڕیشی عومەری كوڕی خەتاب دەگرێ و پێی ئەڵێ : «ثكلتك أمُّك يابن الخطاب! أمنع أميرًا أمَّرَهُ رسولُ الله عن إمارة جيشه؟!»

واتە: ئەی كوڕی خەتتاب ڕێگری لەوە دەكەی كە پێغەمبەر خوا ئەمیرێكی داناوە تۆ لە ئەمیری سوپاكەی دەخەیت؟! بەراستی ئەمە ڕەنجەڕۆ بوونە..

هەرچەندە عومەری كوڕی خەتاب دڵسۆز بوو بۆ كارەكان، بەڵام زانیاریش پێویستییەكی گرنگ بووە بەتەنها ئیخلاص هیچ ناكات، ئیخلاص و زانیاری پێكەوە كار دەكەن، ئەبوبەكری صدیق زانیاری هەبووە كە قسەی پێغەمبەری ئازیزمانە ﷺ كەئەمەش بەشێوەی وەحی

بۆی هاتووە لەلایەن خوای گەورەوە هەر بۆیە ئەبوبەکری صدیق ئەو کارەش بە ئەنجام دەگەیەنێت.!

ئەوەی کە چاوەڕوان نەدەکرا..

کاتێك هێزی سەربازی دەچێتە دەرەوە بە دەوروبەری شام لەسەر لێواری شاری مەدینە هەڵگەڕاوەکان خۆیان ئامادە کردووە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، سەیری ئەو حاڵەت و زەمەنەی موسڵمانان بکەن کە لەلایەکی ترەوە سوپای کافرەکان و هەڵگەڕاوەکان هاتوونەتە نزیك شاری مەدینە.

ئەبوبەکری صدیق هێزێکی سەربازی دیکە ئامادە دەکات بۆ جێگایەکی تر کە بەهیچ ئەقڵ و پێوەرێکی ماددی و مەعنەوی و عەسکەری ئەمە قبوڵ نیە لەلای خەڵك، بەڵام ئەبوبەکری صدیق هەر سوپاکەی ئوسامە دەنێرێتە دەرەوە بە دەوروبەری شام دەڕوات و ئەچێتە ناو خاکی شامەوە هێزی سەربازی ڕۆمانی لە ترسی ئەم هێزەی پێغەمبەری نازدارمان ﷺ هەمووی ڕائەکات و هیچ کەسێکیان توانای کوشتن و کوشتاریان نیە لەگەڵ ئەم سوپایەدا.

لەکاتی گەڕانەوەیان کۆمەڵێك هۆز دەبینن هەست دەکەن ئەم هۆزانە هەڵگەڕاونەتەوە، شەڕیان لەگەڵ کردن و لێیان کوشتن توانیان هێزەکەیان بڵاوە پێ بکەن و سەربکەون بەسەریاندا، بە پەلەش ئوسامەی کوڕی زەید گەڕایەوە بۆلای ئەبوبەکری صدیق لەگەڵ ئەو دەستکەوتانەی کە لەشەڕەکەدا دەستی کەوتبوون. پاشان هێزی سەربازی دەرچوون بەرەو باشوری جەزیرە کە لەوێدا موسڵمانان هێز و ڕەهبەتێکی زۆر گەورەیان بۆ پەیدا بوو لای هەموو هۆزە عەرەبەکان لەو ناوچانە دا کە هەبوون، کاتێك

ئەم هێزە سەربازییانە گەڕانەوە شاری مەدینە و دەوروبەری..هەستیان کرد کە لە شاری مەدینە سوپایەکی گەورەی تیایە کە هیچ کەسێك ناتوانێ ڕووبەڕووی ئەوان ببێتەوە، ئەمەش بەشێکی بچوکی هێزەکەیان بوو، بۆیە هێرشیان نەکردە سەریان کە ئەمەش حیکمەتێکی خوای گەورەیە کە بە موسڵمانانی بەخشیووە و منەتێکیش بوو کردی بەسەر موسڵمانان و ئەبوبەکری صدیق خوا لێی ڕازی بێت، ئەمە دەستکەوتێکی گەورەی دەرچوونی سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید بوو.

ئەبێ قسەکەی پێغەمبەری خوا بێتە دی فارس و ڕۆم بەو بەهێزییەی خۆیان هێرشیان نەکردە سەر موسڵمانان، پێغەمبەری خوا و (نبوەتی) پیغەمبەری خوا کە لە ڕۆژی خەندەق دا ئەفەرمووێت: (الآنَ نَغْزُوهُمْ وَلاَ يَغْزُونَا، نَحْنَ نَسِيرُ إِلَيْهِمْ) ئێمە ئەچینە سەر ئەوان ئەوان نایەنە سەر ئێمە، هەر کەس بانگەوازی سەروەرمان بە ڕاستگۆیی وەربگرێت بانگەشەی بۆ بکات ئەوا هەموو دنیا دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی(أدعوهم إلى أن يتكلموا بكلمة واحدة تدين لهم بها العرب، ويملكون بها العجم، تقولون: لا إله إلا الله، وتخلعون ما تعبدون من دونه) بەم شێوەیە عەرەب و عەجەم دەخاتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان. ئەو مسوڵمانانەی کەبەڕاستگۆی مابوونەوە وتیان (لا اله الا الله) عەرەب و عەجەمیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

**هەڵوێستی هاوەڵەکان بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان :**

ئەودەمە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیان لە جەزیرەی عەرەبیدا خەڵکەکەی بەگشتی مورتەد بوونەتەوە، سەیریان کرد پایتەختی موسڵمانان خاڵیە لەهەموو هێز و جەنگاوەرێك کاتێك کە هێزەکەی ئوسامەی کوڕی زەید لە شام بوو، هۆزەکانی عەرەب لە باشووری مەدینە هەموویان

کۆبوبونەوە و هەڵگەڕانەوە، دەیانویست خۆیان بدەن بەسەر شاری مەدینەدا، لەو کاتەدا دوو نوێنەری خۆیان نارد بۆلای ئەبوبەکری صدیق کە وەختی خۆی هاوەڵ ببوون، ئێستا هەڵگەڕاونەتەوە، کە یەکێکیان بەناوی (عيينة بن حصن الفزاري) و (الأقرع بن حابس)، ئەو دووانە ئەیانویست دانوستان بکەن لەگەڵ موسڵمانان لە شاری مەدینە، ئەبوبەکری صدیق هیچ لە داواکارییەکانی قبوڵ نەکردن کە ئەوان داوایان کردبو:

بە ئەبوبەکریان وت: ئێمە نوێژ ئەکەین و ڕۆژوو ئەگرین، بەڵام زەکاتمان لێ مەسێنن، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نایەینە ناو شاری مەدینەوە، لەو کاتەدا هێزی موسڵمانان لە دەرەوە بوو، ئەبوبەکری صدیق بەرپەرچی دانەوە و کردنیە دەرەوە و هیچی لە( عینییە و ئەقرەع )وەرنەگرت و پێی وتن: ئەوە کاری ئێوە نیە، چۆن خوای گەورە نوێژی فەرز کردووە لەسەر موسڵمانان بەو شێوەیەش زەکاتی فەرز کردووە کە دەبێ زەکاتی ماڵی خۆتان بدەن، عومەری کوڕی خەتاب و هاوەڵەکان بە گشتی وتیان بە ئەبوبەکری صدیق با کەمێك پەستانمان لەسەر کەم بێتەوە.. جارێ پەلەیان لێ مەکە، ئەم بۆچوونەیان پەسەند بکە و بە مورتەدەکان مەڵێ ئەتانکوژم، بەڵام ئەبوبەکری صدیق بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەبوو و فەرمووی: (هەرکەسێ جیاوازی بکات لە نێوان نوێژ و زەکات و هەموو فەرزەکانی ئیسلام من ئەیانکوژم، من چۆن شتێك لەسەر خەڵکێك لائەبەم کە خواو پێغەمبەری خوا فەرزیان کردبێت، بەمەش دەرچوونە لە ئیسلام هەرکەس ئەوکارەی کرد پێی کافر دەبێ). پاشان هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ زانیان ئەبوبەکری صدیق سوورە لەسەر قسەکانی و بەردەوامە و سوپا لە دەرەوەیە و لەشامە..

هاوەڵان وتیان باشە بەچی شەڕیان لەگەڵدا بکەین؟! بەڵام ئەبوبەکر بەرپەرچی دانەوە بە چەند وشەیەکی جوان کە هەق وایە لە هەموو

ماڵێکی موسوڵمانانددا بە ئاڵتون بنوسرێت ئەگەر موسڵمان دەسەڵاتی هەبێت.. فەرمووی: (أقاتلهم وحدي حتى تنفرد سالفتي. أي: حتى تُقطع رقبتي)، واتە: (ئەیانکوژم بە تەنها و شەڕیان لەگەڵدا ئەکەم هەتاکو ئەدەن لەگەردەنم).

پاشان هاوەڵان ئەمەیان بینی کە ئەبوبەکر ئەوەندە سوورە بەڕاستی کارەکەی گرتووە هەموو هێز و تینیان تێکەوتووە و وتیان: ئێمەش لەگەڵتاین ئەی ئەبوبەکری صدیق، ئەم وشانە چووە ناو دڵی هەموویانەوە و هیچ گومانێکیان لەدڵا نەما و خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بووبێ هەتا سوپاکە دێتەوە خۆیان ڕێکبخەن و ئەو شەڕە بکەن، زانستی ئیدارە ڕێگەیەکی گرنگ بوو لە ڕێگە چارەسەرەکان کە بەکاریهێنا، بەڵام هاوەڵەکان زۆرێکیان پەییان نەبرد بەو زانستەی خەلیفەی پێغەمبەر! ئیخلاص بەتەنها بەس نیە، خۆبەختکردنی تەواوەتی بەتەنها بەس نیە، چاکەکردن بەتەنها بەس نیە، لێرەدا ئەبێ بزانین بۆچی قورئانی پیرۆز لە هاتنە خوارەوەیدا لە سەرەتای دەست پێکردنی ئایەتەکانی باس لە زانین و زانست دەکات.

ئەبوبەکری صدیق یەکەم کەسە لە ئومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەگەر هەموو حەسەناتی ئومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبکەیتەوە ناگاتە حەسەناتی ئەبوبەکری صدیق، پاشان هەموو ئومەتی موحەممەد لە تای تەرازوویەکدا بێت و ئەبوبکر بەتەنها خۆی لە تای تەرازوویەك بێت تای تەرازوی ئەبوبەکر قورس ترە !!..

بۆ ئەوەی بزانن کە ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە صدیق واتە ڕاستگۆ ناوەزەندی دەرکردوە و هیچ کەسێك بە قەد ئەبوبەکر زانا نیە، هیچ کەسێك ناگاتە ڕاستگۆیی ئەبوبەکری صدیق و هیچ کەسێك ناگاتە بەخشینی ئەبوبەکری صدیق.

**بەرەنگاری هەڵگەڕاوەکان :**

ئەبوبەکری صدیق (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت) یەکەم کارێك کە کردی هەستا چاودێرییەکی زۆر گەورەی لەناو شاری مەدینە دامەزراند، خۆی یەکێك بوو لەو کەسانەی کە پاسەوانی ئەگرت، لە دوای ئەوەی سوپاکە گەڕایەوە بنکەیەکی سەربازی گەورەی دامەزراند لە باشووری شاری مەدینە بۆ ئەوەی سوپاکەی هەمیشە لە ڕاهێنانی سەربازیدا بن، لە دووری شاری مەدینە لە باکوور و باشوور بنکەی سەربازی دامەزراند بۆ ترساندنی هۆز و هەڵگەڕاوەکان بۆ ئەوەی نزیك نەبنەوە، لەو حاڵەتەشدا نامەی ئەنارد بۆ هەموو جێگاکانی شاری مەککە و تایف بۆ ئەوەی موسڵمانان کۆببنەوە و خۆیان ئامادە بکەنەوە بۆ جیهاد، لەهەمان کاتدا نامەی ئەنارد بۆ هەموو هۆزەکان و هەڵگەڕاوەکان بە زمانێکی هەڕەشە ئامێز و ترساندن بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلامەتی چونکە کاتەکەی کاتی ئەوەبوو، شێوازی جەنگی دەروونی بەکار ئەهێنا لەگەڵیاندا.

ئەبوبەکری صدیق دەستی کرد بە ئامادەکردنی سوپاکەی و سەربازی ئیسلامی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان لە کاتێکی گونجاودا، ١١ سوپای سەربازی ئامادەکرد، هەموو سوپایەکیش ژمارەیان لە دوو هەزار یان سێ هەزار یان خۆی ئەدا لە پێنج هەزار کەس، ئەم هێزانەی وا ئامادە کردبوو کە لە کاتێکی لەبارو گونجاودا خۆیان بدەن بەسەریاندا، سوپاکانی وا دابەش کرد بە یەکسانی و بە ڕێکو پێکی شوێنێك نەمابوو لە نیشتمانی عەرەبیدا کە سەربازی بۆ ئامادە نەکردبێت ئەگەر چی بە مەفرەزەیەکیش یان کەتیبەیەکیش بووبێت، بۆئەوەی بزانن کە هێزو توانای موسڵمانان چەندە گەورەیە.

**هێرش و شەڕکردنیان بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەیخەینەڕوو:**

**سوپای یەکەم :**

سوپای یەکەمی موسڵمانان بەسەرۆکایەتی (خالیدی کوڕی وەلید ) بوو، ژمارەی سەربازانی ٤٠٠٠ موجاهید بوون کە گەورەترین هێزی سەربازی بوو، ئەمەش ئەبوبەکری صدیق ئامادەی کردبوو بۆ شەڕکردن بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان، کارەکەی خالیدی کوڕی وەلید زۆر قورس بوو، یەکەم شوێن ویستی ڕووی تێبکات بە فەرمانی ئەبوبەکری صدیق ناوچەیەك بوو پێی ئەوترا (طيئ) پاش ئەو شوێنە ڕوویان کردە (بەنی ئەسد ) کە ئەو هۆزە زۆر سامناك بوون گەورەی ئەو هۆزە کەسێك بوو ناوی (طليحة بن خويلد الأسدي) سەرۆکایەتی ئەو هۆزەی دەکرد..

پاشان چوونە ناو (بني تميم) کە لەناوياندا سەرکردەیەکی گەورەی تێدا بوو بەناوی (مالك بن نُويرة) یەکێك بوو لە هەرە ئازاکانی ئەو هۆزە و زۆر خەڵکی لە دەور کۆببووەوە، لەو شوێنانەدا خالیدی کوڕی وەلید سەرکەوتنی بەدەست هێنا و پاشان ڕوویکردە ناو هۆزی (بني حنيفة) کە ڕووبەڕووبوونەوەی ترسناکترین هۆزی هەڵگەڕاوەکان بوو، سەرەکیترینیان (مسيلمة الكذاب)بوو، ئەبوبەکر دوو هێزی تری نارد بۆ خالید (ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت)، خالیدی کوڕی وەلید بەم جۆرە سوپاکەی ڕێکخست بۆ بەنی حەنیفە.. کەسێکی تێدا بوو لەناو ئەو هێزەدا ناوی (عدي بن حاتم الطائي) کە بەشی ( مەیمەنە) (بەشی ڕاستی سوپاکە)ی بەدەستەوە بوو، چونکە موسڵمانان بەرەو (طيئ) دەڕۆشتن (عدی) خۆی خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو لە هۆزی (عدي بن حاتم) بوو، بۆیە بردی لەگەڵ خۆی بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ هۆزەکەی بکات، بۆ

ئەوەی بیانهێنێتەوە ناو ئیسلام. عدي کوڕی حاتەم الطائي قسەی کرد لەگەڵ هۆزی طیئ کە بریتی بوون لە دوو باڵ یەکێکیان بەناوی (غوث) ئەوی کەشیان بەناوی (جدیلة)..

عدی کوڕی حاتەم توانی (غوث) ڕابکێشێتەوە ناو موسڵمانان و واز لە هەڵگەڕاوەیی خۆیان بهێنن ٥٠٠ کەسیان بوونە موجاهید و هاتنە ناو هێزی موسڵمانانەوە !

پاشان عدی کوڕی حاتەم چوو لەگەڵ (جەدیلە) قسە بکات ئەوانیش لەگەڵ ٥٠٠ موجاهید هاتنە ناو ڕیزی موسڵمانانەوە، پاشان دەستبەجێ ڕووە و (طلیحة الأسدي)ڕۆشتن لەوێدا توانیان سەرکەوتنێکی زۆر باش بەدەست بهێنن بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید و سەرکردە بەڕێزەکانی سوپای موسڵمانان.

(طلیحةُ بن خویلد) خۆی ڕای کرد، لەدواییدا خوای گەورە هیدایەتی پێبەخشیەوە و هاتەوە ناو موسڵمانان و لەزۆربەی فتوحاتەکانی ئیسلام بەشداری کرد. پاش ئەوە خالیدی کوڕی وەلید ڕوودەکاتە ناو هۆزی (بني تمیم( لەناو ئەو هۆزەدا بینی کە هەموویان وازیان لە ئیسلامەتی هێناوە، بەڵام کاتێك کە چووە ناویان بەگشتی ئەم هۆزەش هاتنەوە ناو ئیسلام، موسڵمانان سەرکەوتنێکی زۆر بەرچاویان بەدەست هێنا بەسەر هۆزی بەنی ئەسەد دا، لەو کاتەدا ئەبوبەکری صدیق فەرمانی کرد بە هێزەکان ئەگەر چوونە جێگایەك گوێیان لە دەنگی بانگ بێت، شەڕیان لەگەڵ مەکەن تەنها بچنە ناوەوە.. پاشان داوای زەکاتدانیان لێبکەن لە بەنی تەمیم بەوشێوەیە کارەکەیان ئەنجام دا و ئەوانیش وتیان ئێمە ئامادەین، هەروەها بەهەمان شێوە داوایان لە بەنی ئەسەد کرد وتیان ئێمە

ئامادەنین زەکات بدەین، پاشان دەستەیەکی تر پەیدا بوون بەناوی ( مالك بن نويرة) کە خالیدی کوڕی وەلید بە دیلی دەگرێت، لێرەدا جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان خالیدی کوڕی وەلید و مالیکی کوڕی نویرە و هەندێك لە دیلەکانی تر، نزیکترین شیکردنەوە لە ڕاستییەوە ئەوەیە کە خالیدی کوڕی وەلید بە هەندێك لەو پاسەوانانەی کە ئاگایان لەدیلەکان بووە پێی وتون بڕۆن دیلەکان گەرم بکەنەوە. لەبەر ئەوەی شەوێکی زۆر سارد بوو، بەڵام هەندێك لە پاسەوانەکان بە زمانی ئەوان کە وتراوە گەرمیان بکەنەوە مانای بیانکوژن، دیلەکانیان کوشت وە مالیکی کوڕی نویرە سەرۆکی هۆزەکە ژمارەیەکی لێیان کوشت، هەتا هەواڵەکە گەیشت بە خالیدی کوڕی وەلید وتی وازبهێنن..

بەڵام کۆمەڵێك لە چاودێرەکان کە لەڕووی زمانەوانییەوە دەڵێن: (أدفئوا أسراكم) واتە دیلەکانتان بکوژن کە لەزمانی عەرەبیدا ئەم وشەیە بوەتە هۆکاری ئەوەی ئەو حاڵەتە ڕوویدات بۆیە لە کۆتاییدا دەفەرمووێت: وازبهێنن بۆ دەیان کوژن..

**سوپای دووەم :**

ئەم سوپایەش ڕووەو هۆزی بەنی حەنیفە ڕۆیشت کە کەسێکی تێدایە بەناوی (مسيلمة بن حبيب الكذاب) لێرەدا وای بەباش دەزانم لەڕووی مێژووەوە باسێکی بەنی حەنیفە بکەم کە چۆن دەستیان کرد بە هەڵگەڕانەوە لە ئایینی ئیسلام.. پێش کۆچی دوایی پیغەمبەری خوا ﷺ نوێنەر لە جزیرەی عەرەبی و ناوچەکانی دەوروبەری هاتن پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم هۆزی بەنی حنیفەیە زۆر بوون ژمارەیان زیاد لە ١٠٠٠٠ کەس بوو لە ناوچەکانی یەمەن و خوارووی جزیرەی عەرەبی

و ناوچەکانی بەحرەین تا دەگاتە عومان و حەزرەمەوت و تا دەڕواتە ناوەڕاستی جزیرەی عەرەبی و لەوێشەوە بۆ بەنی نەجد...هتد، لەو سەردەمەدا کاتێك کە هۆزێك دەچوونە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پەیمانیان پێ بدایە بەپێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی دڵی ئەوان ڕازی بکات و دڵیان بداتەوە شتی پێ دەبەخشین، هەر بۆیە بەخششی دا بەم هۆزە و ئەمانیش دەڵێن بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە هاوڕێیەکمان بەجێماوە و ئاگاداری وڵاغ و وشتر و کەلوپەلەکانمان دەکات داوای بەخشش دەکەین بۆ ئەویش کەناوی (مسيلمة بن حبيب) بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێیان: (أَمَا إنّهُ لَيْسَ بِشَرِّكُمْ مَكَانًا) واتە: ئەویش هەروەك ئێوە وایە لە ئێوە خراپتر نیە..

بەڵام کە ئەم قسانەیان گێڕایەوە بۆ موسەیلمەی کوڕی حەبیب یەکسەر تووشی هەڵگەڕانەوە بوو وتی: من پێغەمبەرم و ئەکەوێتە درۆکردن و وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ئیشەکەمان بەش کردووە بەڵگەشم ئەوەیە کە محمد پێی وتووم (أَمَا إنّهُ لَيْسَ بِشَرِّكُمْ مَكَانًا؟) کە وا تێگەیشتبوو ئیش پێکەوە بکەن کە لەدواییدا نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەنامەکەدا نووسیبووی: من مسيلمة رسول الله إلى محمد رسول الله، إني قد أُشركت في الأمر معك، فلنا نصف الأرض، ولكم نصف الأرض، أو تجعل لي الأمر من بعدك، ولكني أعلم أن قريشًا قوم لا يعدلون.

واتە: لەموسەیلەمەی نێرراوی خوا بۆ موحەممەد نێراوی خوا، منیش هاوبەشم لە پەیامەکە لەگەڵ تۆدا، نیوەی زەوی بۆمن، نیوەکەی زەوی بۆ تۆ، لەدوای خۆت من بکە بە جێنشینی خۆت، هەرچەندە ئەزانم کە قورەیش قەومێکی داد پەروەر نین.

پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) نامەیەکی بە هاوەڵێکی گەنجی خۆی بەناوی (حبيب بن زيد) نارد کە تیایدا نووسرابوو: ( مِنْ مُحَمَّدٍ رسُولِ اللَّهِ

إِلَى مُسَيْلِمَةَ الْكَذَّابِ، السَّلاَمُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، إِنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ).

واتە: لە موحەممەد نێراوی خوا بۆ موسەیلەمەی کەذاب (درۆزن)، سەلام لەو کەسەی دوای ڕێنوێنی و هیدایەتی خوای گەورە ئەکەوێ، بەڕاستی زەوی خوای گەورە خۆی ئەیبەخشێ بە هەرکەسێك کە خۆی ئارەزوومەندە، ئاکام بۆ باوەڕداران و پارێزکارانە). ئالێرەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە موسەیلەمەی (کەذاب) وشەی کەذاب لێرەوە سەرچاوەی گرتووە لەزمانی پێغەمبەری خواوە ئەم ناوەی لێنراوە و بەدرۆزن ناوزەدی کردووە.

موسەیلەمەی کەذاب کاتێك نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی دەگات لەلایەن حەبیب ی کوڕی زەیدەوە ڕەزامەندی خوای لێبێت یەکسەر شەهیدی دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا سەرقاڵە بە ڕێکخستنی سوپاکەی (أسامة بن زید) لەسەر سنووری شام، بڕیاری دا کە نێرراوێك بنێرێت بۆ بەنی حەنیفە بۆ بەرپەرچ دانەوەیان و هێنانەوەیان بۆ ناو ئیسلام، پێغەمبەر پیاوێك هەڵئەبژێرێت لەبەنی حەنیفەیە کە هاوەڵی خۆیەتی بەناوی (نهار الرَّجَّال)، ئەم هاوەڵە کاتێك دەڕوات بۆ ناو خەیمەکەی و دانیشتنێکی دوورو درێژ دەکات لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن لەدەوری خەیمە (ڕەشماڵ)ەکەی موسەیلەمەی کەذاب موسڵمانان و هەڵگەڕانەوەکان کۆبوونەتەوە، وتووێژ لە نێوان موسەیلەمەی کەذاب و (نهارالرجال) ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت...

بەڵام موسەیلەمەی کەذاب هەر بە مورتەددی دەمێنێتەوە، کاتێك (نهار الرجال) دێتە دەرەوە لە خیوەتەکە و خەڵکەکە پرسیار دەکەن و

دەڵێن : محمد چی وت بە موسەیلەمە؟ (ڕجال) دەڵێت: موسەیلەمە خۆی بە هاوەڵی محمد دائەنێت لە کاروبارەکاندا و ئیشی هەردووکیان کۆتایی پێ هات..

پاشان بەنی حەنیفە بوون بە دوو بەشەوە پەنجا هەزار بەتەواوی موسڵمان بوون، پەنجا هەزاریش لەگەڵ ئەوانا ڕۆیشتن و هەڵگەڕابوونەوە، چل هەزار بەیەك ڕۆژ لەژێر دەستی (نهار الرجال) موسڵمان بوون، بەم هۆکارە کە نیوەی خەڵکەکە لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن ڕۆشتن تا ڕادەیەك لە ناو خەڵکیدا شان و شکۆی موسەیلەمەی کەذاب زیاتر بوو، بەمەش پەنجا هەزاری کەیان زیاتر کرد..

موسەیلەمەی درۆزن ویستی کودەتا بکات بەسەر موسڵماناندا، بەڵام بۆی نەکرا ئینجا کەوتە ئازاردانی موسڵمانان، ئا لەو کاتەدا هاوەڵێکی بەڕێزی سەروەرمان بەناوی (ثمامة بن أثال) لە پێشەنگی موسڵمان بووانی بەنی حەنیفە بوو، لە سیرەی پێغەمبەری نازدارمان باس کراوە، ئەم هاوەڵە بەڕێزە یەکێکە لە پیاوە دەوڵەمەندەکانی بەنو حەنیفە نان و ئاردی بەدەستەوە بوو ئەیبەخشییەوە بەسەر قورەیش و هەموو عەرەب. ئەوە بوو هات بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام پێغەمبەر بە وەحی ئاگادار کرایەوەو، دەستگیرکراو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە مزگەوتی پێغەمبەر بەسترایەوە... پاشان موسڵمان بوو، دوایی گەمارۆی ئابووری خستە سەر شاری مەککە، ( ابو سفیان ) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوایان کرد گەمارۆیان لەسەر لابدات.!

ثمامەی کوڕی ئەثال شەڕی دژی موسەیلەمەی درۆزن کرد کە لە یەمامەوە هاتبوو، پاشان ئەمانە شەڕیان کردەوە لەگەڵ یەکتریدا هەمووشیان لەیەك هۆز بوون، بەڵام دژی موسەیلەمەی درۆزن، تاوای

لێهات هەواڵ گەیشتە بەنی حەنیفە کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردووە کە هەواڵەکە گەیشت..

بەتەواوەتی ئەم گەل و هۆزە وە ئەو پێنج هەزارەی کەلەگەڵ (نهاری کوڕی ڕجال) بوون خۆی و هێزەکەی هەڵگەڕانەوە چوونە پاڵ موسەیلەمەی درۆزن! زۆر بەهێز بوون، تەنها(ثُمامة بن أُثال) نەبێ لەگەڵ هەندێك خەڵك ڕایان کرد..

دوو هێز ڕێکخرا بۆ ئەو ناوچانەی بەنی حەنیفە هێزێکیان بەسەرکردایەتی هاوەڵی بەڕێزی سەروەرمان (عكرمة بن أبي جهل)، هێزەکەی تر بەسەرکردایەتی هاوەڵێکی تر بەناوی (شُرحبيل بن حسنة.)

ئەبوبەکری صدیق کە ئەم دوو هێزەی ئامادە کرد و ناردنی بۆ ئەو جێگایە، فەرمانی کرد بە عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل کە چاوەڕێ بکات، شەڕ نەکات لەگەڵ موسەیلەمە هەتا هێزی شەرحەبیل دەگات.

پاشان پێکەوە دەچنە ئەو جێگایەوە کە ئەبوبەکری صدیق فەرمانی پێ کردبوون بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن، هێزی یەکەم نزیکەی ٣٠٠٠ کەس دەبوون هێزی دووەمیش هەرهەمان ژمارە بوون، بەڵام عیکرەمە پەلەی کرد و شەڕی کرد لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن پێش ئەوەی هێزی (شەرحەبیل بن حەسنة) بگات.. هەر بۆیە فەرمانی ئەمیرەکەی کە ئەبوبەکری صدیقە دەشکێنێت و دەکەوێتە شەڕکردن، بەڵام موسەیلەمە دەتوانێت هێزەکەی عیکرەمە بشکێنێت و بڵاوەیان پێ بکات، عیکرەمە ڕادەکات کاتێك ئەم هەواڵە دەگاتە ئەبوبەکری صدیق زۆری پێ ناخۆش دەبێ و زۆر توڕە دەبێ دەشزانێ هێزەکەی دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، پاشان نامەیەك دەنێرێت بۆ عیکرەمە لە سەرەتادا زۆر توڕە دەبێت کە زوو

شەڕی کردووە، پێی دەڵێت خۆت و هێزەکە کۆبکەرەوە نەیەنەوە بەرەو مەدینە، خۆت و هێزەکەت بڕۆن بۆ یەمەن بۆلای(حذیفة بن محصن) وە (وعرفجة بن هرثمة( لەیەمەن پێکەوە لەگەڵ ئەواندا جیهاد بکەن.

**سوپای سێیەم :**

هێزی (شُرحبیل بن حسنة )کە بەرەو بەنی حەنیفە دەڕوات، چاوەڕوانی هێزی (مەدەد) بوون، ئەبوبەکری صدیق ئەم هێزە بچووکە دەنێرێت کە پێك هاتبوون لە ٣٠٠٠ موجاهید، ئەمانیش کە ئەڕۆن چاوەڕێی عیکرەمە ناکەن دەکەونە شەڕکردن لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن کە ژمارەیان سەد هەزار کەس بوو، ئەم ڕووداوەش بەهەمان شێوەی ڕووداوی هێزەکەی عیکرەمە بوو کە شەڕیان کرد فەرمانی ئەبوبەکری صدیقیان شکاند، ئەبوبکر زۆر دڵناخۆش و خەمناك بوو بەم هەواڵە، پاشان ئەبوبەکری صدیق نامەیەکی نارد بۆیان داوای لێ کردن کەلە شوێنی خۆیان بمێننەوە و نەگەڕێنەوە بۆ مەدینە.

**سوپای چوارەم و ناوچەی یەمامە :**

ئەبوبەکری صدیق ئەو کارە ئەسپێری بە خالیدی کوڕی وەلید بە شەڕ کردن بەرامبەر بەنی حەنیفە، خالیدی کوڕی وەلید هێزی کۆکردەوە لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵەکانی ناو مەدینە، هەروەها هێزی شەرحەبیل کوڕی حەسنە، لە کۆتاییشدا ئاگاداری هەموو هۆزی بەنی (مدد) ئەکاتەوە، پاشان خالیدی کوڕی وەلید خۆی و هێزەکانی بەرەو بەنی حەنیفە دەڕۆن، لە دوای دەرچوونی هێزەکەی خالید لە مەدینەوە کە ئەبو بەکری صدیق دەیان نێرێت کاتێك دەگەنە یەك کۆی گشتیان دوانزە هەزار کەسن.!

کاتێك کە خالید دەڕوات لە مەدینەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن لەوکاتەشدا هێزێکی تر لە باشوورەوە بۆ بەنی حەنیفە دەڕوات بۆ شەڕکردن، بە سەرکردایەتی کەسێکی بەهێز ناوی (سَجَاح) بوو، بانگەوازی پێغەمبەرایەتی ئەکرد ئەم هێزە ژمارەیان سەد هەزار کەس دەبوون و هەڵگەڕابوونەوە، ئەم هێزانە تەنها مەبەستیان هەڵگەڕانەوە نەبوو، بەڵکو ئەم هێزە ئامانجی ئەوە بوو کەبە هەموو هێزێکی دەست بگرێت بەسەر هەموو جەزیرەی عەرەبی، بەتەنها خۆی فەرمانڕەوابێت لەگەڵ ئەو سوپا بەهێزەی کە هەیبوو، (سجاح) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد بۆ خۆی!!. سەجاح کە دێت بۆ یەمامە و هێزەکەی موسەیلەمە دەبینێ کە چەندە گەورەیە ئەیەوێ شەڕبکات لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن ئەمە خاڵی یەکەم..

خاڵی دووەم موسەیلەمە چاوەڕێی هێزی خالید دەکات کە شەڕبکەن.. چاوەڕێی سەجاحی نەکردوە، لەو کاتەدا موسەیلەمە کۆبوونەوە بە هێزەکەی دەکات و چل کەس لە پیاوانی خۆی دەنێرێت بۆ ناو خەیمەی سەجاح بۆ ڕێکەوتنی هەردوو هێزەکە، چونکە ئامادە نیە شەڕ بکات لەگەڵ سەجاح لەبەر ئەوە پێی دەڵێت نیوەی بەروبوومی یەمامەت دەدەمێ و بگەڕێرەوە! هەروەها داواشی لێ دەکات ژن بخوازێت ئەویش بەمانە ڕازی دەبێ، کاتێك کە خەبەر دێت لە یەمامەوە کە هێزی خالید بەرەو یەمامە دێ سەجاح ئەترسێ و بۆ ئەوەی خۆی و گەلەکەی تیا نەچێت ڕائەکا و چاوەڕێی ژن خواستنەکەش ناکات شەڕەکە جێ دەهێڵێ بۆ موسەیلەمەی درۆزن.

سەجاح لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب موسڵمان دەبێ لە فەتحەکانی ئیسلامدا بەشداری دەکات بەڵام بە هاوەڵ ناوەزەند نەکراوە، هێزەکەی خالید دەگات، گروپێکی زۆر بەهێز دەنێرێت بۆ ڕێگای

یەمامە لە ڕێگادا ٦٠ کەس لە بەنی حەنیفە دەبینن کە لە موسڵمانێتی دەرچوون واتە دینەکەیان گۆڕیوە، خالید قسەیان لەگەڵدا دەکات بەڵام ئەوان هەر بەردەوام ئەبن لە سەر قسەی خۆیان کە وازیان لە ئیسلام هێناوە، خالیدی کوڕی وەلید دەکەوێتە شەڕکردن لەگەڵیانا هەتاکو هەرهەموویان ئەکوژرێن تەنها یەکێکیان ئەمێنێتەوە، یەکێك لە هاوەڵانی خالید ئاماژەیەك بۆ خالید دەکات کە ئەو کەسە وەك دیل بەکاری بێنە، خالید بەقسەی هاوەڵەکی دەکات دەیگرێت بە دیل، هەروەها فەرمانی ئەبوبەکری صدیقە کە دەفەرموێت ئەوانەی دێنە ڕێگاتان بیانکوژن، بەڵام پارێزگاری بکەن لە دیلەکان چونکە ئەم گەورەی هۆزەکەیەتی کە ئەویش )مجاعة بن مرارة) یە، ئەیگرن بە دیل لە خەیمەکەی خالیدی کوڕی وەلید دایدەنێت، خواردن و خواردنەوە لەلایەن خێزانی خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ ئامادە دەکرا.

هێزی موسوڵمانان بەڕێکەوت بۆ ناوچەکانی بەنی حەنیفە، هێزەکە لە بەشی پێشەوە (شُرحبیل بن حسنة) سەرکردایەتی دەکرد، لەلای ڕاستەوە (زید بن خطاب) سەرپەرشتی دەکرد، لەلای دەستی چەپەوە هێزی (ابا حذیفة( سەرکردایەتی دەکرد، هێزی ئەنصار و موهاجیر کران بە دوو بەشەوە، بۆ ئەوەی بزانن موسڵمانان بۆ کوێ دەچن و پارێزگاریان لێ بکرێت بۆ ئەوەی لە کاتی ئیدارەی جەنگدا هەموو لە جێگایەکدا کۆبنەوە، کەسێك دانرا بۆ چاودێری ئەنصار (ثابت بن قیس) بوو، کەسێکیش دانرا بۆ چاودێری مهاجر (سالم مولی أبي حذیفة) بوو، خالیدی کوڕی وەلید لە ناوەڕاستی هێزەکەدا بۆ چاودێری هەموو شەڕەکە مایەوە، لەناو فوسطاطەکەوە (مجاعة)ی دیلی تێدایە کە خێزانی خالید کوڕی وەلید چاودێری ئەکات، لەدوایی فوسطاطەکەوە کە کۆتایی هێزەکەیە کەسێکی

بۆ دائەنرێت بەناوی (سَلیط بن قیس)، بەڵام موسەیلەمەی کوری حەبیب کەذاب کە کۆمەڵێك قەڵای گەورەی هەبوو کە گەورەترینیان ناوئەنرا (الحدیقة) واتە باخچە، ئەو باخچەیە دیوار و پایەکانی زۆر بەرز و بەهێز بووە، ئەمەش بەهۆی گەورەیی و بەهێزی هێزەکەی موسەیلەمەی کەذاب، کە ناتوانێت جێگەیان ببێتەوە لەناو ئەو باخچەیە دا، هەربۆیە خۆی و هێزەکەی دەچنە دەرەوەی باخچەکەوە..

خۆشی دەمێنێتەوە لەدوایی هێزەکەیەوە و خەیمەیەك هەڵئەدا لەبەردەم دەرگای قەڵاکاندا بۆ ئەوەی هەر ڕووداوێك ڕوبدات یان بدۆڕێت لە شەڕەکە بڕواتە ناو قەڵاکانەوە!، جەنگ دەستی پێ کرد بە هێرش کردنێکی بەهێز لەلایەن هێزی موسەیلەمە بۆ سەر موسڵمانان، هێزی موسەیلەمەی کەذاب نوقمی ناو سوپای موسڵمانان دەبن هەتا دەگەنە ناو خەیمەی خێزانی خالیدی کوڕی وەلید کە (مجاعة)ی تێدا بەدیل گیراوە ئەچنە ئەوێ (مجاعة) ئازاد دەکەن..!

پاشان دەیانەوێت خێزانی خالیدی کوڕی وەلید بکوژن، بەڵام (مجاعة) دەبێتە هۆی ئەوەی ئیجارەتی خێزانەکەی خالید دەکات، ئیتر لەدەستیان ڕزگاریان دەبێت یەکسەر موسڵمانان بەم شکاندنە کۆدەبنەوە جارێکی تر بە خۆیاندا دەچنەوە سەر لە نوێ ئامادەباشی دەکەنەوە بۆهێرشێکی توند.

شێرەپیاوێك دەرکەوت لەناو هێزی موسڵمانان کە نەزر ئەکات لەسەر خۆی کە قسە نەکات لەگەڵ هیچ کەس تا سەرکەوتن بەدەست نەهێنن، نمونەی ئەم کەڵە پیاوە دووبارە نابێتەوە لە مێژوودا!.

ئەوکەسەی کە هەستا بەم نەزرکردنە ئەویش (زید کوڕی الخطاب) کە هەڵئەستێتە سەرپێ و دەڵێت دەبێ سەرکەوین بەسەر ئەم هەڵگەڕاوانەدا

هەتا لە پێناوی خوای گەورە شەهید دەکرێم لەو جەنگەدا (فقام زيد بن الخطاب الذي نذر ألاّ يتكلم حتى ينصره الله على هؤلاء المرتدين، أو يُقتل في سبيل الله في هذه المعركة)، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەرێز لە دەوری کۆبوونەوە، پاشان شەڕێکی زۆری کرد لەلای ڕاستی شەڕەکەوە، هەتا خوای گەورە دەیگەیەنێتە لای (نەهاری ڕجال) سەرۆکی هەڵگەڕاوەکان بوو، پێشتر هاوەڵی پێغەمبەر بوو، بەڵام هەڵگەڕابووە. زەیدی کوری خەتاب توانی (نەهاری ڕجال) بکوژێت..

کوشتنی نەهار بووە هۆکاری شکستی سوپای هەڵگەڕاوەکان کاریگەری زۆری دروست کرد لەسەر سوپای هەڵگەراوەکان، موسڵمانان هێرشیان کردە سەریان، زەید کوڕی خەتاب بەردەوام بوو لە شەڕکردن تا چوونە ناو قوڵایی هێزی هەڵگەڕاوەکان، بەڵام ئەم کەڵە ئەژدەرە زەیدی کوڕی خەتاب بە ئاواتی خۆی دەگات ئومێدی شەهیدی بوو لەم شەڕەدا بە شەهیدی ئەگات، لەدوای شەهید بوونی زەید دیسانەوە شکاندنێکی تر ڕووئەکاتەوە هێزی موسڵمانان، زەید کوڕی خەتاب کە شەهید دەبێ موسەیلەمەی کەذاب لەم جارەدا هێرشێکی توند دەکاتە سەر موسڵمانان دەگەنە ناو خەیمەکەی خالیدی کوڕی وەلید بۆ جاری دووەم لەوکاتەدا (ثابت بن قيس) ئەنصاری کە چاودێری ئاڵای ئەنصاری بەدەستەوە بوو، شەڕێکی زۆر باش دەکات و ئاڵای ئەنصاری بەدەستەوەیە، قاچێکی دەپەڕێنن دەکەوێتە سەر زەوی لەم کاتەدا دەنگێك دەبیسرێ و هاوار دەکات دەڵێت: ئەی ئەنصارەکان، پەلە بکەن ئەوەی ئەتانەوێ بیکەن مەهێڵن ئاڵاکەم لەدەست بکەوێت..

ئەنصارەکان ڕووی تێدەکەن کە ثابت کوڕی قیس ئاڵای بەدەستەوەیە لەم کاتەدا کە قسە دەکات قاچی ئەقرتێ و ئاڵاکە دەکەوێتە سەر

زەوی، (أبو سعيد الخدري) دێت ئاڵاكە هەڵدەگری و شەهید دەكرێ، پاشان شەڕ بەردەوام دەبێت سوپای موسەیلەمە هێرش دەكاتەوە سەر موسڵمانان كە لێرەدا پاڵەوانێكی ئەم ئیسلامە دەردەكەوێت و سەردەردێنێ لەناو موسڵمانان ئەویش(أبو حذيفة) بوو كە حافزی سورەتی البقرة بوو هەڵئەسێتە سەرپێ و هاوار دەكات و دەڵێت: ئەی ئەوانەی سورەتی (البقرة) تان لەبەرە، شەڕ بكەن تا شەهید دەبن، خۆی شەڕی كرد هەتا شەهید بوو لەگەڵ هەموو ئەوانەی كە ئەو سورەتەیان لە بەر بوو مێژوو دەگێرێتەوە كە وێنەی ئەمانە زۆر كەمە!!! كان أبو حذيفة من حُفّاظ سورة البقرة، فينادي: يا أهل البقرة. فيقوم له المسلمون الحافظون لسورة البقرة، ويقاتلون قتالاً شديدًا حتى يستشهد.

بەمەش شان و شكۆی موسڵمانان زیاتر بەرز بووەوە، موسڵمانان دەستیان كرد بە هێرش كردنێكی بەتین بۆ سەر هەڵگەراوەكان، ئەم هێرشە بۆ سەر موسەیلەمەی كەذاب بوو تا بە تەواوەتی سوپاكەی تێكشكا، لە هەمان كاتدا بانگەوازیان كرد بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە. خالیدی كوری وەلید بەردەوام بوو لەوەی كە دروشمەكانی ئیسلامی بەرز رادەگرت پێی وتن: بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام، ئەگەر بگەڕێنەوە خوێن و ماڵی ئەو خەڵكە پارێزراو ئەبێت و ناكوژرێن، ئەی موسەیلەمە خۆت بدە بەدەستەوە، بەڵام موسەیلەمەی كەذاب بەردەوام ئەبێت لەسەر بەرپەرچدانەوەی داواكاریەكانیان، ئەمەش شكستی سێیەمی موسڵمانان دەبێت لەبەر ئەوەی سوپای هەڵگەڕاوەكان بۆ جاری سێیەم خۆیان ئامادە دەكەنەوە وەك شەپۆلی دەریا بەسەر موسڵمانادا شەپۆل ئەدەن، سوپاكەی زۆر گەورە بوو، زیاد لە ١٠٠هەزار كەس بوون، لەبەر ئەوە بۆ جاری سێیەم سوپا دەچێتە ناو خەیمەكەی خالیدەوە لەم كاتەدا هاوەڵێكی تری سەروەرمان

دەردەكەوێت بەناوی ( عمار بن یاسر) كە حافزی قورئانە واتە هەموو قورئانی لەبەربوو، دەڵێ: ئەی خەڵكی قورئان، با قورئانەكەمان بەجوانی ڕابگرین[١]

چوست و چالاك بوونەوە ئەوەی كە قورئانی لەبەر بوو هەستان بە هێرشكردنێكی گەورە بۆ سەر هەڵگەڕاوەكان و موشریكەكان، خالیدی كوڕی وەلید هۆنراوەی شەڕكردنی دەركرد و دەی وت هەتا موسڵمانەكان لەبەریان كرد بوو دەیان وت: وامحمَّداه، كە هۆنراوەیان دەوت بەسەر پێغەمبەر ﷺ، بەمەش گڕوتین لە دڵی موسڵمانان زیادی كرد، ئەم كەڵە پیاوە جۆشی سوپاكەیدا بۆسەركەوتن دەیفەرموو: موسەیلەمەی كەذاب

---

(١) فقام عمار بن ياسر، وكان من حفاظ القرآن، يقول: يا أهل القرآن، زينوا القرآن بالفعال. فينشط أهل القرآن، ويهجمون هجومًا شديدًا على المشركين، ويطلق خالد بن الوليد شعارًا للمعركة حتى يحفِّز المسلمين فيقول: وامحمَّداه. فازدادت الحميَّة في قلوب المسلمين، وعلموا أن هذا الرجل «مسيلمة الكذّاب» ليس منصورًا من الله I، وأن النصر معهم، وأنهم إذا ماتوا ماتوا على الإيمان، وهو ميِّت على الردة؛ فهجموا هجومًا شديدًا على المشركين حتى استطاعوا أن يقحموهم إلى اتجاه الحصن الكبير، فيسرع المرتدون إلى الحديقة، وأراد المسلمون دخول الحديقة، فلم يستطيعوا دخولها لمنعة أسوارها العالية. فخرج البراء بن مالك بفكرة عجيبة جدًّا لفتح باب الحصن العظيم، فقال للمسلين: ضعوني على درع، ثم ارفعوا هذا الدرع بأسِنَّة الرماح، ثم ارفعوني، حتى أصل إلى أعلى السور، ثم اقذفوني داخل الحديقة، أَفتح لكم الباب بإذن الله. فألقوه داخل الحديقة، وتكالب عليه المرتدون، وظل يقاتل حتى وصل إلى باب الحصن، وفتح الباب، بعد أن أصابه ثمانون طعنة، وبمجرد فتح الباب، أُسقط في يد المرتدين، فهم لم يتخيلوا أن يسقط عليهم رجلٌ، ويثبت لقتالهم، ويفتح الباب، فأصاب ذلك في نفوسهم رهبة شديدة من المسلمين، وعلموا أن المسلمين منصورون، ومع ذلك قاتلوا على ردتهم.

کەسێك نیە کە لەلایەن خوای گەورەوە هاتبێت ئەگەر سەربکەوێ هێز و توانای خۆیەتی، بەڵام ئەگەر ئێوە بمرن لەسەر ئەم ئیمانە و دینداریەی خۆتان دەمرن، بەڵام موسەیلەمەی کەذاب لەسەر دینی خوا نەمرد بەڵکو لەسەر هەڵگەڕانەوەی دینەکەی مرد، کاتیك بەشەپۆل موسڵمانان هێرشیان کردە سەر موشریکەکان لەم کاتەدا بەخێرایی ڕایان کردە ناو باخچەکەوە، بەڵام بەهۆی بەرزی قەڵاکانەوە نەیان توانی بچنە ناوەوە، موسڵمانان بە بیرکردنەوەیەکی سەرسوڕمان چوونە ناو باخچەکەوە، کەسێك بەناوی (البراء بن مالك) دەڕوات بۆ کردنەوەی دەرگای قەڵا گەورەکە، بە موسڵمانەکان دەڵێت:بمخەنە سەر قەڵغانەکە و پاشان قەڵغانەکە بەرز بکەنەوە بە ددانی ڕمەکان، پاشان بەرزم بکەنەوە هەتا بەرزترین جێگای شوراکە دوای ئەوە فڕێم بدەنە ناو باخچەکە، بە پشتیوانی خوای گەورە دەرگاکەتان بۆ دەکەمەوە، ئەمە بیرکردەنەوەیەکی باشی ئەم پیاوە بە ڕێزە بووە، بەم شێوەیە موسڵمانەکان بەرزی ئەکەنەوە و دەچێتە ناو قەڵاکەوە هەتاکو دەگاتە ئەو جێگایە زیاد لە ٨٠ شوێنی لێدانی پێوە دیارە کە پێوەی دەنێن تەنها بۆ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە، کاتێك کە هەڵگەڕاوەکان ئەمەیان بینی ترسان، کە توانی دەرگاکە بکاتەوە و سوپای موسڵمانان چوونە ناو باخچەکەوە، ئەو سوارچاکە سەلماندی بۆ سوپای موسەیلەمە کە موسڵمانان هێز و توانایان هەیە بۆ شەڕکردن، دەریانخست کە سەرکەوتن هەر بۆ موسڵمانانە و بەردەوام شەڕدەکەن دژی کافر و بێباوەڕان.

موسڵمانان دەچنە ناو باخچەکەوە و دەست ئەکەن بەشەڕکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا و هەتا دەگەنە کوشتنی (محکم بن الطفیل) وەزیری موسەیلەمەی کەذاب، موسڵمانان بەکرداری دەریان خست هێز وت وانای خۆیان، لاواز بوونی نفوسی هەڵگەڕاوەکان، زۆریان لێ کوژران هەتا

موسڵمانێك دەچێتە سەر موسەیلەمەی کەذاب، کە ئەو موسڵمانە داخی زۆری لەدڵایە و هەست دەکات گوناهێکی گەورەی کردووە لەسەردەمی جاهیلیەتدا، لەم کاتەدا کە ڕمەکەی هەڵدەگرێت و دەیچەقێنێتە ناو دڵی بانگەوازخوازێکی پێغەمبەرێتی کافر، لە جێگای خۆی دەیخا، ئەو کەسەی هەستا بە ئەنجامدانی ئەم کارە ئەو هاوەڵە بەڕێزە بوو کە (حمزەی کوڕی عبدالمطلب) لە شەڕی ئوحد شەهیدی کرد ناوی (وحشيّ بن حرب )ە!!! لە هەمان کاتدا سەری موسەیلەمەی کەذاب لێ ئەکرێتەوە بەدەستی (أبي دجانة)، لەدوای ئەوەی کە سەری موسەیلەمە لێ ئەکاتەوە تیرێك دێ و ئەیدا لە ئەبو دجانە و شەهید دەبێت. لەدوای کوژرانی موسەیلەمەی کەذاب هەڵگەڕاوەکان هیچ شتێکیان نەماو لووت بەرزیان لەناو چوو، هیچ شتێکیان نەکرد و خۆیان دا بەدەستەوە، ژمارەی کوژراوانی هەڵگەڕاوەکان ٢١٠٠٠ کوژراو بوون، سوپای موسڵمانان ١٢٠٠کەسیان لێ شەهید بوو، ٥٠٠ کەسیان حافزی قورئان بوون.

لەدوای سەرکەوتنی ئەم جەنگە..خالیدی کوڕی وەلید ڕووی کردە قەڵاکانی تر بۆ ئەوەی بە تەواوەتی لە دەست هەڵگەراوەکانی پاکبکاتەوە، بەڵام کەسێکی تر لە هەڵگەڕاوەکان بەدیار کەوت بەناوی (مجاعة بن مرارة) کە پێشتر دیل بوو لەبن دەستی موسڵمانان، لەوێ لە قەڵای شوراکە ژن و منداڵی لێبوو فەرمانی کرد بەوەی جلی سەربازی بکەنە بەریان و شمشێریان بەدەستەوە بگرن چونکە زۆربەی پیاوەکان هەڵهاتبوون، ئەمەش تەنها بۆ ئەوە بوو کە خالید و سوپای موسڵمانان بزانن کە هێشتا هێزیان ماوە!..

داوا دەکات لە خالید ڕێکەوتن ئەنجام بدەن، خالیدیش ڕەزامەندی خوای لێبێت دەزانێت سوپاکەی ماندووە ڕێکەوتن بەچارەسەر دەزانێت..

لەم کاتەدا خالید دەڕوات ڕێکەوتنێك بکات لەگەڵیاندا کە بێنە ناو ئیسلامەوە لەبەر ئەوەی نایەوێ بچێتە ناو شەڕێکەوە کە دامەزراو نەبێ، هەربۆیە ڕێکەوتنیان کرد کە سێ بەشی بەروبوومی الیمامة بدرێت بە بەیتولمال، موسڵمان ببن، ئامادەی یارمەتی بن بۆ سوپای موسڵمانان، خالید زانی ئەمە دەستبڕینێکە و تەنها هەر ژن و منالْی تێدایە، لەو کاتەدا خیتابێکی ئەبوبەکری صدیق هات کە ڕازی نیە بەوەی ڕێکەوتن لەگەڵ بەنی حەنیفە بکرێت، بەڵام خالید کۆتایی بە ڕێکەوتنەکەیان هێنابوو، خالید گەڕایەوە و چووە لای ئەبوبەکری صدیق، هەموویانی لەگەڵ خۆی برد بۆ لای ئەبوبەکری صدیق و پەیمانیان پێدا، ئەبوبەکر زۆر تورەبوو بە تورەییەوە قبوڵی کردن، پاشان گەلەکەش خۆیان دا بە دەستەوە و چوون بۆ لای ئەبوبەکری صدیق.

**سوپای پێنجەم و شەشەم :**

سوپای پێنجەم بەرەو ئاڕاستەی باشوور ڕۆیشتن بەسەرۆکایەتی (خالد بن سعید) کە یەکێك بوو لە هەوەڵە سەرەتایەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ناوچەی قضاعة بۆ ناو هۆزی (قضاعة)، سوپای شەشەم بەرەو ئاڕاستەی ناوچەکانی شام ڕۆیشتن بەسەرکردایەتی(عمرو بن العاص)، ئەم دوو سوپایە هیچ شەڕێکیان نەهاتە ڕێگا، گەڕانەوە بۆ لای ئەبوبەکری صدیق، لە مێژوودا هیچ شتێك تۆمار نەکراوە لەسەر سوپای ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە.

**سوپای حەوتەم :**

هۆزی (عبد القیس) بوونیان هەیە لە بەحرەین، سەرکردایەتی ئەم هۆزە بەناوی (العلاء بن الحضرمي)ە، خالیدی کوڕی وەلید و سوپاکەی دەڕۆن

و ڕێگەیەکی دوور دەبڕن لە بیاباندا، تادەگەنە ناو هۆزی (عبدالقیس) لەوێدا بنکەیەکی سەربازیان هەبوو کە لە پێش بنکە سەربازییەکەوە سوپای هەڵگەڕاوەکانی لێ بوو لە ناوچەیەك پێی ئەوترا (هَجَر)، هۆزەکان لە هەندێك ناوچەدا لە دینی ئیسلام هەڵگەڕابوونەوە سەرەکیترینیان هۆزی (عبدالقیس) بوو، دێیەکی بچووك بەناوی (جُوَاثی) لەسەر دینی ئیسلام مابوونەوە کە هەڵگەڕاوەکان دەوروبەریان گرتبوون لەم کاتەدا علاء کوڕی حەزرەمی نامەیەکی نارد بۆ هۆزە هەڵگەڕاوەکان کە یەکەم نامە بوو بۆ هۆزی تەمیم بەسەرکردایەتی (قیس بن عاصم) کە داوای لێکردن بگەڕێنەوە بۆ ناو ئیسلام، بە بێ شەڕکردن هاتنە ناو ئیسلامەوە کە ١٠٠٠ شەڕکەری لەگەڵ بوو، لەهەمان کاتدا (ثمامة بن أثال) لەگەڵ ١٠٠٠ کەس لە بەنی حەنیفەوە هاتنە ناو ئیسلامەوە هەرچەندە (ثمامة بن أثال) خۆی هاوەڵی بەرێزی سەروەرمان بوو خۆی لە هەڵگەڕاوەکان نەبوو، بەڵام لە کاتی گەیشتنی سوپاکان بە یەکتری (الجارود بن یعلی) توانی بە سوپاوە بڕوات بۆ ناو لادێی جواثی بە نهێنی، دوایی کە نامەکەی پێ گەیشت لە علاء کوڕی حەزرەمییەوە بۆ ئەوەی سوپاکەی لەگەڵیدابن لە هجرە توانی ئەو گەمارۆیەی بشکێنێت کە بەسەریان سەپینرابوو لەلایەن هۆزە هەڵگەڕاوەکانەوە.

شەڕ دەستی پێ کرد لەدەوری سوپای موسڵمانان بەسەرۆکایەتی (العلاء بن الحضرمي) و لەنێوان سوپای هەڵگەڕاوەکان بەسەرکردایەتی(النعمان بن المنذر)، ئەم شەڕە یەك مانگ بەردەوام بوو، سوپاکان هەموو خەندەقیان هەبوو لە دەوری خەندەقەکانا بوون، ڕۆژێك علاء کوری حەزرەمی گوێی لە دەنگە دەنگێکی زۆر سەیرە وەك گۆرانی بڵێن وابوو دەنگەکە لە بنکەی سەربازی هەڵگەڕاوەکان دەهات، زانی سەرخۆش بوون،

سوپا ئامادە دەکات شەو هێرش دەکاتە سەریان زۆریان لێ دەکوژێت، ئەو هەڵگەڕاوانەی کە لەدەوروبەری عەلاء کوڕی حەزرەمی دابوون نامێننەوە ڕادەکەن بۆ (جزيرة دارين) کە لە نێوانیاندا دەریایەك هەیە، بە کەشتی دەپەڕێنەوە بۆ جەزیرەی دارین، کاتێك موسڵمانەکان ئەمە دەبینن بە مەلەوانی دەتوانن بپەڕنەوە تادەگەنە جزیری دارین، لەوێ دەبینن هەموو هەڵگەڕاونەتەوە و هیچ هێزێکیان لەبەردەستا نەماوە بۆیە زۆریان لێ کوشتن و بە بێ ئەوەی کەسێك لە موسڵمانەکان بکوژرێت، کاری موسڵمانان بە شمشێرەکەیان بوو، بەو شێوەیە موسڵمانە سەربەرزەکان بە کەشتی هەڵگەڕاوەکان بە سەرکەوتوویی دەگەڕێنەوە.

**سوپای هەشتەم و نۆیەم :**

لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو برا سەرکردایەتی (عمان)یان دەکرد بەناوی (جَيْفَر وعبَّاد)، پێغەمبەر ﷺ (عمر بن عاص)ی نارد بۆ (عمان) داوای ئیسلامەتی لێکردن ئەوانیش وەریان گرت، لە دوای کۆچی دوایی پیغەمبەر ﷺ کەسێکی بانگخواز دەرکەوت بەناوی (لقيط بن مالك) کە نازناوی (بذي التاج) بوو، ئەم پیاوە بانگەوازی پیغەمبەرایەتی بۆ خۆی دەکرد، خەڵکێکی زۆر کەوتنە دوای بەڵام جيفر و عباد هەردووکیان جێگیر بوون لەسەر ئیسلام، لقيط ویستی هەموو ناوچەی عومان بگرێتە دەست بەرەو ناوچەکانی ساحل البحر ڕۆیشت، ئەبوبەکری صدیق دوو سوپا ئامادە دەکات، سوپای هەشتەم بەسەرکردایەتی (حذيفة بن محصن)، سوپای نۆیەم بەسەرکردایەتی (عرفجة بن هرثمة)بوو، هەردوو سوپاکە یەکدەگرن و بەرەو سوپای (عكرمة بن أبي جهل) دەڕۆن کە لە شەڕەکانا بەرامبەر بە موسەیلەمە شکستی هێنا بوو..

هەر لەوێ مابوویەوە بە فەرمانی ئەبوبەکر صدیق، ئەمان دەڕۆن بۆ یارمەتیدانی سوپای موسڵمانان و دژی سوپای (لقیط) شەڕ بکەن، حوذەیفة نامەیەك دەنێرێ بۆ جیفر و عباد کە بێنە ناو سوپای موسڵمانانەوە سوپای (حذیفه کوڕی محصن)..

لەو کاتەدا سوپای (لقیط) ئامادە بووە بەرامبەر بە موسڵمانان زۆر بە دڕندەیی کە هێزێکی گەورەی لەگەڵ بوو لەژێر سێبەری دوو لایەندا کە ململانێ لە نێوانیاندا هەیە و خوای گەورە لە گەڵ موسڵماناندایە بە پشتیوانی سوپای علاء کوڕی حەزرەمی، بەمەش موسڵمانان ورەیان زیاتر بەرزبووەوە و خوای گەورەش نووسیبووی سەرکەوتن بۆ موسڵمانانە، شەڕ دەستی پێکرد لقیط کوڕی مالك کوژرا هەروەها ١٠٠٠٠ هەڵگەڕاوە کوژران لە عومان، هەردوو براکە جەیفرو عەباد بە سوپاکانیشیانەوە چوونە ناو عومانەوە بۆ کارگرتنە دەست لە هەموو کاروبارەکانی عومان درایەوە بە جەیفەر و عەباد، بەڵام سوپای سێیەمی موسڵمانان دەرئەچن بۆ ناوچەیەك بەناوی (مَهَرَة) بۆ شەڕکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان، بە نامەیەك ئەبوبەکری صدیق فەرمانی کردووە کە عکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل سوپا بنێرێتە (مهرة) بۆ ئەوەی ڕەدی ئیعتیباری بۆ بگەڕێنێتەوە، دەیکات بە سەرلەشکری هەموو سوپاکان عیکرمە دەبێتە ئەمیری هەموویان..

بۆ ئەوەی سوپای سێیەم خۆیان و شوێنیان پارێزراوبێ وتی: نابێ بگەڕێنەوە بۆ شار هەتا من لەوێ ئەبینن، ئەبوبەکری صدیق ڕێنمایی عکرەمەی کرد بەوەی سەرکردایەتی سوپای سێیەم بگرێتە دەست بۆ شەڕکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان لەبەر ئەوەی لەو ناوچەیەدا زۆر هۆزی گەورەی هەڵگەڕاوی لێ بوو لە دیارترینیان کە بانگەوازیان بۆ پێغەمبەرایەتی خۆیان دەکرد لەوانە (شخریط) و ئەویکەشیان (مصبح)

بوو، دوای ئەوەی کە هەڵگەڕابوونەوە جیاوازی زۆر لەنێوانیان هەبوو، زۆریان لەیەك کوشت بوو، ئەمانەش هەموو لە پێناوی دروست کردنی دەوڵەتێکی هەڵگەڕاوە بوو، عیکرەمە گەیشت و نێراوێکی نارد بۆلای شخریط، کە هەڕەشەی لیکردن کە موسڵمان ببنەوە، پاشان ئارەزوویان هەبوو بگەڕێنەوە ناو ئیسلام، شخریط خۆی دا بەدەستەوە و هاتنەوە ناو ئیسلام، بەمەش ڕیزی موسڵمانان زیاتر توندو تیژتر بوو، هەموویان بەرەنگاری و دژی مصبح وەستانەوە موسڵمانان شەڕێکی گەورەیان کرد لەو جەنگەدا ئارامگرتوو بوون هەتا خوای گەورە سەریخستن.

**سوپای دەیەم و یانزەیەم :**

لەدوای سەرکەوتنی موسڵمانان لە(مهرة)، عیکرەمە سوپای موسڵمانانی کۆکردەوە و ڕۆیشتن بۆ یەمەن، کاتێك ڕووە و یەمەن کەوتنە ڕێ دوو سوپا لە ناو شارەکەشەوە هاتن ئەویش سوپای دەیەم بوو بەسەرکردایەتی(المهاجر بن أمية)، سوپای یانزەیەم بەسەرکردایەتی (سويد بن مُقَرِّن) بوو، سويد کوڕی مقرن بە ئاڕاستەی (تهامة) ڕۆیشت، بەڵام مهاجر کوری أمية کە ئەبوبەکری صدیق بەرەو ئاڕاستەی (صنعاء) ناردی، کە زۆرترینی هەڵگەڕاوەکانی لێ بوون، لەم کاتەدا کەسێك لە یەمەن دەرئەکەوێت بەناوی (الأسود العنسيّ واسمه عبهلة بن كعب) کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی پێغەمبەرایەتی بۆ خۆی دەکرد، خەڵکێکی زۆر لایەنگری بوو لەوانە هەڵگەڕاوەکان، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ بەمەی زانی خەڵکەکەی هەڵگەڕاونەتەوە )معاذ بن جبل) ی نارد بۆ یەمەن بۆ ئەوەی فێری فیقهیان بکات، لەو کاتەدا ئەمیری یەمەن پیاوێکی بانگخواز بوو بەناوی(شهر بن باذان)، ئەسوەدی عەنسی لەهەمان کاتدا ئەویش خەڵکی فێر دەکرد دەسەڵاتی (شهر کوڕی

باذان) لەناو ببات، ئەسوەدی عەنسی هەڵدەستی بە سوپاکەیەوە (شهر) دەکوژێت و ژنی شهر دەخوازێت کە ئافرەتێکی بەڕێزو موسڵمان بوو، زۆر خەفەت دەخوات بەوەی کە ئەم ئەیخوازێت بە زۆر داگیری دەکات.

ئەسوەدی عەنسی هەڵدەستێ بەکوشتنی موسڵمانان.. بیزانیایە هەرکەسێك موسڵمانە دەیکوشت، موعاذ کوڕی جەبەل ڕای کرد بۆ حەزرەمەوت: موسڵمانانی کرد بە دوو بەشەوە: هەندێك لە موسڵمانان لەگەڵ موعاذ ڕایان کرد بۆ حەزرەمەوت، کەسێك والی بووە لە حەزرەمەوت بەناوی (طاهر بن أبي هالة)یەکێك بووە لە هاوڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەسوەدی عەنسی لەیەمەن مایەوە لەگەڵ سێ سەرکردە بەناوەکانی : (قیس بن مکشوح، داذویە، فیروز الدیلمي).

بەڵام پێغەمبەر زانیاری هەبوو کە ئەسوەدی عەنسی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکات، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ نامەیەك دەنێرێت بۆ (معاذی کوڕی جبل) بۆ کۆکردنەوەی موسڵمانان لە دژی أسودی عنسی، معاذ کوڕی جبل هەڵدەستێ بە جۆش و خرۆش دانی موسڵمانان لە حەزرەمەوت، لەهەمانکاتدا هەرسێ هێزی هەڵگەڕاوەکە لە أسودی عنسی هەڵگەڕێنێتەوە و پاشان سەرکردایەتی یەمەن دەداتە دەست معاذ، بۆ ئەمەش معاذ بەنهێنی نامەیەك دەنێرێ بۆ قیس بن مکشوح و قیس دەنێرێت بۆ(داذویە)، هەروەها بۆ فیروز الدیلمي، پاشان ڕێکدەکەون لەسەر هاتنە ناو ئیسلامەوە و یارمەتی سوپای موسڵمانان بدەن بۆ بەدەست هێنانی ئامانجیان.

خێزانی شهر کوڕی باذان کە ئەسوەدی عەنسی کردیە خێزانی خۆی ئافرەتێکی بەڕێز بوو خەم و خەفەتێکی زۆر لە دڵیا بوو لەسەر دینی

ئیسلام مابووەوە، کچی مامی فەیروزی دیلمي بوو، فیروزی دیلمي ناردی بەنهێنی بۆ هاوکاری کردنیان لە کوشتنی ئەسوەدی عەنسی

ڕازی بوو لە شەوێکی دیاریکراودا بە ئەنجامی بگەیەنێت، دەشبێت لەو شەوەدا دەرگای کۆشك بکاتەوە ناشبێ هیچ پاسەوانێك وەستابێت لەلای دەرگاکەوە، ئەوە بوو هەرسێ سوپاکە هاتنە کۆشکی ئەسوەدی عەنسی لەو شەوەدا کە ڕێککەوتبوون لەسەر ئەوەی خێزانی ئەسوەدی عەنسی دەرگاکەی بۆ کردنەوە دوای ئەوەی شەڕابی پێدا بوو، فیروزی دیلمي چووە ژورەوە دەبینێ زۆر سەرخۆشە و بێهۆشە بە دەستی خۆی دەیخنکێنێت، بەڵام کە هەرسێ سەرکردەکە هاتنە ژوورەوە بینیان کە هۆشی هەیە و نەمردووە، قیس کوڕی مکشوح دێتە پێشەوەو سەری دەبڕێت و سەرەکەی شاردەوە، دوای ئەو ڕۆژە چووە دەرەوە بۆ لای خەڵکی (صنعاء) کۆیکردنەوە و موسڵمانێتی خۆی ئاشکرا کرد، باوەڕی بە موحەممەد هێنا و پێی وتن ئەسوەدی عەنسی درۆزنە، لەو کاتەدا سەرەکەی فڕێدایە ناو خەڵکەکەوە، هەڵگەڕاوەکان ڕایان کرد، هەندێکیان موسوڵمان بوون و هەندێکیان کوژران، پاشان الطاهر کوڕی أبي هالة بە سوپاکەیەوە هات و لەگەڵ معاذی کوڕی جبل چوونە ناو یەمەنەوە، جارێکی تر خەڵکەکە هاتنەوە ناو ئیسلامەوە، موسڵمانان نامەیەکیان نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەواڵی کوشتنی ئەسوەدی عەنسی یان پێ ڕاگەیاند..

نێرراوێك گەیشتە مدینە، بەڵام بەیانیەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، لەو کاتەدا هەواڵ گەیشت بە یەمەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد، بەو هەواڵە جارێکی تر هەڵگەڕانەوە، کە دیارترینیان (قیس بن مکشوح) خۆی بوو بەتەواوەتی هەڵدەگرێتەوە، ئەمیری سوپاکەی خۆی دەکوژێت کە داذویە، پاشان فیروزی الدیلمي ڕائەکات،

معاذ کوڕی جبل ڕائەکات بۆ حەزرەمەوت بۆ لای طاهر کوڕی ابی هاله، سەرلەنوێ قیس کوڕی مکشوح سوپا کۆدەکاتەوە بەسەرکردایەتی سوپای هەڵگەڕاوەکان لەو ناوچانەدا، ئەبوبەکری صدیق کاتیك زانیاری لەسەر ئەمە دەزانێت سوپای دەیەم بەسەرکردایەتی (المهاجر بن أميَّة) دەنێرێت موسڵمانان لە حەزرەمەوت هەواڵی ئەو سوپایە دەزانن کە کەی دێتە ناو یەمەنەوە، فیروزی الديلمي بەخۆی و سوپاکەیەوە دەچێتە ناو صنعاء، کۆبوونەوە بە هەرسێ سوپاکە دەکات و شەڕ دەست پێدەکات لەگەڵ قیس کوڕی مکشوح و شەڕێکی زۆر بەهێز دەکەن لەگەڵ یەکتردا، خوای گەورە نووسیبووی کە سەرکەوتن بۆ موسڵمانان دەبێت، قیس کوڕی مکشوح لەگەڵ (عمرو کوڕی معدیکرب) کە یەکێکە لە هاوەڵەکان بەڵام هەڵگەڕابوەوە خۆیان ئەدەن بەدەستەوە، پاشان معاذ کوڕی جبل لەگەڵ نێرردراوێکدا دەیان نێرێت بۆ لای ئەبوبەکری صدیق، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە مدینە هەردووکیان موسڵمان دەبن، پاش توڕە بوونیکی زۆری ئەبوبەکری صدیق ئیسلامەتییەکەشیان لێوەردەگرێت.

سوپای یانزەیەم هیچ شەڕێکیان نەکرد لە ناوچەی (تهامة) چونکە دوای ئەوەی موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر یەمەندا، خەڵکەکەی گەڕانەوە بۆ لای دینی خوا، بەمەش کۆتایی بەشەڕی ( الردة) واتە هەڵگەڕاوەکان هات، ئەمەش فەزڵی خوا بوو، خوای گەورە سەرکەوتنی بۆ موسڵمانان نووسیبوو لە هەموو ناوچەکاندا، لە جەزیرەی عەرەبیدا هیچ مورتەدێك (هەڵگەڕاوە) یەك نەمابوویەوە.

لە کۆتاییدا ئەم باسەم بۆ ئەوە کردووە کە خەڵکانێك پیان وایە ئێستا موسڵمانان لە بارێکی زۆر ناهەمواردان هیچ کات موسڵمانان لەم بارو زورفەدا نەبوون، بەڵام من دەڵێم ئەو کاتەی کە هەموو جزیرەی

عەرەبی هەڵگەڕابووەوە تەنها سێ جێگا نەبێت مەککە، مەدینە و طائیف و سوپای موسڵمانان ژمارەیان نە دەچووە ١٣ هەزار کەس، کارەکە زۆر لە ئێستا سەنگین تر و دژوارتر بوو، چونکە کارەکە بۆ خوا بوو توانیان بەسەر سەد هەزار کەسدا تەنها لەیەك جەنگدا سەربکەون. (فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ) عافر/ ٤٤، واتە: جا لە ئاییندە دا ڕۆژێك دێت، ئەم قسانەی منتان بێتەوە یاد، ئێستاکەش من خۆم و کار و بارەکانم دەدەمە دەست خوا و پشت بە خوا دەبەستم، چونکە بێگومان خوا بینایە بە بەندەکانی.

**کێشەی معاویە و یەزید بناسە :**

دوو خیلافەت زۆرترین قسەیان لەسەر دەکرێت و جنێو و درۆیان بەدەمەوە هەڵدەبەسترێت..

**یەکەم :** ئومەوییەکان.

**دووەم:** عوسمانییەکان.

بـــــۆ؟

لەبەر ئەوەی تەنها ئەم دوو خیلافەتە توانیویانە قەڵەمڕەوی موسڵمانان زیاد بکەن و خەڵکی بکەن بە موسڵمان و ئیسلام بگەیننە وڵاتان، هەموو خیلافەت و سوڵطان و ئەمیرەکانی تر پاراستنی موڵکی ئەم دوو خیلافەتە بوون، هەر بەم هۆکارەیە ڕقێکی زۆر لە دڵی خەڵکانێکی قین لە دڵ دروست بووە بەرانبەریان.. لە ناو ئەم خیلافەتانە کە زۆر قسە لەسەر خەلیفەکانیان دەکرێت، چەند خەلیفەیەك ئەوانیش، پیاوی مەیدانی و ئازا و سەرکردەی دلێر و ئەژدەر بوون.. چاونەترسانە کاریان کردوە بۆ ئیسلام..

لە ناو ئومەوییەکاندا..

**یەکەم:** ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب.

**دووەم:** معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان.

**سێیەم:** یەزیدی کوڕی معاویە.

**چوارەم:** هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك.

ئەم ناوانە زیاتر لە ناو شیعەکاندا و هەندێك ئەهلی تەصوف و کۆمەڵێك لە فیرقەکانی ناو ئیسلام.. چونکە بڵاوکەرەوەی ئایینی ئیسلام و هۆکاری ڕوخاندنی دوو ئیمپڕاتۆری گەورەی دونیان کە فارس و ڕۆم بوون.. ئەو دوو دەسەڵاتە بە درێژایی مێژوو تانەو تەشەریان لەم سەرکردانە داوە -ڕەحمەتی خوایان لێبێت-

لەناو عوسمانییەکاندا لەسەر چەند خەلیفەیەك قسە دەکرێت کە هەموویان پیاوی ئازاو خاوەنی جورئەت و هێز و دەسەڵات و قەڵەمڕەوی ئیسلامیان زۆر کردووە، هەمیشە ئەوروپا لە مێژووی خۆیانو خەڵکیاندا تانە و تەشەریان داوە لەم خەلیفە بەرێزانە لەوانە..

**یەکەم** : موحەممەد ئەلب ئەرسەلان.

**دووەم** : موحەممەد فاتیح.

**سێیەم:** سوڵطان بایەزیدی دووەم.

**چوارەم** : سوڵطان سەلیم قانونی.

**پێنجەم:** سوڵطان عەبدولحەمیدی دووەم.

ئەمانیش قسەو باسیان زۆر لەسەر دەکرێت لە ئەوروپا و ئاسیای ئەدنا.(نزیك).

لەناو ئومەویەکاندا دووکەس زۆر قسەیان پێدەوترێت کە معاویە و یزیدی کوڕیتی.

**معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، بۆچی قسەی پێدەڵێن؟**

لەبەر ئەوەی.. کاتبی پێغەمبەری خوابووە ﷺ زۆرێك لە نامە و ئایەتەکانی قورئان کە نووسراوتەوە بە دەستی ئەم پیاوە بەرێزە جەنابی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان نووسراوەتەوە.. قسە وتن بە معاویە واتا شکو گومان خستنە سەر پێغەمبەرﷺ و ئایەتی قورئانی و پاشان کاری دبلۆماسیەکانی، نزیککردنەوەی لە خۆی و.. پاشان چەندین فەرموودە هەیە کە باس لە باشە و دینداری و ئازایەتی و هیدایەتی ئەم هاوەڵە بەرێزەی پێغەمبەرمان دەکات.. کە بوخاری و موسلیم و پاشان شەش فەرموودەوانە ڕاستەکە باسیان لێوەکردووە..

**بۆ پێغەمبەر ﷺ لە خۆی نزیك دەکاتەوە؟**

لەدوای کوژرانی ئەبوجەهل لە شاری مککە ئەبوسوفیان دەسەڵات و تەواوەتی ئەدرێتە دەست، حوکومڕانی قورەیش لە مککەدا شێوەی کۆنفیدڕاڵی ئێستای وەرگرتبوو.. لە ئیدارە و بەڕێوەبردنی وڵات ئەم خێزانە توانایەکی بێوێنەیان هەبوو، چونکە بەدرێژایی مێژوو خاوەنی ئەزموون بوون لە ڕووی ئیداری و فەرمانڕەوایی و کاری ئابوری..هتد..

معاویە لە ساڵی ٧ ی کۆچی بە دزی باوکییەوە موسڵمان دەبێت؛ ناوێرێت ئیسلامی خۆی ئاشکرا بکات، چونکە باوکی دەسەڵاتێکی گەورەی هەبوو لەلایەن قورەیشەوە.. پێدەچێت هەر ئاڕاستەی پێغەمبەرمان بووبێت کە خۆی ئاشکرا نەکات، بەڵام کارەگەورەکەی معاویە لێرەوە

دەست پێدەکات.. هەمیشە هەواڵنێری بووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە معاویەوە-ڕەزامەندی خوای لێبێت- هەواڵی ناو قورەیشی بۆ دەهاتەوە.. ئەمە هۆکاری ئەوەیە کە پێغەمەبەری خوا لە خۆی نزیك کردووە، پاشان.. لە دوای موسڵمان بوونی خێزانەکەشیان باوکی پاشان هیندی ژنی ئەبو سوفیان، دەستێکی زۆر باش بوون بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام، پێشتر چۆن لە ناو موشریکەکاندا هێزێکی گەورە و بە توانا بوون دژی موسڵمانان، هاتنە ناو ئیسلامیانەوە ئەو هێزە گەورەیە بوون کە ئیسلامی پێ عەزیز بوو، لەوانە نەهێشتی هەڵسانی خەڵکی مککە دژی سوپای پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەتحی مەککەدا، لەجەنگی یەرموکدا هیند چۆن لە ئوحودا هانی سوپای موشریکی ئەدا کە دژی موسڵمانان بجەنگن، بۆ پاككردنەوەی ئەو کارەی لە یەرموك هانی سوپای موسڵمانی ئەداو لە پشتی جەنگەوە خۆی جەنگی دەکرد و سەنەدێکی باشی موسڵمانان بوو، ئەبو سوفیان لە حونەین پێغەمبەری خوای ﷺ جێنەهێشت تاکە کەس بوو کە ڕوومەتی نابووبە قاچی پێغەمبەروە و ڕەشمەی ئەسپەکەی پێغەمبەری ﷺ گرتبوو، تا چاوێکی لە دەست دا و پاشان لە جەنگی ڕۆمدا چاوەکەی تریشی لەدەستدا، ئەبوسوفیان باوکی معاویە بۆ ئەم ئیسلامە کوێر بوو.

کچی ئەبو سوفیان خێزانی پێغەمبەری خوابووە ﷺ ئەبو سوفیان خەزوری بووە – ڕەزامەندی خوای لێبێت-..

لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر -ڕەزامەندی خوای لێبێت- سەرکردەکان هەڵدەبژێرێت.. معاویە یەکێکە لەو سەرکردە هەڵبژێراوەکانی ئەو دەمە بۆ جەنگ دژی ڕۆم پاشان لە گەڵ یەزیدی برایدا دەینێرێت بۆ شام.. سەرکردایەتی ئەداتێ.

لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا هەمان ئیمارەت و سەرکردایەتی پێدەبخشرێتەوە، بەهۆکاری دەست پاکی و دیندار و ئازایتیەوە، هەمووشمان باش دەزانین عومەری کوڕی خەتاب کێبووە چەندەش لە معاویە ڕازی بووە- ڕەزامەندی خوا لە هەردووکیان بێت-..!

لەسەردەمی عوسماندا - ڕەزامەندی خوای لێبێت- هەمان ئیمارەت و دەسەڵاتی پێدەبەخشرێتەوە..

ئەم شیکارییە لەم ڕاپۆرتە مێژووییەدا تا ئێستا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەگەر خراپەیەك لە ڕەوشت و دینداری و دەستپاکی و ئازایەتی ئەم هاوەڵە بەرێزەدا هەبوایە، ئەوا ئەمان لە جێگای خۆیدا سڕیان دەکرد، کەسێکی وەك خالید کوڕی وەلید ڕەزامەندی خوای لێبێت کە بەدەیان جار نفوزی لە معاویە زیاتر بووە لە ناو هاوەڵاندا.. عومەری کوڕی خەتاب لە ئەمیری لایدەبات، تۆ بڵێی توانای ئەوەیان نەبوبێت کە ئەم هاوەڵەش لابەرن، بەدڵنیاییەوە توانیویانە، بەڵام معاویە وەکو ئاماژەم پێداوە لە توانا و سەرڕاستی و خۆشەویستی بۆ ئیسلام، توانای بێوێنەیە لە سیاسیەت و کاری سەربازیدا..

هەر ئەوەندە دەڵێم بەڕاستی هاوەڵی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیە وسلم)، سەروەرمان پێغەمبەر.. دەفەرمووێت باشترین جیل و ڕەوەند ڕەوەندی هاوەڵانە و دوای ئەو شوێنکەتوانی هاوەڵان و ئینجا شوێنکەوتوانی ئەوان.. تۆ بڵێی پێغەمبەرمان ﷺ معاویەی نەناسبێت، لە کاتێکدا بە وەحی ئاڕاستە کراوە، کردوویەتی بە کاتبی وەحی و کاتبی خۆشی بۆ کاروباری سیاسی و نامەی پێنووسیوە، کە هەستیارترین کارە بۆ ڕەوشی سیاسی دەوڵەتی پێغەمبەرمان ﷺ.

**معاویە دوای شەهید کردنی عوسمانی کوڕی عەفان :**

معاویە یەکێکە لە سەربازەکانی خیلافەتی ڕاشدین، لە ڕووی سەربازی و سیاسی و ئەخلاقی و پاشان دینداریشەوە داوا دەکات لە خەلیفەی دوای عوسمان کە عەلی کوڕی ئەبوتالیبە - ڕەزامەندی خوای لێبێت- کە بکوژانی خەلیفە عوسمان بە تۆڵەی خۆیان بگەیەنە..؟

پرسیار لێرەدا ئەوەیە.. ئایا ئەم داوایەی معاویە کاریکی خراپە؟

یاخود ئەم داوایەی معاویە کارێکی ناشەرعیە؟

بێگومان نەخێر داوایەکی زۆر بەجێیە و داواکەشی حەقە.. بەڵام معاویە ڕەوشی مەدینەی ئاگا لێنیە، عەلی کوڕی ئەبوتالبیش لاری لە قسەکەی معاویە نییە، بەڵام دەیەوێت ئەو تۆڵە سەندنەوەیە دوابخات، کەواتە نێوانی معاویە و عەلی کوری ئەبو تاڵیب - ڕەزامەندی خوایان لێبێت- تەنها کاتە (تەوقیتە) ئەو داوا دەکات، کە تۆڵە بسەنێتەوە عەلی دەیەوێت دوای بخات، کە لەڕاستیدا حەق لای عەلی کوری ئەبوتالیبە، لێرەدا دەبێت درۆیەکی چاو زەق بۆ ئەوانەی کە دەڵێن: معاویە هەوڵی بۆ کورسی بووە ڕوون بکەمەوە..

لە هیچ جێگایەکی مێژوو یاخود لە هیچ هاوەڵێکی بەڕێزی پیێغەمبەرە ﷺ نەهاتووە لەیەك جێگادا کە معاویە داوای خیلافەتی کردبێت، یان بۆ دەسەڵات هەوڵی دابێ، تەنها ئەوە قسەی شیعەیە و لێکدانەوە و شیکاری د. عەدنان ئیبراهیمە بێ بەڵگە لە ڕووی ڕەد فیعلەوە (کاردانەوە) لەگەڵ زانای نەجد ئەو تەحلیلە دەکات دەڵێت لە مێشکی معاویەدا هەوڵی خیلافەتی داوە، ئەم قسەیەش لە ڕووی زانستیەوە هیچ قیمەتی نیە و

هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، تەنها شیکاری د.عەدنان ئیبراهیمە، پاشان بەنیسبەت ئەوەی کە دەڵێت: معاویە و مەشروب خۆر بووە ئەو قسەیشی ڕاست نیە، بەڵکو تەدلیسی کردوە لە فەرموودەکەیدا وەك خۆی باسی نەکردووە کە کاتێك «بوریدە لەگەڵ باوکی دەچنە» لای معاویە نانیان بۆ دادەنێت، دەڵێت ئەم خواردنەوەیە ماوەتەوە واتا بۆنی ترشاوی لێدێت، کە ماستاوە یاخود وەك دۆ، چونکە هەر خواردنەوەیەك بمێنێتەوە هەڵبگرێت بەتایبەت ماستاو دۆ بۆن گروز یان بۆن دڕنی لێدێت، لە کوردەواریی خۆشماندا وای پێ دەڵێن، لەو زەمەنەدا ئاو.. یاخود شەربەتی خورما یاخود ترێ کە دەکرا بە شراب و مەی هەڵدەگیرا و دەترشێنرا تا کاری دەکردە سەر دڵ و دەروون و مێشکی خەڵکی و مەستی دەکردن، بۆیە بوریدە ئەم قسەی وەك پرسیارێك لە معاویە دەکات، ئەمەش وەڵامی معاویە کە دەفەرمووێت بوریدە من لە سەردەمی جاهیلیشدا مەی و عارەقم نەخواردووە، ئێستا کە پێغەمبەر حەڕامی کردووە چۆن دەیخۆم، کە دەڵێت فەرموودەکە لە گێڕانەوەی ئیمام ئەحمە دا هەیە ڕاستە هەیە بەم شێوەیە کە من باسم کردوە، بەڵام لە گێڕانەوەی موسلیمدا هیچ بنەمایەکی نیە، قسەی گیرفانی د. عەدنان ئیبراهیمە، کە بەو شێوە ئەو دەیکات، بە نیسبەت ئەوەی کەدەڵێت: جل و بەرگی حەریر و ئاوریشمی لەبەر کردووە، ئەمەش لە هیچ جێگایەکدا لەسەر معاویە نەوتراوە، بەڵکو لە معاویەوە دەگێڕنەوە کە خۆی فەرموودەکەی ڕیوایەتکردووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە زێر و ئاوریشم بەکارهێنانی ئەوانە هەموو حەڕامن لە سەر مینبەر خۆشی چەند جار وتاری داوە لەدیمەشقدا ئەم فەرموودەیەی دووبارە کردۆتەوە.. ئەوانەشی کە ئەم باسانەیان لەسەر معاویە کردووە هەمووی خەڵکی درۆزن و شیعە بوون بەدەم معاویەوە درۆیان هەڵبەستوە..

ئەوەی کە دەمەوێت بیڵێم، مەزڵومی و بێ تاوانی ئیمامی عوسمان وا دەکات کە خەڵکی شام بەیعەت بدەن بە معاویە کە تا تۆڵەی ئیمام عوسمان نەکەنەوە.. ئەوا بەیعەت نەدەن بە ئیمامی عەلی، - نەك - معاویە داوای ئەوە بکات خۆی ببێتە خەلیفە. ئەمەیە دەبێتە هۆکاری ئەو جەنگەی کە پێیدەوترێت جەنگی نێوانی معاویە و عەلی: لە هەردوولا هاوەڵی بەرێزی تێدایە کە دژی یەك دەجەنگن، هەندێك لە هاوەڵانیش لەگەڵ هیچیان نین وەك عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ئەبو دەردا..هتد.- ڕەزامەندی خوایان لێبێت- تا لە کۆتاییدا فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ تەحقیق دەبێت کە ئەو کەسەی یاسری کوڕی عەمار شەهید دەکات ئەوە گەل و هۆزێکی دەستدرێژکارانە..!

کە معاویە دەزانێت عەلی لەسەر حەقە فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ دێتە دی دەست بەجێ دەزانێت ئیجتیهادەکەی هەڵە بووە.. کۆبوونەوە دەکات لەگەڵ عەمری کوڕی عاص و هاوەڵە بەرێزەکانی تریدا کەئەو جەنگە ڕابگیرێت، بۆ ئەوەی چیدی تاوانبار نەبن، لێرەدا عەمری کوڕی عاص بۆ ڕاگرتنی ئەو جەنگە قورئان بەرز دەکاتەوە، ئەو کاتە ناو دەنرێت بە تەحکیم واتا ئیتر دەبیت قورئان حوکوم بکات، بۆ ڕاگرتنی جەنگەکەیە..

**ئایا معاویە لە، گەل و هۆزی باغییە :**

پرسیار لێرەدا ئەوەیە بۆ جەنگ ڕاگیرا دوای شەهیدکردنی یاسری کوڕی عەمار، لێرەدا وتەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرمووێت: ئێمە حەق و ڕاستیمان لا دیار نەبوو بۆیە بەشدار نەبووین لەو جەنگەدا وەك ئێستا بمزانیبایە کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب لەسەر حەقە جەنگم لەگەڵ دەکرد دژی معاویە، لە کاتێکدا کە ئەو بێدەنگ بووە حەقەکەی لا دیار نەبوو.. ئەمەش ئەو بەر چاو ڕوونییە دەدات بەو کەسانەی کە دەم

دەکوتنە ئەم باسانە، دەبێت ئەوە ڕەچاو بکەن کە حەق و ڕاستیەکانیان لا ڕوون نەبووە.. کە دەکەونە سەر بەڵگە و حەق ڕوون دەبێتەوە دەستبەجێ جەنگ ڕادەوستێت، چاوەڕوانی لێژنەی ئەو تەحکیمەن کە ئیتر داوای ئەوە، معاویە ئامادەیە دوای لیژنەی تەحکیم، ئیتر ئامادەیە بەیعەت بدات بە عەلی، بە درێژایی مێژووی ئەو سەردەمەی کە جەنگ وەستا تەحکیم ڕوویدا معاویە باسی خیلافەوت دەسەڵات و کورسی نەکردووە لە هیچ سەرچاوەیەکی موعتەبەردا نییە، بەڵکو خۆی لە ژێر ئاڵای خیلافەتدا دەبینیەوە، بەڵام بەیعەتی نەدابوو بەعەلی، لەبەر چاوەڕوانی تەحکیم..

خوێنەری بەرێز..

هاوەڵان هەڵە دەکەن.. بەڵام درۆ ناکەن!.. ئەمە زۆر گرنگە وەك ئەهلی سوننەت و جەماعە بیزانین، چونکە شیعە پێیانوایە هاوەڵان درۆزنن، خۆشەوسیتی هاوەڵانیش لە ئیمانەوەیە.

ئینجا وشەی دەستدرێژکەر و باغی چۆن وەربگرین ئایا بە مانای چی دێت «باغی“ واتای کوفرە یان فیسقە یان نیفاقە؟ نەخێر- بەڵکو ئەمانە نیە.. واتا دەستدرێژی کردنە.. بە نەزانی، کە حەقی بۆ ڕووندەبێتەوە ئیتر لە ئاست حەقدا بێدەنگ دەبێت، گشتی هاوەڵان هەڵەیان کردووە، بەڵام کە زانیویانە هەڵەیە دەستبەجێ لێڕاوەستاون نەیانکردۆتەوە، ئەم حاڵەتەیش کەڕوویداوە لە نێوانی موسڵمانان‌دا، من بە ڕەحمەت و خێری دەزانم بۆ موسڵمانان، چونکە ئەبیتە ئەزموون بۆ موسڵمانان کە تووشی بار و ڕەوشی وا بوون چۆن چارەسەری بکەن.. ئەویش قورئان بۆمان باس دەکات دوایی لە میدانی نێوان عەلی و معاویەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە.. خوای پەروەدگار دەفەرموێت:

وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾

واتە: ئەگەر دوو دەستە، یان دوو تاقم لە موسوڵمانان بوو بەشەڕیان، هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردە سەر لایەنەکەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کە ستەم و دەستدرێژی دەکات، تا ناچاریان دەکەن گوێ بۆ فەرمانی خوا دەگرن.. هەروەها ئەگەر لایەنە سەرکەشەکە بۆ فەرمانی خوا گەڕایەوە، ئێوە ناوبژیوانییەکی دادگەرانە لە نێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن، چونکە خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە دادپەروەری ئەنجامدەدەن.

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾

واتە: لەڕاستیدا ئیمانداران هەر برای یەکن، کەواتە هەرکاتێك لە نێوان دوو براتاندا (ناکۆکی پەیدا بوو) ئێوە نێوانیان چاك بکەن و ئاشتیان بکەنەوە، هەمیشە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت.

لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە تەنها باسی نێوان موسڵمانان و ئیماندارانە.. نە پەیوەندی بە کافر و بە منافیقەوە نیە..بەڵکو کێشەی نێوان موسڵمانە، مرۆڤیش بە سروشتی خۆی هەڵە دەکات، بەڵام هاوەڵان بەگشتی خەڵکێکی دادپەروەرن، کە زانیبێتیان هەڵەیان کردووە دەست بەجێ گەڕاونەتەوە بۆ لای خوای گەورە.

## دروستبوونی خەواریج،
## شەهید كردنی عەلی كوڕی ئەبو تالیب..

لە دوای ئەوەی كە خەواریج دروست دەبێت و دەبێتە هۆكاری شەهید كردنی عەلی كوڕی ئەبوتالیب – ڕەزامەندی خوای لێبێت- خەڵكی بەیعەت بە حەسەن كوڕی عەلی ئەدەن..

لێرەدا شیكارییەكی مێژوویی دەكەم:

ئایا ئەو كەسانەی تەعن (تاتە) ئەدەن لە معاویەی كوڕی ئەبوو سوفیان كە یەزیدی كوڕی كردۆتە جێنشینی خۆی، ئایا هەر هەمان كار نییە كە عەلی و حەسەن دووبارەیان كردووە ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت..!

حاشا كە من وەك تەعن و تانە و تەشەر ئەو شیكارییە ناكەم، بەڵام ئەو كەسانەی كە باسی دەسەڵاتی بنەماڵە و كورسی بۆ بنەماڵە دەكەن ئەوە لە عەلی كوری ئەبی تالیبەوە و حەسەنەوە دەستی پێكردووە، نەوەك معاویە و یەزید..

مانای وانیە ئەمە عەیبە بێت، یاخود خراپ بێت، خۆ ئەمكارە مقالید و سیستەمی سیاسی ئیسلام وەك دەستور و یاساو سەروەری شەریعەت و ئەمانەی هیچی تێكنەداوە، خیلافەت نەگۆڕدراوە وەك سیستەم، خۆ سیستەمەكە سیستەمی ئیسلامیە، هەر بە ڕاوێژیش بووە كە حەسەن هەڵبژێراوە یاخود یەزید هەڵبژێرراوە هەردووكیان هەر بە ڕاوێژو شورابووە، ئەویشی دەڵێت وانیە دەبێت بەڵگەی خۆی بخاتە ڕوو، وەك من چۆن بەڵگەی خۆم دەخەمە ڕوو بۆ هەمولایەك.

حەسەن کوڕی عەلی کچەزای پێغەمبەری ئازیزە، هەمیشە ڕاوێژکاری باوکی بووە و ئامۆژگاری باوکیشی دەکات لەوەی کە ئەو جەنگە لەگەڵ معاویەدا نەکات، زۆریشی پێناخۆش بووە حەسەن، باسی معاویە زۆر بە باشی دەکات، چونکە حەسەن و یەزید هەردووکیان ڕەفیق بوون لە ژێر فەرمانی یەزیددا حەسەن و حوسێن دەچنە جەنگ بۆ میسر سەربازی بەردەستی یەزید بوون.

لەدوای شەش مانگ حەسەنی کوڕی عەلی ساڵی جەماعە دروست دەکات خۆی لە کورسی دەسەڵات دادەماڵێت بۆ معاویە.. پرسیار ئەوەیە؟

ئایا حەسەن لە معاویە ترسا.. ؟ یاخود دەیزانی معاویە لایەق ترە و بە توانا ترە..، چونکە دەسەڵات و ئیدارەی معاویە لە ڕووی ئیدارییەوە زۆر لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب باشتر و بەهێز بووە، هیوادارم ئەم قسەیەم بە هەڵە وەرنەگیرێت، باس لە دەسەڵاتی ئیداری دەکەم، بەڵام پلەی عەلی کوڕی ئەبوتالب لە ڕووی ئیمانییەوە بەرزترە لە معاویە، حەسەنی کوڕی عەلیش درکی بەوە کردووە کە معاویە لێزانترە و بە تواناترە لە ڕووی بەڕێوەبردنی خیلافەت و ئەو هەموو خاکەی لەبەر دەست موسڵمانانداية دەتوانێت بیپارێزێت..

لە دوای شەهیدبوونی حەسەنی کوڕی عەلی.. موسڵمانان لەو سەردەمەدا کۆتایی فیتنە بوو.. وردە وردە دەسەڵاتی موسڵمانان بەرەو فراوانی دەچوو، هێزی گەورە موسڵمانان لە شامەوە سەرچاوەی گرتبوو.. معاویە درکی بەوە کردبوو کە ئەگەر کەسێکی تر بخاتە جێگای خۆی بێجگە لە کەسێك لەو نزیك بێت خەڵکی شام گوێ بۆ ناگرن، بۆیە یەزیدی کوڕی تا ئەو سەردەمەش نەچۆتە شام، بەڵکو لەگەڵ هاوەڵاندا لە

مككە پەروەردەبووە واتا مەبەستم ئەوەیە بە هەمیشەیی لە شامدا نەژیاوە، خۆشی و ژیان و چوونە ناو قەسری نەدیوە تا بەدوای دەسەڵاتەوە بێت، هاوڕێی کوڕە سەحابە بووە هەمیشە لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر و تەنانەت هاوەڵی حوسێنی کوڕی عەلیش بوون، بەیەکەوە بوون..

**هاتنی معاویە بۆ حەج و شورای هاوەڵان لە مککە و مەدینە بۆ یەزیدی کوڕی :**

ئەو ساڵەی کە دێت بۆ حەج، معاویە شورا بە هەموو هاوەڵان دەکات بۆ ئەوەی کە یەزید بخاتە جێگای خۆی، نەك بۆ ئەوەی یەزید خاوەنی پلەوپایەیە وەك هەندیك دەڵێن: گوایە معاویە وتویەتی من ئەم کورسییە دەدەم بە یەزید بۆ ئەوەی نەوەی من بێت لەمن دەسەڵات بگرێت، ئەم قسەیە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە، بەڵکو کە دەگەڕێت بە مککە و مەدینەدا، شورا بە هەموو هاوەڵان دەکات کۆڕای هەموو هاوەڵان ڕازین بە خیلافەتی یەزید.. تەنها سێ هاوەڵ ڕازی نین.. ئەویش»

**یەکەم :** عەبدوڕەحمان کوڕی ئەبوبەکر.

**دووەم:** حوسێنی کوڕی عەلی.

**سێیەم:** عەبدوڵای کوڕی زوبێر.

پێشتر عەبدوڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵای کوڕی عەباس ڕازی نەبوون، کە زۆرینە بەیعەتیان دایە یەزید ئەوانیش ڕازی بوون، پاشان عەبدوڵای کوری عومەر بەناو کەس و کار و بازاڕدا دەگەڕا دەیفەرموو ئەوەی بەیعەت نەداتە یەزید لە من نییە، ئینجا یەزید ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت ئەو سوپایەی کە یەکەم

جار جەنگ لەگەڵ دەسەڵاتی قەیسەر دەکات واتا غەزوی قوستەنتەنیە دەکات، ئەوە خوای گەورە لێیان خۆش بووە، چی دەڵێت کە یەزیدی کوڕی معاویە سەرکردەی ئەو سوپایە بووە.. تەنانەت کە ئەو سێ کەسەش ڕای خۆیان لەسەر بەیعەتەکەی یەزید دەردەبڕن، هیچ قسەیەك لەسەر ڕەوشت و دینداری و دەست پاکی یەزید ناکەن تەنها (عەبدوڕەحمان کوڕی ئەبوبەکر، حوسێنی کوڕی عەلی، عەبدوڵای کوڕی زوبێر) ئەمە هەموو قسەکەیانە: دەرحەق بەو بەیعەتە.. ئەویش ئەوەیە.. بەمعاویە دەڵێن: تۆ دەتەوێت دەسەڵاتی کیسرا و ڕۆمی بگەڕێنیتەوە، چونکە لای هاوەڵان دەسەڵاتی ئیسلامی لەسەر بنەمای خزم خزمێنە و کەسوکار نەبوو، بۆیە ئەوانیش بەلایانەوە سەیر دەبێت کە یەزید بکاتە خەلیفە، بەڵام بۆ خەڵکی شام و ڕۆم و عەجەم ئاسایی بوو، چونکە پێشتر ئەوان دەسەڵاتی کوڕ و باوکیان بینی بوو، بەڵام خەڵکی مککە و مەدینە ئەمیان لا نوێ بوو، ئەوەی دەڵێت: کە معاویە بە زۆر بەیعەتی سەندوە لە هاوەڵان ئەوە تانە و تەشەرە لە هاوڵان واتا هاوەڵان ترسنۆك بوون، یان سەریان شۆرکرد لە ئاستی معاویەدا..! هاوەڵان فارس و ڕۆمیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، تۆ بڵێی ئەگەر معاویە زۆرەملی بکردایە دەسەڵاتەکەیان لێوەرنەدەگرتەوە...؟، بەراستی ئەوانە هەموو تانەو تەشەرن لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ جا هەیە بە مەبەست ئەم قسەیە دەکات، هەیە بێ مەبەستە تەنها حەقەکەی لا ڕوون نیە وەك خۆی ڕووداوەکان نایخوێنیتەوە... هەیە لای شیعە و کۆماری شیعەنشینی ئێرانی خۆی خۆشەویست دەکات.

## یەزیـد بناسـە

پێش ئەوەی دەست بکەم بە باسەکە... دەمەوێت بڵێم.. کارەساتی حوسێن لە کەربەلاء.. ئەوەندە تراژیدیە، ئەوەندە کارەساتێکی بە سۆیە کە لەڕاستیدا ئەوەی دەیخوێنێتەوە یان بۆی دەگێڕنەوە چاوی پڕ دەبێت لە گریان و گیانی دەبێت بە گرکان؛ ئەوەندە بە تراژیدیا ئەو باسە کۆتایی دێت، سەرباری ئەوەش بەرانبەر بە خۆشەویسترین کەسی ئازیزمانە نوری چاومانە کە پێغەمبەری خوایە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانی و منداڵی عەلی کوڕی ئەبو تالیبی بە ئەهلی بەیت هەژمار کردوە.. بەڵکو- پلەی لە ئەهلی بەیتی خۆشی زیاتر بەرزکردونەتەوە کە ناسراوان بە ئەهلی (کیساء) واتا خێزانی ژێر کەوای موبارەکی پێغەمبەری خوان ﷺ بەسە بۆ ئەوەی کە کچەزای پێغەمبەری خوان، خوای گەورە و پەروەردگارمان بۆ حەسەن و حوسێین موعجیزەی خوڵقاندوە، کە بریتییە لەوەی لە شەوەزنگدا ئاسمانی بۆ ڕۆشنکردونەتەوە بۆ ئەوەی بە کۆڵانە تاریکەکانی مەدینەدا بە ئاسانی بڕۆن..

خۆشەویستی ئالو بەیتیش لە ئیمانەوەیە.. دیارە بە کێ دەوترێت ئالوبەیت؟، بە خێزانە بەرێزەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەموویان ئالو بەیتن..

ناو باس..

### یەزیـد کێیـە؟

یەزید کوڕی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ٢٦ یاخود ٢٧ کۆچی لەسەردەمی خیلافەتی عوسماندا لە دایك بووە. واتا لە هاوەڵان نیە..

بەڵام لە شوێنکەوتوان (تابیع) هەژمار دەکرێت لەبەر ئەوەی فەرموودەی لەپێغەمبەر و پاشان باوکییەوە ڕیوایەتکردوە «ئیبن کەثیر» باسی کردووە ڕیوایەتەکەشی لە (بدایەو نهایە) کەیدا هێناوە..( ویقول ابن کثیر: «وقد ذكره أبو زرعة الدمشقي في الطبقة التي تلي الصحابة وهي العليا، وله أحاديث، رِوى عن أبيه معاوية أن رِسول الله قال: «من يرد الله به خيرًا يفقهه في الدين». وحديثًا آخر في الوضوء، وروى عنه ابنه خالد وعبد الملك بن مروان.)

یەزید لە شام پەروەردە نەبووە، بەڵکو باوکی ناردویەتیەوە بۆ مەککە.. بۆ ئەوەی فێری دینداری و زمانپاراوی و ئەدەبی ناوچەی بیابان ببێت فێری شیعر بێت لەناو کورە صەحابەدا گەورەبێت و بۆ ئەوەی بەرگەی ئازار و ناڕەحەتی بگرێت، لە گەرما و سەرمادا بەرگە بگرێت، فێری هێز و توانا بێت، ئەمەش لە زۆرێك لە مێژووەکاندا هاتووە.. وەك «ئیبن و کەثیرو ئیبن وئەثیر و تەبەری و بەلازەری».. کە تەبەری و بەلازەری هەردووکیان نزیك بوون لەو سەردەمە و ڕووداوەکانیان گواستۆتەوە.[١]

پاشان لە زۆرێك لە جەنگەکاندا بەشدار بووە، تەنانەت ئەوەندە ئازابووە معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان کە باسی ئازایەتی یەزیدیان بۆ

---

(١) ولد يزيد أثناء ولاية أبيه على الشام في خلافة عثمان بن عفان فنشأ في عز الإمارة ومجدها، وقد عُنيَ معاوية بتربيته تربيةً عربيةً إسلاميةً؛ فقد أرسله في طفولته إلى البادية عند أخواله من بني كلب ليشبَّ في أحضان الفطرة، وخشونة البادية ورجولتها وفتوتها، وليتعلم العربية النقية، ولقد أثمرت هذه التربية في يزيد، فكان شاعرًا فصيحًا، وأديبًا لبيبًا يحسن التصرف في المواقف، حاضر البديهة، أَبيَّ النفس، عالي الهمة.) گواستنەوەی ڕاغب السرجانی لەومێژووانەی کە ئاماژەم پێکردوە وەرگیراوە بەناونیشانی «قصة الخلافة الاموية دەق لە د.)

گێڕاوەتەوە، دایك و باوكی خۆی كردووە بە قوربانی یەزید..! هەمان سەرچاوە كە ئاماژەم بۆ كردووە..

لە ئازایەتی و توانیادا بێ وێنە بوو؛ هاوەڵان لە ژێر ئاڵایدا جیهادیان كردووە لە ناودارترین هاوەڵ ئەبوئەییوبی ئەنساریە و عەبدوڵڵای كوڕی زوبێر و عەبدوڵڵای كوڕی عەباس و عەبدوڵڵای كوڕی عومەر- ڕەزامەندی خوایان لێبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: هەر سوپایەك یەكەم جار بەرەو وڵاتی قەیسەر یاخود قوستەنتەنیە بەڕێكەویت ئەو سوپایە خوای گەورە لێیخۆش بووە، سەركردەی ئەو سوپایە یەزیدی كوری معاویەیە.. ئەمەش دەقی فەرموودەكەیە لە بوخاریدایە.. دەفەرمووێت: (أول جیش من أمتي یغزو مدینة قیصر مغفور لهم.)

هەموو هاوەڵان بەیعەتیان داوە بە یەزیدی كوڕی معاویە لە ژێر سایەدا كۆبوونەتەوە، تەنها پێنج كەس نەبێت كە لەدواییدا هەندێكیان پەشیمان دەبنەوە هەر بەیعەتی ئەدەنەوە بەیەزید.. سەرەتا تەنها عەبدوڵڵای كوڕی عومەر و عەبدوڵای كوڕی عەباس بەیعەت ئەدەن، دوای ئیبنو تەیمییە لە كتێبی منهاج السنة دا دەڵێت حوسێنیش هەر بەیعەتی داوە لە كاتێكدا دەیەوێت لە عێراق بگەرێتەوە لەوێدا دەردەكەوێت.. بەڵام من- دوایی زیاتر ڕوونی دەكەمەوە ڕووداوەكان چۆن بووە.. ئەمە دەقی وتەكەی ئیبنو تەیمییەیە كە حوسێنی كوڕی عەلی بەیعەتی داوە بە یەزید (وقال شیخ الإسلام ابن تیمیة في منهاج السنة: ( فإنه رضي الله عنه لم یفرق الجماعة، ولم یقتل إلا وهو طالب للرجوع إلى: بلده؛ أو إلى الثغر؛ أو إلى یزید، داخلا في الجماعة، معرضا عن تفریق الأمة)

هەروەها.. ئیمامی زەهەبیش ئەمەی هەر پشت ڕاستکردۆتەوە، د. ڕاغب سەرجانی دەقی وتەکەی هێناوە دەفەرمووێت. ( وأما ما يخص اعتراض الحسين بن علي –رضي الله عنهما- على بيعة يزيد، فإن أهل العلم ذكروا أن الحسين –رضي الله عنه- عدل عن اعتراضه ليزيد وهمّ بمبايعته؛ حتى لا يفرق جماعة المسلمين، فإنه لما جاءته كتب أهل العراق يدعونه إليهم، ثم خذلوه، يقول الذهبي في سير أعلام النبلاء: (وبعث عبيد الله لحربه عمر بن سعد، فقال الحسين: يا عمر ! اختر مني إحدى ثلاث؛ إما أن تتركني أرجع، أو فسيرني إلى يزيد، فأضع يدي في يده، فإن أبيت، فسيرني إلى الترُك، فأجاهد حتى أموت (.

چونکە بەو پێیەی موعتەزیلە و شیعە بێت کە حوسین بەیعەتی نەدابێت بە یەزید ئەگەر مردبێت ئەوا مردنێکی جاهیلی مردووە! کە حاشا ئەمە لە نەوەی پێغەمبەری خواﷺ ناوەشێتەوە، بەڵکو کە چووە عێراق شیعە و کۆمەڵەکەی درۆیان لەگەڵ کرد..

کەواتە هۆکار چی بوو کە ئەم شۆرشانە ڕوودەدات لە کاتێکدا سێ شۆرشی گەورە ڕوویداوە لە سەردەمی یەزیدا کە کە هەرسێکیان لەسەر یەزید ماڵن..

**یەکەمیان** : شەهید کردنی ئیمامی حوسێن.

**دووەم:** گەمارۆی حڕە واتا مەککە و مەدینە.

**سێیەم:** هەڵدانی مەنجەنیق بۆ کەعبە..

شۆرشی یەکەم: عەلی ڕەزامەندی خوای لێبێت کە چووە دەرەوە بۆ ئەو جێگایەی کە عائیشە و طڵحە و زوبێر ڕوویان تێکرد لە عێراق عەلی

کوڕی ئەبوتالیب ئەبو ئەیوبی ئەنساری لێدانا، بەڵام چونکە خەڵکی زیاتر معاویەیان خۆش دەویست، حوکم و فەرمانڕەوای شاری مەدینە کەوتە دەست معاویە و ئیمامی عەلی نەیتوانی بگەرێتەوە بۆی..( ئەم مێژووە لە تەبەری و لە بابی الولایة علی البلدان باسی لێوەکردووە لەمێژوی ابن خیاط دا هەر باسکراوتەوە، لە الکامل في التاریخ باس کراوە. د. محمد عەلی الصلابی لەوانەوە نەقڵی کردوە).. لە کتێبی «سیرة امیر المؤمنین علي بن ابو طالب“

پاشان عەلی کوڕی ئەبو تالیب -ڕەزامەندی خوای لێبێت- چووە کوفە.. خەڵکی کوفە عەلییان خۆش دەوسیت بە دادپەروەری دینداریەکەی ئەوەندەی تر خۆشەویست بوو بوو.. لە دڵی خەڵکی ئەو ناوچەیەدا، هۆکاری ئەوە خیلافەتی عەلی لەو شارەدا بوو بزووتنەوەیەکی گۆڕانکاری ئابووری تییدا هەڵاوساو لە شاری سەربازییەوە بویە پایتەخت و خەڵکی ئەو شار و مەملەکەتە بوژابوونەوە.. لە دوای ئەوە کە معاویە پایتەختی خیلافەتی گواستەوە دیمەشق.. خەڵکی عێراق بەوە زۆر بێازر بوون، ئەو بزووتنەوە ئابورییە بە تەواوەتی ڕووی کردە شام، پاشان دەوڵەمەندەکانی شاری مەدینە ئەوانیش پێیان ناخۆشبوو کە پایتەختی خیلافەت چووە دیمەشق... بەڵام لە سەردەمی معاویەدا چونکە ئەهلی حەل وعەقد لە مەدینەدا بوو زۆر ئەو کاریگەریەی نەبوو، چونکە هێشتا هاوەڵان زۆربەیان لەوێ مابوونەوە، مەدینە هەر ئەو هێز و توانایەی خۆی مابوو. دوای ئەوەی کە هاوەڵان وردە وردە ڕوو لە کۆتایی بوون خەڵکی مەدینەش پێیان ناخۆش بوو..

هۆکاری سەرەکی بانگکردنی حوسێن بۆ عێراق بە هۆکاری دینداری خەڵکی عێراق نەبوو، بەڵکو- بانگکردنی بۆ بەرژەوەندی دەوڵەمەند و

دەسەڵاتدارەکان بوو، هەتا حوسێن لە مەدینەدا بوو یەزید و معاویەش ڕێزێکی زۆریان لێناوە، لە هیچ مێژوویەکدا نەهاتووە کە ئەم کەسانە دژایەتی یەکتریان کردبێت.. پاشان هیچ هۆکارێك نیە بۆ گەڕاندنەوەی حوسێن بۆ عێراق.. تەنها هاندانی هەندێك دەوڵەمەند و بەرژەوەندیخواز داوادەکەن کە حوسێن بچێتە عێراق ئەو ئەولاترە بە خیلافەت، بەیعەتی بۆ کۆدەکەنەوە ئەوەندە نامەی بۆ دەنێرن کە ئیتر موبالغەی وای تێداکراوە کە خەڵکی خوراسان و عێراق ناوچەکانی نەهاوەند و تەنانەت ئەحوازیش هەمووی بەیعەتیان داوەتە حوسێن- ڕەزامەندی خوای لێبێت-.. ئەویش موسلیمی کوری عەقیل دەنێرێت کە ئامۆزای خۆیەتی، بەڵێ خەڵکێکی زۆر لە ناوچەکانی عێراق بەیعەت کۆدەکەنەوە بۆ حوسێن ڕەزامەندی خوای لێبێت ، سەرەتا ئەویش بە هاندانی ئەو دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارانە - - ئەم هەواڵە دەگاتەوە بە یەزید کە حوسێن دەیانەوێت لەڕێگای ئامۆزاکەیەوە بەیعەت بۆ حوسێن کۆبکاتەوە- ڕەزامەندی خوای لێبێت-، یەزید وەڵام دەنێرێتەوە بۆ عوبێدوڵڵای کوری زیاد کە ئەو هەواڵەی پێدەگات، هەواڵەکەش لای ئەوانەوە نەرۆشتوە واتا ئیبن و زیاد، بەڵکو چاوی تری هەبوو لە ناوچەکەدا بۆ یەزیدی ناردووە، عوبێدوڵڵای کوری زیادیش بەمە ترس لێدەنشیت، دەیەوێت زیاتر خۆی خۆشەویست بکات لای یەزید، نامەکەی یەزید دەڵێت: ئەگەر ئەو کەسانەی کە شۆرش دەکەن دژمان ئەوا ڕێگەیان لێبگرە، ئەگەر شەڕیان کرد شەڕیان لەگەڵ بکە، بەڵام حوسێن نەکوژیت..!(يزيد بن معاوية فقد كتب إلى ابن زياد قائلاً: «قد بلغني أن الحسين قد توجه إلى نحو العراق، فضع المناظر والمسالح واحترس، واحبس على الظِّنة، وخذ على التهمة، غير أن لا تقتل إلا من قاتلك، واكتب إليَّ في كل ما يحدث من خير، والسلام».)

(د. ڕاغب سرجانی لە ئیبن عەرەبییەوە و ئیبن کەسیر لە عواصم و بدایە گواستویەتەوە لە»قصة الخلافة الاموية“).. لێرەدا دیارە کە یەزید بە ئاشکرا داوا دەکات کە حوسێن نەکوژرێت

پاشان لە بەسرەوە دەڕوات بۆ کوفە و هەر لەوێ لەگەڵ کەسێکی مەسیحی بەناوی ”سرجون» کە یەکێکە لە جاسوسەکانی دەوڵەتی بێزەنتی لەگەڵیدایە..کە عوبێدوڵڵای کوڕی زیاد بۆ خۆ زیاتر نزیك کردنەوە لە یەزید سرجونی خستە ناوخەڵکی هەستی کرد کە بە نهێنی بەیعەت دراوە بە موسلمی کوڕی عەقیل، چەند کەسێکی لە نزیکەکانی موسلیم کوڕی عەقیل گیران، موسلیم بەمەی زانی هاواری کرد لە خەڵکی کوفە کە بەهانایەوە برۆن، بەڵی لە ماوەیەکی کەمدا ٤ هەزار کەسی لەگەڵدا کۆبوویەوە، چوونە بەردەمی باڵەخانەی عوبێدوڵڵای کوری زیاد- لەعنەتی خوای لێبێت- ئەویش٣٠ کەسی لەگەڵدا بوو، بەڵام- پێشتر لە ڕێگای سرجوون خەڵکی ترەوە ئەهلی عێراق و دەوڵەمەندەکانیان پەشیمان کردبووە، دەڵێن تا ئێوارەی ئەو ڕۆژە ١٠ کەس بە دەوری موسلیمەوە نەما.. بەهەر حاڵ ئەو کارەساتە گەورە ڕوو ئەدات کە موسلیم دەکوژرێت بە تراژیدیایەکی زۆر گەورە لە ڕێگای» محمد کوڕی ئەشعەس»ەوە نامەکە فریای حوسێن دەکەوێت کە موسلمی کوڕی عەقیل دەینێرێتەوە بۆ -حوسێن ڕەزامەندی خوای لێبێت- بەڵام بەداخەوە بڕوای پێنکات، ئەوی ئەو باسی دەکات و ئەو کە پێشتر ڕوویداوە وادەزانێت ئەمە فرتو فێڵە و لێدەکرێت..

دەڕوات دەگاتە کەربەلاء ئەوەی لێرەدا ڕوون دەبێتەوە حوسێن ئامادەیە بگەڕێتەوە بۆ مەدینە و بچێتەوە یاخود بۆ ژێر ڕکێفی یەزید بچێت بۆ دیمەشق کە دەبینێت ڕاستە ئەمانە خیانەتیان کردووە.. (فقال

الحسين: «إما أن تدعوني فأنصرف من حيث جئت، وإما أن تدعوني فأذهب إلى يزيد، وإما أن تدعوني فألحق بالثغور».)، بەڵام عوبێدوڵڵا و ذولجەوشەن و سينان و سرجون ڕێگەنادەن چواردەوری دەگرن بەسوپاوە دەڵێن: دەبێت خۆت بدەيت بە دەستەوە.. ئەويش كوڕی پێغەمبەرە چۆن بەديل خۆی ئەدات بەدەستەوە لە ئازاياتی و كەرامەتی ئەودا نيە بەديلی بگيرێت، ئەوانيش بۆ خۆبردنە پێشەوە لای يەزيد ئەو كارەدەكەن ئەو جينۆسايدە ئەنجام ئەدەن، داوا دەكات حوسێن بەگەڕاندنەوە چەند جار گفتوگۆ ڕووئەدا، بەڵام ئەو زاڵمە گومڕايانە ڕێگە نادەن، يەزيديش ڕێگای دوومانگ دوورە لەوانەوە ناتوانێت كەس بنێرێت بۆلای بۆ ديمەشق، ئەم ڕووداوانەش زۆری نەخياند و ئەو تراژيديا گەورەيە ڕوويدا يەك كەس لە شيعەكانی نەجوڵان لە كاتی ڕووبەروبونەويدا لەگەڵ عوبێدوڵڵا و سوپاكەی بۆ حوسێن و ئالو بەيت، حوسێن شەهيد دەبێت و سەری دەبڕن..

پێشتريش هاوەڵان پيانگوتوبوو كە نەڕوات بۆ عێراق خەڵكی عێراق درۆزن و خيانەتكارن و ئەهلی غەدرن، باوكتيان كوشت كە عەلی كوڕی ئەبوتاليبە.. لە مێژووی ئيبن و كەسير و ئيبن عەرەبی باس كراوە بە دووردرێژی..( وروى ابن كثير أن ابن عمر لما سمع بخروج الحسين إلى العراق، لحق به، فنهاه، وعندما أصر قال: «أستودعك الله من قتيل». كما نهاه أبو سعيد الخدري، وقال: «إني سمعت أباك يقول بالكوفة: والله لقد مللتهم وأبغضتهم وملوني وأبغضوني، وما يكون منهم وفاء قط، ومن فاز بهم فاز بالسهم الأخيب، والله ما لهم نيات ولا عزم على أمر، ولا صبر على السيف».).. هەروەها لە بڕگەيە كی تردا ئيبن كەسير دەڵێت (انخدع الحسين بالأخبار التي أرسلها إليه مسلم عن بيعة أهل الكوفة

له، وقرر الخروج إلى الكوفة، فجاءه ابن عباس، وقال: «يا ابن عم، إني أعيذك بالله من ذلك، أخبرني رحمك الله، أتسير إلى قوم قد قتلوا أميرهم، وضبطوا بلادهم، ونفوا عدوهم؟ فإن كانوا قد فعلوا ذلك فسرْ إليهم، وإن كانوا إنما دعوك إلى الحرب والقتال، فلا آمن عليك أن يغرّوك ويكذبوك، ويخافوك ويخدعوك، وأن يُستنفروا إليك فيكونوا أشد الناس عليك. فقال له الحسين: إني أستخير الله وأنظر ما يكون").

کاتێك کوڕی زیاد سەری حوسێن دێنێتەوە بۆ یەزید، یەزید دەست دەکات بەگریان و زۆر قسەی بە عوبێدوڵڵا دەڵێت : بەدەم گریانەوە سەری موبارەکی حوسێن ئەشارنەوە لە دیمەشق و عوبێدوڵڵا دەکاتە دەرەوە، دەست بەجێ هەواڵی ئالو بەیتی پێغەمبەری خوا دەپرسێت..

لێرەدا پرسیار ئەوەیە ؟ زید ئەو مەلعونە بۆ ناکوژێت ؟

لەبەر ئەوەی ترسی ئالو بەیتی هەیە لەبەردەستیانە ئەگەر شتێك لە عوبێدوڵڵا بکات ئەوانیش لەوێ دیلەکانی ئالو بەیت شەهید بکەن و بۆیە بە زووترین کات "نوعمانی کوری بەشیر» دەنێرێت کە بە زووترین کات ئالو بەیت بەگەڕێننەوە بۆ مەدینە.. ئیبن و قوتەیبە ئەمەی ڕیوایەت کردووە.. دەفەرمووێت (ويروي ابن قتيبة أنه لما أدخلوا رأس الحسين وأهله على يزيد بكى حتى كادت نفسه تفيض، وبكى معه أهل الشام حتى علت أصواتهم. وقال لحامله: «لقد كنت أرضى من طاعتكم بدون قتل الحسين، لعن الله عبيد الله! أما والله لو أني صاحبه لعفوت عنه، فرحم الله الحسين! ثم أمر بإنزال أهله في داره، وأمر لهم بما يصلحهم، وكان لا يتغذى ولا يتعشى إلا عليٌّ معه، ثم جهزهم وسيَّرهم إلى المدينة مع أناس صالحين. ولما أرادوا الخروج دعا عليًّا فودعه، وقال: أما والله

لو أني صاحبه ما سألني خصلة إلا أعطيتها إياه، ولدفعت عنه الحتف بكل ما استطعت، ولو بذلت بعض ولدي، ولكن الله قضى ما رأيت، فكاتِبني، وأنْهِ إليَّ كل حاجة تكون لك )

ئەم مێژووە بە دوور و درێژی کتێبەکان باسیان لێوەکردوە سەرچاوەکانی شیعەش دان بەوەدا دەنێن کە یەزید ئاگای لە شەهیدکردنی حوسێن نییە ڕەزامەندی خوای لێبێت.. بۆ نمونە موقتدا سەدر بە ئاشکرا دانی پێدادەنێت لە کۆنگرەیەکدا لە کەربەلاء کە یەزید پەیوەندی نییە بە شەهید کردنی ئیمام حوسێن فەرموون خۆتان گوێ لێبگرن.[١]

پرسیار لێرەدا ئەوەیە.. ئەی کێ حوسێنی شەهید کرد.. ؟

- یەکەم تاوانبار عوبێدوڵڵای کوری زیادە.. لە دوای دەرکردنی لە قەسری خیلافەت لای یەزید، دوای مانگێك مارێك بە ئاشکرا لە بەرچاوی هەموو سەرباز و پاسەوانەکانیدا پێوەیدا و کوشتی هەموو گۆشتەکەشی خوارد.. بێ ئەوەی کەس بتوانێت بڕوات بەلایدا...!

- تاوانباری دووەم شەمری کوڕی ذولجەوشەنە.. ئەویش شێت بوو بە بازاڕی کوفەدا دەگەڕا و پیسایی خۆی دەخوارد و تا لە کۆتاییدا بە هەلاکەت چوو...! لەعنەتی خوایان لێبێت..

- سێیەم تاوانبار سینانە.، ئەویش شەوێك لە دەرەوە دەگەڕێتەوە سەگ دەیخوات.. هەموو ئەم ڕووداوانە مانگێك لە دوای شەهید کردنی

---

(١) ئەمەش هەر دیکۆمنتێکی ترە لە بەڵگەنامەکانی شیعە کە خۆیان دانی پێدادەنێن کە یەزید ئاگای لە شەهید کردنی حوسێن نییە، ڕەزامەندی خوای لێبێت.. http://www.dd-sunnah.net/forum/showthread.php?t=٧٩٤٥١

حوسێنی نەبرد هەموو بەو دەردە ڕۆشتن خوای گەورە تۆڵەی لێکردنەوە، بەڵام (سەرچون)، لە هیچ مێژوویەکدا ناوی نەهاتۆتەوە دوای ئەو ڕووداونە پێدەچێت گەڕابێتەوە بۆ وڵاتی بێزەنتی (رۆم).

ئەمە ڕووداوە ڕاستەکەی کە گێراومەتەوە لە مێژووە دیارەکانەوە..

پرسیارێکی تر دێتە پێشەوە، خەڵکێك لەوانەی بڵێن ئەی بۆ خەڵکێکی بێویژدان قسە بە یەزید دەڵێت: تەنانەت بە کافر ناوی دەبەن.. ئایا ئەمە جائیزە؟

**شیکاری ئەم باسە:**

لەسەردەمی یەزیدا دووکەس ڕووداوەکانیان نووسیوەتەوە، تەبەری و بەلازەری کە هەردووکیان لەو سەردەمەوە نزیك بوون ئەو سەردەمیش بەهۆکاری تراژیدیا و کارەساتەکە و دژی بنەماڵەی ئومەوی زۆربەی زۆری شیعە ڕیواتەکانی نووسیوەتەوە، گێڕانەوە تەبەریو بەلازەری هەردووکیان موعەن عەنە..واتا بە ڕاویوە هێناویانە، کە زۆربە زۆری سەنەدەکانی درۆن، نەك- لاوازن- بەڵکو- هەر درۆن، بۆنمونە لە تەبەریدا ١١٣ باسی مێژووی باس لەسەر شەهید بوونی ئیمام حوسین دەکەن ٩٩ فەرمودەیان.. نەك هەر لاوازن بەڵکو درۆزن و خاوەنەکانی هەمووی خەڵکی نادیار و درزۆنەکانن، ١١ باسی تریان لاوازە و سەنەدەکانی واقیدی و خەڵکی ترن.. مایەوە سێ باسی ڕاست کە تێدا تۆمار کراوە.. تحقیق د. ڕاغب السرجانی.

یاخود لەسەر ژیانی یەزید باس لەوەدەکات مەی خۆر و هەمیشە خەریکی ئافرەت و نویژی نەکردوە خاوەنی میمون بووە.. هەندیك قسەی نەشیاوی تر..

بەڵام هەموو مێژوونوسان تەنانەت ئیبنو تەیمییەیەش ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە کە کافر و فاجر و خراپەکار و فەرمانی کردبێت بە کوشتنی حوسین ڕەزامەندی خوای لێبێت..(قال شیخ الاسلام رحمه الله تعالی.. وَكَانَ مِنْ شُبَّانِ الْمُسْلِمِينَ؛ وَلَا كَانَ كَافِرًا وَلَا زِنْدِيقًا؛ وَتَوَلَّى بَعْدَ أَبِيهِ عَلَى كَرَاهَةٍ مِنْ بَعْضِ الْمُسْلِمِينَ وَرِضًا مِنْ بَعْضِهِمْ وَكَانَ فِيهِ شَجَاعَةٌ وَكَرَمٌ وَلَمْ يَكُنْ مُظْهِرًا لِلْفَوَاحِشِ كَمَا يَحْكِي عَنْهُ خُصُومُهُ. وَجَرَتْ فِي إمَارَتِهِ أُمُورٌ عَظِيمَةٌ: - أَحَدُهَا مَقْتَلُ الْحُسَيْنِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَهُوَ لَمْ يَأْمُرْ بِقَتْلِ الْحُسَيْنِ وَلَا أَظْهَرَ الْفَرَحَ بِقَتْلِهِ؛ وَلَا نَكَّتَ بِالْقَضِيبِ عَلَى ثَنَايَاهُ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ - وَلَا حَمَلَ رَأْسَ الْحُسَيْنِ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ -) ئەمەش لە مجموع الفتاوی دا هاتووە..

لەوانە لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە برای حوسێن شاهیدی بۆ ئەدات کە پیاو چاك بووە و دیندار.. بەناوی موحەممەدی کوری عەلی کوڕی ئەبوتالیب ناسراوە بە ئیبنو حەنەفیە، کە باسی یەزید دەکات دەڵێت: ئیماندار بووە من لەگەڵی ژیاوم بەدوای سونتەتەوە بوو دوور بوە لە مەی خواردن و کاری خراپە و مەیمونی نەبووە و نوێژەکانی ڕێك و پێك کردوە، موجاهید بووە ئەمەش دەقی فەرموودەکەی.. کە دێن دەیانەوێت باسی یەزید لێبپرسن.. زۆربەی مێژووەکانی تۆماریان کردووە.. ئیبنو کەسیر و ئیبنو ئەسیر و ئیبن و عەرەبی و تەبەریو بەلازەری.. هتد[١]

-----------------------

(١) ولما رجع وفد أهل المدينة من عند يزيد مشى عبد الله بن مطيع وأصحابه إلى محمد بن الحنفية، فأرادوه على خلع يزيد فأبى عليهم، فقال ابن مطيع: إن يزيد يشرب الخمر، ويترك الصلاة، ويتعدى حكم الكتاب. فقال لهم: ما رأيت منه ما تذكرون، وقد حضرته وأقمت عنده فرأيته مواظبًا على الصلاة، متحريًا للخير، يسأل عن الفقه، ملازمًا للسنة. قالوا: فإن ذلك كان منه تصنعًا لك. فقال: وما الذي خاف مني أو رجا

لێرەدا پرسیار ئەوەیە.. ئەی زانایەکی وەك ئیبنو جەوزی چۆن ئەو هەموو قسەی پێدەڵێت؟

وەك ئیبن کەثیر دەڵێت: مێژووی ئەمەوەییەکان زۆر بەخراپ باسکراوە، دوای ئەوانیش نووسراوتەوە زیاتر لەسەردەمی عەباسییەکان کە زۆر ڕقیان لە ئومەوی بووە نووسراوەتەوە، پاشان کارەساتەکەی ئیمام حوسێن ئەوەندە بە سۆ بووە کە وایکردووە خەڵکی زۆر جار دادپەروەرییش لەدەست بدات..

ئەم زانایانەش.. بەتاوانی دەزانن قسە وتن بە یەزید و دەبێت ڕەحمەتیشی بۆ بنێرێت..

---

حتى يظهر لي الخشوع، وأطلعكم على ما تذكرون من شرب الخمر؟ فلئن كان أطلعكم على ذلك إنكم لشركاؤه، وإن لم يكن أطلعكم فما يحل لكم أن تشهدوا بما لا تعلمون. قالوا: إنه عندنا لحق وإن لم يكن رأيناه. فقال لهم: أبى الله ذلك على أهل الشهادة، فقال: {إلاَّ مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ} [الزخرف: ٨٦]، ولست من أَمْركم في شيء. قالوا: فلعلك تكره أن يتولى الأمر غيرك، فنحن نوليك أمرنا. فقال: ما أستحل القتال على ما تريدون عليه تابعًا ولا متبوعًا. قالوا: فقد قاتلت مع أبيك. فقال: جيئوني بمثل أبي أقاتل على ما قاتل عليه. فقالوا: فمُر ابنيك أبا القاسم والقاسم بالقتال معنا. قال: لو أمرتهما قاتلت. قالوا: فقم معنا مقامًا تحضُّ الناس فيه على القتال. قال: سبحان الله! آمر الناس بما لا أفعله ولا أرضاه؟! إذًا ما نصحت لله في عباده. قالوا: إذًا نُكْرِهُك. قال: إذًا آمر الناس بتقوى الله، ولا يرضون المخلوق بسخط الخالق. لما رأى محمد بن الحنفية الأمور تسير في الاتجاه الذي لا يريده، وبدأ يظهر له سوء عاقبة تصرفات المخالفين له من أهل المدينة حينما ترامي إلى الأسماع قدوم جيش أهل الشام إلى المدينة، قرر ترك المدينة وتوجه إلى مكة، وسار أهل بيت النبوة على هذا المنوال ولزموا الطاعة، ولم يخرجوا مع أهل المدينة ضد يزيد؛ فعلي بن الحسين بن علي بن أبي طالب لم يخرج مع أهل المدينة ولزم الطاعة ليزيد.

لەوانە: ئیمام غەزالی، ئیبن و سەڵاحی شارەزوری، ئیبنو عەساکر.[١]

لە زانایانی کورد: مامۆستا مەلا کەریم و مەحوی بە شیعر باسی دەکات و مەولەویش بەهەمان شێوە باسی دەکات کە جائیز نیە قسەی پێبوترێت، هەروەها مامۆستا مەلا کەریم دەفەرموویت ئیسپات نیە کە یەزید دەستی هەبووبێت لە شەهیدکردنی حوسێن..

مەحوی دەفەرمووێت...

لەعـــنەت مەکە برا لـە یەزیـــد و ڕەوا نییـــە.
(شرعا) کە ئێمە مل کەچی شیری شەریعەتین.

لێرەدا شیکارییەکی تر دەخەمە ڕوو ئەویش ئەوەیە.. کە لە هیچ مێژوویەکدا نەهاتووە لە دوای شەهیدکردنی حوسێن.. یەزید ڕووی خۆشی دەربریبێت، تەنانەت دەڵێن هۆکاری مردنیشی دەگەڕێتەوە بۆ خەفەت خواردنی لە شەهیدکردنی حوسێن لەساڵی ٦٠ کۆچی فەرمانڕەوایی کرد تا ٦٤ واتا چوار ساڵ خەلیفە بووە.. لێرەدا دەپرسین کام هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا قسەیان بە یەزید وتوە؟

خەڵکێك دەپرسن جا هاوەڵان ئەو سەردەمە مابوون؟ بەڵێ بە دڵنیاییەوە بە هەزاران هاوەڵی پێغەمبەری خوا لە ژیاندا بوون، کۆتا هاوەڵی پێغەمبەری خوا لە ساڵی ١٠١ کۆچی وەفات دەکات ئەویش ناوی طفیل-ە. لە هیچ جێگایەکدا نابینی یەك هاوەڵ قسەی بە یەزید وتبێت، تەنانەت زەمیشیان کردبێت..

---

(١) لە کتێبی (قید الشرید من اخبار یزید) باس کراووە
لەم لینکەدا زیاد لە دەیان زانا باسیان لە باشەی معاویە کردووە
http://www.dd-sunnah.net/forum/showthread.php?t=140862

کەواتە لێرەدا ماوەتەوە بڵێم یەزید پەیوەندی نەبووە بەفەرمانکردن بە شەهید کردنی حوسێنی کوڕی عەلی ڕەزامەندی خوای لێبێت..

پاشان دێمە سەر باسی عەبدوڵڵای کوڕی زوبیر و گەمارۆی مەککە و مەدینە.. گومانی تێدانیە مەدینە شەری زۆر تێدا نەکرا تەنها لە دەوروپشتی شاردا کرا و دوایی هەموو بەیعەتیان دایەوە بەیەزید، هاوەڵان هەموو لەگەڵ یەزید بوون لە شاری مەدینەدا بۆ ئەوەی ڕێز و کۆمەڵی موسڵمانان تێك نەچێت، بەیعەتیان بۆ یەزید بە ڕەوا دەزانی.. پاشان ڕاستە کەعبە بەر مەنجەنیقدارا و جەنگ کرا، بەڵام لەوکاتەدا یەزید وەفات دەکات جەنگ کۆتایی پێدێت. لێرەدا ئەوەی کە گرنگە باسی بکەم ئەوەیە کە شیعە و مەعتەزیلە هەردوو لایان ئەم ڕووداوەیان گەورە کردووە کە پێناچیت خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرابێت، صەلابی دەڵێت : هەموو درۆ و هەڵبەستراوە کە گوایە ئافرەتی موسڵمان حوورمەتی هەتك کراوە براوە بە کەنیزەك و خەڵکێکی زۆر کەم کوژراون کە بە پەنجەی دەست هەژمار دەکرێن، چونکە نە تەبەری و نە بەلازەری کە لەو سەردەمەدا ژیاون هیچیان نەقڵ نەکردووە بە ڕاست و دروستەوە.(١)

---

(١) ئەمەش دەقی وتەکەی الصلابی یە.. أما ما ذُكِرَ حول انتهاك الأعراض أثناء وقعة الحرة فيقول د. علي محمد الصلابي: لم نجد في كتب السنة أو في تلك الكتب التي أُلِّفَتْ في الفتن، وكذلك لم نجد في المصدرين التاريخيين المهمين عن هذه الفترة وهما (الطبري والبلاذري) أي إشارة لوقوع شيء من ذلك، وهما قد اعتمدا على روايات الإخباريين المشهورين مثل: عوانة بن الحكم، وأبي مخنف لوط بن يحيى الشيعي، وغيرهما.)..
کۆتایی قسەم بەوە دێنم.. بۆ کەس لەعنەت لە عوبێدوڵڵای کوڕی زیادو ذولجەوشەن و سینان و سەرجۆن.. ناکات.. لەعەنەتی خوایان لێبێت، بۆ یەزیدی کوڕی معاویە ڕەحمەتی خوای لێبێت؟ هەست ناکەن ئەمە دەچێت گیرفانی وڵاتی شیعەنشینی ئێرانەوە؟

## کوردو جولەکە بناسە

ئیسرائیل لەبچووکترین پێناسە بۆی دەبێت وەها بیخەینە چوارچێوەی ناساندنەوە کەبریتییە لەو هێزە کەمینە عەقائیدییەی کە دەسەلاَتێکی لەسەرو سنوور و توانا و هێزی خۆیەوە هەیە، بەواتایاکی ڕوونتر ئەو کەمینەیەی کەسیاسەتی جیهان لەسەر بناغەی بەرژەوەندی ئەو دەڕوات بەرێوە.. سەبارەت بە کوردستان لەم ماوەیەدا زیاتر ئەوە تۆخ بۆتەوە لەزەمینەی سیاسی کوردستاندا، کە ئیسرائیل دەیەوێت لە کورد نزیك بێتەوە و بەهەمان شێوەش پێچەوانەکەی دروستە بەواتای کوردە دەیەوێت لە دەوڵەتێکی وەك ئیسرائیل نزیك بێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە چەند کەناڵێك لێرە و لەوێ کار بۆ ئەم ئامانجە دەکەن، ئەم دروشم و هەوڵانەش لەسۆنگەی چەند دیدێکی نەشارەزا بە مێژوو بەجوگرافیا بەنەتەوە بەسیاسەت بەئایین بەبەرژەوەندییەوە خەریکە دنەدانن بەم تێزە، ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە ئەوەتەی ئیسرائیل خاوەنی کیانی خۆیەتی بە پشتیوانی ئەمەریکا، یەکێك بووە لەو هێزانەی کە لەناوچەکەدا بێ هەڵوێستترینیان بووە لە بەرانبەر دۆزی گەلی کورد، بە پێچەوانەوە وا ئێستا سیاسەتوانە نەزانەکانی ئێمە بەمێژوو، دەیانەوێت خۆیان لەم دەسەڵات و قەوارەیە نزیك بکەنەوە، لەم چەند ڕاپۆرتەدا دەمانەوێت ئاماژە بەوە بکەین ئەگەر ئێستا سیاسییە عەیارەکان ئەوانەی کە دوای پارە کەوتوون دەیانەوێت بەناوی کورد و ئیسرائیل جۆرێك لە نزیك بوونەوە دروست بکەن، پرسیار بکەین، نزیکبوونەوە لەسەر چ بنەمایەك؟ لەچ دیدێکەوە؟ ئایا لە نزیك بونەوەی کورد و ئیسرائیل هەڵوێستی دەوڵەتانی دراوسێ (ئێران، تورکیا، ٢٢ دەوڵەتی عەرەبی) چۆن دەبێت؟ ئایا ئیسرائیل سیاسەت بە بنەمای

(ئامانج پاساوی هۆکارە) دەکات یان لەسەر ئەساسی ڕێز و خۆشەویستی و برایەتی کار دەکات؟ ئایا بەرژەوەندی ئیسرائیل لە کوردستان چییە؟ ئایا دەکرێت کوردێکی خاوەن گەلی ٩٠٪ مسوڵمان لەگەڵ گەلێکی یەهودی تینو بەخوێنی مسوڵمان، بەرژەوەندی هاوبەش کۆیان بکاتەوە؟ ئایا ئەوانەی ئەو بانگەشەیە دەکەن و خەریکی ئەم هەوڵەن، شارەزای مێژووی ئەم دوو قەوارەیەن؟ لێرەدا خوێنەر وا تێنەگات کە مەبەست لەوە بێت هیچ پەیوەندییەکی دبلۆماسی دروست نەبێت، دیارە ئەوەی کە مەبەستە ئەوەیە دەمانەوێت لە ڕووی زانستی و بەتێگەشتن لەململانێی بەرژەوەندی و لەڕێی ئەم چەند ڕاپۆرتەوە گفتوگۆیەکی مەدەنیانە لەگەڵ ئەو کەسانە بکەین کە دەیانەوێت برەو بەدۆستایەتی کورد و ئیسرائیل بدەن، دەمانەوێت ئیسرائیل وەك خۆی بناسین، نە لەدیدی عەرەبێکی ناسیۆنالیستی و نە لەتێڕوانینی ڕۆژئاواییەکی خاوەن بەرژەوەندی، بە پێچەوانەوە دەمانەوێت لە تێروانینێکی کوردی ڕەسەنی دوور لە هەموو کارتێکردنی هەواڵگیری هەر لایەنێك شیکاری بۆ ڕابردوو و داهاتووی پەیوەندییەکانی ئەم دوو کیانە بکەین، بە گەڕانەوەشمان بۆ مێژوو بۆمان دەردەکەوێت کە خەڵکی جولەکە لە کوردستان بوونیان هەبووە و توانیویانە تا ڕادەیەك زۆر بە ئاشتیانە بژین، بەڵام زۆرینەی ئەوانەی کە جولەکە بوون هەرگیز خۆیان بە کورد نەزانیوە (بە واتای لە هەوڵی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کورد نەبوون) هەمیشە ویستویانە بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان کە دەوڵەتی ئیسرائیلە.

ئیسرائیل ئەو دەسەڵاتەی کە بەخوێنی جومجومەی منداڵ هاتۆتە سەر دەسەڵاتی سیاسی، بەزۆری و ئاگر و ئاسن خۆی سەپاندووە، دەمەوێت ئەوە بەخوێنەر بڵێم ئایا ئەگەر ئیسرائیل دۆستی کوردە بۆ لەو هەموو

نەهامەتییەی کە گەلی کورد هەیبوو هەڵوێستی نەبوو؟ گەر هەڵوێستی هەشبووبێت ئەوا لەپێناو بەرژەوەندییەکی تەسکی خۆی بووە، کە دواتر ڕوونی دەکەینەوە! بۆ لەکاتی قاتو قڕی کورد، لەکاتی شۆڕشەکانی، لەکاتی وێرانکردنی گوند، لەکاتی هەوڵدانی حکومەتی بەعس بۆ نەهێشتنی کیانی کوردی، لەکاتی ئەنفالی ١٨٢ هەزار کەسی، لەکاتی کیمیابارانی ٥ هەزار کوردی بێتاوان، لەکاتی کۆڕەو سەرجەم نەهامەتییەکانی دیکەدا دەنگی نەبوو؟ ڕەنگی نەبوو؟ بەلایەنی کەمەوە ناڕەزایەتی دەرنەبڕی؟! لەسەردەمی کۆنیشدا کاتێك کە (مەلا مستەفای بارزانی) چوو بۆ میسر وەك مامۆستا شەیدا ئاماژەی بۆ کردووە کە خۆی یەکێك بووە لەپارێزەرەکانی ئەودەمەی بارزانی، بەعسیەکان کەسەر بە (میشل عەفلەق) بوون لەگەڵ ئیسرائیل ویستیان ئەو دەمە بارزانی تیرۆر بکەن لە وڵاتی میسر، دەزگای هەواڵگری میسری کارەکەی فەشەل پێهێنا، پاشان ئەو دەمە کورد ویستی ئاگری نەورۆز بکاتەوەو هەر بە فیتی ئیسرائیل بەعسییە عەفلەقیە یەهودییەکان بوو کە نەیان هێشت تەنانەت ئاگری نەورۆز بکرێتەوە، وە هەر بە فیتی ئیسرائیلییە عەفلقیەکان بوو کە ئەو دەمە ڕادیۆی دەنگی قاهیرەی کوردی داخرا، کێ بەرپرسە لەم هەموو تاوانەی ئیسرائیل بەرانبەر بە کورد کردوێتی؟ پاشان کە ئێستا لە گۆڤارەکانیاندا فرمێسکی تیمساحاوی دەڕێژن بۆ (پەکەکە) دڵسۆزی خۆیان نیشان ئەدەن، هەر موسادی ئیسرائیلی نەبوو سەرکردەی کورد (عەبدوڵا ئۆچ ئالانی) تەسلیم بە میتی تورکی کرد؟ پاشان من نازانم ئەم سیاسیە بێ هەڵوێستانەی کورد چۆن دەیانەوێت لەگەڵ ئیسرائیل نزیك ببنەوە کە هەموو دراوسێکانیان دوژمنی ئیسرائیلن، لەکاتێکدا کورد ناتوانێت، بەرگری لە تۆپبارانی ئێران بکات بۆ سەر ناوچە سنوورییەکانی، ئاخر

کام سیاسی هەیە لە زەمینەیەکی هەواڵگری ئێرانی لەگەڵ میتی تورکی لەگەڵ سوریا و عێراقی شیعە و سوونی ئەگەر نەزان نەبێت، ستراتیژی خۆی لەگەڵ ئیسرائیلێك دادەرێژێت کەگەر یەك خاڵی هاوبەشمان هەبێت ئەوا بەپێچەوانەوە سەدان خاڵی ناچوون یەکمان هەیە، پاشان ئیسرائیل کام هەڵوێستی نواندووە بۆ کورد تا دڵمان پێی خۆش بێت؟ چاوی لە ئێران سوور کردووە بۆ تۆپبارانکردنی ناوچە سنووریەکان؟ یاخود بۆ هێرشی پەکەکە لە قەندیل یارمەتی گەریلە ئافرەتە ڕوو سوورەکانی کوردی دا؟ یان لەبەرانبەر ئەمانەدا بێ دەنگ بوو؟ ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە کە ئەڵێن جولەکە هیوای سەربەخۆیی بۆ کورد دەخوازێت، لە هەمووی ناهەموارتر ئەوەیە کە جولەکە خۆی دەستی هەبووە لە پارچە پارچە کردنی کوردستان هەر لەسەردەمی یەهودی (دەونەمەوە) کە (سەبەتایی تەسڤی) دروستی کرد تاکو سەردەمی ئەتاتورکی فاشی، کە ململانێیەکی نێوان بەریتانیا و ئیسرائیل و ئەو دەمەی تورکیا وای کرد کە کوردستانی گەورە مەبەست لەدایکی کوردستانە کە بەشی باکوورە لە لۆزاندا پەشیمانیان دەربڕی بۆ بوون بەدەوڵەتی کوردستان.

کۆتایی وتەکانم بەوە دێنم بە درێژایی مێژووی خەباتی گەلی کورد، ئادەی بزانین کام لە ئیسرائیلی کورد بەشدار بوون لەم شۆڕشانەی ئێمەدا هەر لە سەردەمی قازی تا مەلامستەفای بارزان و شۆڕشی نویێ گەلەکەمان، کێ لە کوردی ئیسرائیلی بەشدار بوو؟ یان کام هەڵوێسی ئیسرائیلی هەبوو لەو شورشانەی کورد؟

ئەم ڕاپۆرتە سەرەتایەکە بۆ چوونە ناو باسەکە، بەدوای ئەم ڕاپۆرتە چاوەڕوان بن بەبەڵگە و دیکۆمێنتەوە خیانەتەکانی ئیسرائیل دەرهەق بە کورد و کوردستان بلاَودەکەینەوە.

**جولەکەکان لە سلێمانی دزی و جاسوسیان دەکرد :**

لە باسی پێشوودا ئاماژەمان بەوە کرد کە ئیسرائیل بە هیچ شێوەیەك ستراتیژی لەگەڵ ئەم هەرێمەی ئێمە و ناوچەکە بەگشتی ناگونجێ، هەروەها ئاماژەشمان بەوەکرد کە بەدرێژایی مێژووی خۆی، جولەکە لەخاکی کوردستاندا هیچ چاکە و باشییەکی بەرامبەر گەلی کورد نەبووە.

وەکو دەوڵەتی ئیسرائیلیش هەمیشە دەوڵەتێکی بێ هەڵوێست و خاوەنی بڕیارێکی جوامێرانە نەبووە بەرامبەر بەگەلی کورد.

بۆیە باسی ئەمجارەمان تەرخان دەکەین بەرامبەر بە جولەکەکانی شاری سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەری کە چەند زەرەرمەند بوون بەرامبەر بە خەڵکی سلێمانی و ناوچەکە و چەند دزییان لە خەڵکی شاری سلێمانی کردووە.

بۆ ئەم مەبەستەش چەند بەڵگەیەکی مێژووی دەخەینە ڕوو:

لە دوای شەڕی جیهانیی دووەم لەسەردەمی (ڕەشید عالی گەیلانی) دا گرانی ڕووی کردە شاری سلێمانی لە نێوان ساڵی ١٩٤٦-١٩٥٤، دا کە خەڵکی ئەودەمەش شۆڕشیان دەکرد بەرامبەر ئیمپریالیزم و حکومەتی پاشایەتی و دەرەبەگ و ئاغای ئەو سەردەمە.

لەشاری سلێمانی ڕۆژی واهەبوو دووجار تا سێ جار خۆپیشاندان دەکرا، خەڵکی شاری سلێمانی زۆر فەقیر و لێقەوماو و بێ کەس بوون هەروەها خەلکی لەو کاتەدا بۆ عانەیەك دەچوون بە ئاسماندا، لەهەمانکاتدا جولەکەکان لەناو شاری سلێمانی بڵاوببونەوە.

لەناسراوەکانیان (مسقێل، ڕابین، ڕافائیل، جوزێف، بنیامین) بوو، هەروەها (موشی و مناحیم ) لەناودارەکانی ناو شارۆچکەی پێنجوێن و هەڵەبجە و سلێمانی بوون.

ناودارانی ئەودەمەی ناو شاری سلێمانی لە بنەماڵە نیشتیمان پەروەر و نەجیبزادە و خانەدانەکان کە بریتی بوون لە بنەماڵەی شێخ مەحمودی حفید، شێخ بابا عەلی و شێخ لەتیف ی کوڕی، شێخ نوری نەقیب، شێخ قادر برای شێخ مەحمود، حاجی ملا محێدین، حاجی سعید ئاغا و ماڵی عەنبەر خان و ماڵی کاکە ڕەشی سەرشەقام و عبدالله ئاغا و مصطفی ئاغای برای لەسەرشەقام. شێخ محەممدی خاڵ و شێخ لەطیفی دانساز، ماڵی قەزازەکان، ماڵی یەك شەوە، ماڵی قەفطان، عیزەت بگ، تۆفیقی ئاغا فەتحوڵڵا، زانای ئایینی باناوبانگ ملا ئەحمەدی خانەقا، ماڵی عەلی سەرکارێزی، حاجی ملا عەزیز، شێخ سەلام، ماڵی مەلا حوسێنی پیسکەنی.

لە شاعیر و بەناوبانگەکانی شاری سلێمانی و دەوروبەری (پیرەمێرد، گۆران، بێکەس، قانع، زێوەر، هەردی و گەلێکی تریش) لەهەمان کاتدا لە ئافرەتە بەناوبانگ و شۆڕشگێڕەکانی شاری سلێمانی ( حەپسەخانی شێخ قادر، ئایشەخانی ژنی شێخ جەلال، ئامەخانی نەزەد، زاراخانی ژنی عیزەت، ڕەحمەخانی حاجی سەعید، ئایشێ خانی حاجی حەمە سەعید، فاطمە خانی عەبدوڵڵە ئاغای سەرشەقامی، ئامەخانی ئەمین ئەفەندی کاتب موسەریف، مەلاڕەخانی ئەمین ئەفەندی، ئایشەخانی حاجی حەسەن، (ئامەخانی نەقیب و عەنبەرخان و.......هتد)

بنەماڵە ڕەسەنەکانی ئەو سەردەمە لەناو شاری سلێمانی ٢٥٠٠ دوو هەزار و پێنج سەد بنەماڵە لە سلێمانیدا دەژیان، بەپێ ی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ دانیشتوانی سلێمانی نەدەگەشتە ٣٠٠٠٠ سي هەزار کەس. بۆیە لەم ڕاپۆرتەشدا ئاماژەمان کردووە بەم ناوانە چونکە ناسراوترین خەڵکی شاری سلێمانین و تا ئێستا بەرچاوترین خەڵکی شاری سلێمانین، هەروەها ئەوان شاهیدن بەسەر جولەکەکانی شاری سلێمانی و دەوروبەریشی کە

چەند خراپەکار و دزییان کردووە لە خەڵکی کورد،) ئەودەمە دەزگای تموین) بایەعی هەبوو کە کەلوپەلی دابەش دەکرد بەسەر خەڵکی دا کە شەکر و چا و و خام و بلوری و صابونی ڕەقی و صابونی لۆکس و چیتی شیرکەتی و..... هتد، دابەش دەکرا بەسەر خەڵکیدا، جولەکەکانی ئەو سەردەمە بەتایبەتی مسقێل لەگەڵ ڕافئیل (کە بە میرزا ناسرا بوو) ڕێککەوتبوون لەگەل کارمەندەکانی ئەو دەزگایە کە بەهەموو شێوەیەك بازاڕی سلێمانی یان مۆنۆپۆل کردبوو، ئەودەمە لەڕێگای حزبی کۆمۆنستی عراقی و پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی ڕزگاری و حزبی هیوا لە ڕێگای ڕێکخستنەکانیانەوە توانیان ئەو خەڵکە دزە زۆرێك لەگەڵ جولەکەکان دەستگیربکەن.

فەقێ ڕەشیدی قەشان پیاوێکی بەڕێزی شاری سلێمانی بوو دوکانێکی گەورەی لەشاری سلێمانیدا هەبوو لای قەسرەکەی توفیق قەزازەوە، لەدوای گرتنی مسقێل و جوزێف و ڕافئیل و هەندێکی تر لەو جولەکانەی تر کە بەگران شتیان بەخەڵکی دەفرۆشتەوە ئازادکران بەو مەرجە ئازاد کران کە دەبێت جاسوسی بۆ حکومەتی پاشایەتی و ئیمپریالیزم بکەن. بڕیار وابوو کە مسقێل هاتە دەرەوە ناوی هەرچی (شۆڕشگێڕەکانی شاری سلێمانی بوو بیدا بە) حسن ساقی و حسێن ساقی برای کە ئەم دووانە بەبنەچە تورکمان بوون و دوو جەلاددی شاری سلێمانی بوون و هەموو جولەکە و یەهودییەك ببون بە جاسوس بەسەر خەڵکی یەوە.

هەروەها مسقێل و جوزێف کە ئازاد کران دامەزران لەلای فەقێ ڕەشیدی قەشان بە باش کاتب، لەساڵی ١٩٤٧ دا کە زۆرترین خۆپیشاندان ڕووی ئەدا لەشاری سلێمانی، خۆپیشاندانێکی گەورە لەبەردەم دوکانەکەی فەقێ ڕەشیدی قەشان ڕوویدا بۆ جۆش دان و گەرمکردنی خۆپیشاندانەکە،

مسقێل هاواری کرد بژی برایەتی کورد و ئیسرائیل و لەو کەسانەی زوو دەرباز بوون نەگیران لەو خۆپیشاندانە ( محەممود شەیدا، حوسینی سەید گوڵ، مەجید عەبدوڕەزاق زامدار، حوسێنی حاجی ئەمین و چەند قوتابییەکی تر) دەرباز بوون، خەلکی شاری سلێمانی ١٧٠ کەسیان لێ گیرا لە خۆپیشاندانەکە، وە ئەوانەشی کە دەستگیریان کرد بوون هەر بەفیتی مسقێل و ماناحم و ڕابین.....هتد.هەروەها جولەکەکانی شاری سلێمانی کاریان دەکرد لەسەر ئەوەی کە ئەو بنەماڵە ناودارانە حەیا و شەرمیان بتکێنن و بۆ ئەوەی سەرشۆڕیان بکەن لەناو خەڵکیدا بۆ ئەوەی لەهەمان کاتدا قسەی خۆیان بەسەریاندا زاڵ بکەن. دەستیان تێکەڵ کردبوو لەگەڵ ڕژێمی پاشایەتی دا بۆ ئەوەی ڕۆژنامەی ژین و گۆڤاری گەلاوێژ وەهەروەها زمان حاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان (ڕۆژنامەی خەبات) کە زمانحاڵی پارتیی بوو، ئەیانوویست لەناو خەڵکیدا خوێنەری ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە کەم بکەنەوە هەتا دابخرێ..

## جوولەکە و عەرەب بناسە

سەرەتا دەبێت ئەوە باس بکەم عەرەب لە سێ هۆزی سەرەکی پێکهاتوون.

**یەکەم:** کەنعانی لە ناوچەی کەنعان دا ژیاون کە فەڵەستین و ئوردنی ئێستا دەکات..

**دووەم :** عەدنانییەکان لە ناوچەکانی یەمەن و سەبەئدا ژیاون..

**سێیەم:** قەحطانییەکان لەناوچەکانی جزیرەی عەرەبی واتا لە نەجدی ئیستادا ژیانیان بردۆتە سەر..

کە دەوترێت یەهود بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە سەر (ئەسباط) کوڕانی یعقوب سەلامی خوایان لێبێت.. بنەڕەتی ئەم خەڵکە کە لەنەوەی ئیبراهیمن، باوکیان ئیبراهیم لە ناوچەیەك ژیاوە لە نزیك ئوردن و عێراق ناوچەکە ناوی عیبرانە.. ئەم گەل و هۆزە ناوی عیبرانیان هەڵگرتووە..

خوای گەورە لە قورئاندا باسمان بۆ دەکات کە ئەمانە کۆچەر و هاوشێوەی قەرج بوون، لە سورەتی یوسفدا ئایەتی ١٠٠ خوای گەورە بە بەدەوی باسیان دەکات:...مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ من بَعْد أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾يوسف

واتا: بیابانشین، چونکە هەمیشە خەریکی کۆچ بوون لە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات.. کاتێك یەعقوب چۆتە ناوچەی کەنعان واتا فەڵەستینی ئێستا، تەنها ٣٥ بۆ ٤٠ ساڵ لەوێدا ماوەنەتەوە، تەنانەت سەیدنا ئیبراهیم لەو ناوچەیە بۆ بانگەواز دەڵێن ٧٠ بۆ ١٠٠ ساڵ لەو ناوچانەدا ماوەتەوە..

پاشان خەریکی گەڕان بووە بە ناوچەکاندا بۆ بانگەوازکردن بۆ دینداری و دینی حەنیف.

بەم پێیە ئەوان خاوەنی ئەو جێگایە نین.. کە ناوی ئۆرشلیم و ناوی هەندیك ناوچەی تر دروستکراوە، هەمووی کلاوات‌ی یەهودە بۆ چەواشەکارییە، لەم ساڵانەی دوایدا خۆیان گەڕان بە شوێن وڵاتیکدا کە تێدا نیشتەجێ بن سەرەتا ویستیان لە مۆزەمبیق دەوڵەت دروست بکەن، پاشای پرتوغال قوبوڵی نەکرد ئەو دەمە ئەو داگیری کردبوو، ئینجا ئۆغەندە قوبوڵنەکراو دوای ئەوە ڕوویان کردە سیبیریا قەیسەری ڕووس دەریکردن.. ئینجا ڕوویان کردە قوبرس زانیان بچووکە وازیان لێهینا.. دوایی ڕووە و ئەرجەنتین ویستیان بڕۆن دوور بوو نەیگشتنێ، تا لە کۆتایدا لە کۆنگرەی بال بەسەرکردایەتی تیۆدور هرتزل بریاریاندا کۆچ بکەن بۆ فەڵەستین بەهاوکاری ئەمریکا و بەرتانیا.

کەواتە جوولەکە یاخود یەهودییەکان خاوەنی خاك نین، لەبەر ئەوە نەتەوە نیە تا خاکی هەبێت، بەڵکو دینە.. دینیش خاك ناناسێت، بەڵکو مرۆڤ دەناسێت،

بەڵگەیەکی تر بۆ سەلماندی ئەم قسەیە، جوولەکەیەك نابینی خەڵکی ئەو جێگایە بێت کە ناوی فەڵەستینە بەڵکو هەموو لە ڕووسیا و ئەوروپا و ئەمریکا و ئەفریقا و جێگاکانی تر ڕوویان کردۆتە ئەوە جێگایە..

بۆ نمونە:

ئیسحاق شارۆن.. خەڵکی ڕووسایە.

بنیامین ناتانیهۆ خەڵکی پۆڵەندایە.

**هیچ سەرکردەیەکی ئیسرائیلی نابینی خەڵکی فەڵەستین بێت:**

خەڵکێك دەپرسێت و دەڵێت باشە هەموو ڕۆژئاوا بۆ پشتگیری ئیسرائیل دەکات؟ هۆکار چییە؟

لای خوێنەر ئاشکرایە کە ئەوروپا لە ژێر دەستی دوو مەزهەبی گەورەی مەسیحی دابەش بوو بوون.. یەکەمیان (کاتۆلیك) بوون کە بە ناوچەکانی فرەنسا و ئینگلیز و ئەڵمانیا و هۆڵەندا..هتد بڵاو بووبوونەوە، سەنتەری ئەم مەزهەبە لە ڕۆمای پایتەختی ئیتالیا بوو، مەزهەبی دووەم..(ئۆرتۆدۆکس) بوو کە سەنتەری سەرەکی ئەم مەزهەبە لە ئەستەنبوڵ بوو، کە ناسرابوو بە قوسطەنطەنیە و ناوچەکانی ئەنادۆڵ و شەرقی ئەورپا و..هتد.

لە ناو ئەم دوو هێزەدا بە درێژایی مێژوو شەڕێکی خوێناوی لە نێوانیادا ڕوویداوە کە قیزەونترین شەڕ لە مێژوودا لە نێوانی ئەم دوو مەزهەبەدایە، کە بە ملیۆنەها خەڵکیان لە یەکتر کوشتووە..

لە ناو ئەم دوو دەسەڵاتەدا گەل و هۆزی یەهودی هەبوون کە چەوساوە بوون هەمیشە لێیاندەدرا و دەکوژران و دەربەدەر بوون، لە هەموو ئەوروپادا ئەم گەلە بە ئوممەتێکی (مەلعون) واتا نەفرەتلێکراو ناو دەبران! هەمیشە بۆ نۆکەری خزمەتکاری بەکاریان دەهێنان، لە ساڵی (١٢٩٠)زایینی پاشای ئینگلیز.. کە ناوی (ئێدوەردی یەکەم) بوو بڕیاری دا هەرچی جوولەکە هەیە لە وڵاتەکەیدا دەریبکات، چونکە ئەوانە کافرن بە پێغەمبەر عیسا(سەلامی خوای لێبێت)، بە بۆچوونی (ئێدوەردی یەکەم) ئەوان کافر بوون بە ئایینەکەیان بۆیە دەبێت هەموویان دەربکات..

هەوکات لەگەڵ ئەم بڕیارەی (ئێدوەردی یەکەم) بە پێنج ساڵ دواتر، واتا لە ساڵی (١٢٩٥)زایینی پاشای فەرەنسا بەناوی (فلیپی یەکەم)

ئەویش بڕیاریدا دەبێت هەموو جوولەکەکان ئەم خاڵانەیان بەسەردا بسەپێنێت..

**یەکەم:** کوشتن.

**دووەم:** یاخود، پەشیمان بوونەوە لە ئایینی یەهودی دەبێت ببنە مەسیحی.

**سێیەم:** یاخود دەرچوونیان لە وڵاتی فەرەنسا و دەبێت کۆچ بکەن بۆ جێگایەکی تر.

لای هەمووان ئاشکرایە جوولەکە ترسنۆکترین خەڵکن، ژیانیان زۆر خۆش دەوێت وەك خوای گەورە لە قورئاندا بۆمان باس دەکات، بڕیاری ئەوە نادەن هەرگیز کە شۆڕش و خەبات بکەن لە پێناوی دینەکەیاندا، چونکە دەزانن کە دەستکاری کراوە، پاشان زۆربەیان چوونە ناو ئایینی مەسیحی، لەو سەردەمەدا هیچ جێگایەك دەرگای بۆ یەهودییەکان واڵا نەکرد تەنها موسڵمانان نەبێت لە خاکی ئەندەلوس کە ئیسپانیا و پرتوگالی ئێستا دەکات، ئەو کاتە موسڵمانان سیستەمی خەلافەتیان دەبرد بەڕێوە هەموویان پێشوازیان لێکرا و لە ئەندەلوس نیشتەجێبوون، پاشان لە ساڵی(١٤٩٢)زایینی بە هۆکاری کێشەی ناوخۆی موسڵمانان و کۆتایی سوڵتانی بەناوی (محمەدی دوازدەهەم)یاخود بە (محمەدی کوری ئەحمەڕ) ناسرا بوو کرایە دەرەوە لە خاکی ئەندەلوس هەموو موسڵمانان و خەڵکی ئەندەلوس وەدەرنران لەو وڵاتە خەڵکی (ئەسپان) کە بە ڕەچەڵەك خەڵکی ئەڵمان و فەرەنسا و ئینگلتەرا بوون بەم سێ ڕەگەزە دەوترا ئەسپان، ئەوان لە جێگای ئەندەلوسیەکان نیشتەجێکران هەموو خەڵکی ئەندەلوس ڕاگوێزران بۆ وڵاتی مەغرب، لەگەڵ موسڵماناندا هەموو جوولەکەکانیش وەدەرنران هاوشانی موسڵمانان ڕاگوێزکران بۆ خاکی مەغریب، ئیتر ئەو

وڵاتە بووە جێگای مەسیحی قوطیەکان، زۆرێك لە جوولەکەکان ڕوویان کردە دەوڵەتی عوسمانی و ناو موسڵمانان بەگشتی چونکە دەپارێزران.

لەپاشاندا ئەو کاتەی کە ئەندەلوس لە دەستی موسڵمانان سەندرایەوە، موسڵمانان لەو جێگایە شکستیان خوارد خەلافەت لەوێ ئاوابوو بەڵام پێش وەخت لە قوصطەنطەنیە موسڵمانان ئەو ناوچانەیان فەتح کرد واتا (٤٠)ساڵ پێش ڕووخانی ئەندەلوس خەلافەت لە ئەستەمبوڵ دامەزرا، جولەکەکان وەك ئایین لە خەلافەتی عوسمانی ڕێزیان لێگیرا و پاشان وەك زانا و بازرگان لە ناو خاکی عوسمانییەکان حورمەتیان لێگیرا و لەو وڵاتەدا نیشتەجێکران لە شارێك بەناوی (سالۆنیك) کە زیاد لە (٣٠٠) ساڵ لەو شارەدا نیشتە جێ بوون.

کاتێکیش کە باس لە دەوڵەتی عوسمانی دەکەین واتا گەورەترین دەوڵەت بووە لەو سەردەمەدا، دەوڵەتی ژمارە یەك بووە لە هەموو جیهاندا کە ماوەی (٦٥٠)ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، سنووری ئەم وڵاتە لە جەزائیرەوە دەستی پێکردووە تا ناوەڕاستی ئێران.. لە باکوورەوە تاکو نەمسا و بەشێکی زۆری ئیتالیا و مەجەر و بولگاریا و ئەلبانیا و کۆسۆڤۆ...هتد لە باشوور تاکو عێراق و حیجاز و یەمەن سنووری هەبوو کە (٢٠)ملیۆن کیلۆمەتر ڕووبەری ئەو دەوڵەتە بوو، بەو شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵ ئایینێکدا کردووە کە لە هەموو لاکانەوە لێیاندەدرا و دەربەدەر دەکران.

پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئەورپا ئەو سەردەمە لە ساڵی (١٥٢٣) زایینی کەسێك بە ناوی (مارتیین لۆثەر) کە قەسیسێکی ئەڵمانی بوو مەزهەبێکی نوێی دامەزراند بە ناوی (پرۆتستانت) واتا (موعارەضە) یاخود نەیار دژی مەزهەبی (کاتۆلیك)، لە دژی ئەو هەموو ستەم و خراپەکارییانەی کە کاتۆلیکەکان دەیانکرد ئەم هەڵسا بە شۆڕشێك دژی پاپا لە ڕۆما.

بۆ ئەوەی بنەچەی ئەم مێژووە و ڕیفۆرمە بزانین سەرنجتان ڕادەکێشمەوە بۆ ئەو کاتەی کە پاشای فەرەنسا کە پێشتر ئاماژەم پێدا بەناوی (فلیپی یەکەم) چۆن جولەکەکانی وەدەرنا لە خاکی فەرەنسا و پێی وتن یان دەبنە مەسیحی یاخود کۆچ دەکەن یان دەکوژرێن!.

ئەوەی کە مابووەوە.. ببووە مەسیحی، بەڵام هەر بیروباوەڕەکەی خۆیان نەگۆڕیبوو، وردە وردە ئەم خەڵکانەی کە جولەکە بوون ئایینەکەی خۆیان گۆڕی بوو. بوونە پاپا و قسیس لە جێگا گرنگەکاندا لە ناو دەوڵەتی فرنسادا پۆستیان وەرگرت، پۆستی ئیداری و جێگا گرنگەکانیان بۆ خۆیان داگیر کرد تا توانیان پێگەی سیاسی جەماوەری بۆ خۆیان بەهێز بکەن، هەڵسان بە دروست کردنی ئەم مەزهەبە کە ڕیفۆرمی پێدەوترێت لە مەزهەبی کاتۆلیکی ئایینی مەسیحیدا، هەموو ئەم شۆڕشەی کە لە دژی مەسحیەکان کرابوو بە پلانی جولەکە لای هەمووان ئاشکرایە کە مەزهەبی ئۆرتۆدۆکسی لەسەر دەستی موسڵمانان کۆتای هات، ئەوەی کە مابووەوە کاتۆلیکی بوو لەبەر ئەو زوڵم و زۆرەی کە دەیکرد، جولەکە توانی ئەم پلانەی خۆی لە ڕێگای (مارتن لۆثەر)ەوە بگەینێتە ئەنجام، لە ڕاسیتدا مارتن لۆثەر کە ڕیفۆرمی کرد خۆی کەسێکی مەسیحی بوو بۆیە کرایە واجیهە بۆ ئەوەی کەس هەست نەکات کە پلانی جولەکەیە هەموو فکری جولەکەی پیادەکرد، لە سەرەتادا کتێبێکی نوسی بەناوی (مەسیح بە یەهودی لە دایك بووە) لاتان ئاشکرایە کە مەسیحی زۆر ڕقیان لە جولەکەیە بە هۆکاری ئەوەی کە پێیان وایە، جولەکە بکوژی پێغەمبەر عیسایە و خوێنی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) لای مەسیحی خوێنێکی هەروەها سادە و ئاسان نیە، بەڵکو زۆر گرانە، هەرچەندە عیسا (سەلامی خوای لێبێت)نەکوژراوە، بەڵکو بەرزکراوتەوە بۆ ئاسمان، بەڵام

مارتن لۆثەر هات هەرچی پیرۆزی بوو دای بە جولەکە! هەموو فکری جولەکەی پراکتیزە کرد، هەروەها وتی: کە ئینجیل دەست کاریکراوە بەکەڵکی ئەوە نایەت کاری پێبکرێت دەبێت تەورات بەکاربهێنرێت، ئەمەش هەموو لە بەرژەوەندی یەهود بوو، ڕاستە ئینجیل کە بە عەهدی جەدید ناسراوە دەستکاری کراوە، بەڵام عەهدی قەدیم کە تەوراتە زیاتر لە ئینجیل دەستکاری کراوە و شێوێنراوە، ئەگەر ئینجیل دوای (١٥٠) ساڵ هەڵکێشانی عیسا نووسراوەتەوە، بەڵام تەورات دوای (٧٠٠) ساڵ مردنی موسا نووسراوتەوە، بگرە تیلموت لایان پیرۆزترە تاکو تەورات، مارتن لۆثەر مەسیحییەکانی بە خزمەتکار و نۆکەری یەهودییەکان دانا لە ناو ئەو مەزهەبەی کە نووسییەوە ئەوەی کردە فەرمان لەسەر مەسیحییەکان کە دەبێت وڵاتێك بۆ جولەکە دەست نیشان بکرێت..! بۆ ئەوەی عیسا بگەڕێتەوە سەر زەوی! ئەو وڵاتە کوێیە ناویان نا فەڵەستین! ئەمە هەموو ڕیفۆرمی ئایینی بوو لە ئەورپادا کە شۆڕشێکی گەورە کرا لە فەرەنسادا، لە دوای ئەوەی پاشای ئینگلیز بە ناوی (جۆرجی هەشتەم) خۆی بوو بە پرۆتستانتی و دەرگەی واڵا کرد بۆ ئەو مەسیحییانەی کە دژی کاتۆلیکی دەجەنگان، لەگەڵیاندا ڕێگا کرایەوە بۆ جولەکە کە بگەڕێنەوە بۆ ئینگلیز، کە پێشتر لەسەردەمی (ئێدواردی یەکەم) لە ئینگلیز دەرکرابوون، کەواتە ڕیفۆرمی ئایینی بۆ جولەکە بوو لە ئەورپادا نەخشەی ئەوان بوو کە جێبەجێکرا، ئەمەی کە باسم کرد ئەم مێژووە بە خێرایی بۆ ئەوەیە بیسەلمێنم دروستکردنی دەوڵەت بۆ ئیسرائیل لە لایەن ڕۆژئاواوە بیروباوەڕیانەیە، چونکە ئەوان بڕوایان وایە تا ئەوان دەوڵەت دانەمەزرێنن، عیسای کوڕی مەریم نایەتە خوارەوە، بۆیە هەموو دەسەڵات و سیاسەت و خەڵکەکەیان لەگەڵ یەهودییەکانن.

کەواتە کە پرۆستاندەکان ئارەزوومەندن بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلی لە خۆشەویستییان نییە بۆ جولەکە، بەڵکو باوەڕیان وایە کە عیسای کوڕی مەریم دێتەوە خوارەوە، لای هەمووان ئاشکرایە کە زۆرینەی ئەمریکا و بەریتانیا پرۆستاندن بۆیە پشتگیری لە جولەکە دەکەن.

ئەوەم خستە ڕوو کە لە ئەوروپا مەزهەبێکی نوێی مەسیحی دروست بوو بۆ پشتگیریکردنی یەهودییەکان کە ناسراون بە پرۆتستاند...

لەهەمان کاتدا ویستیان لە جیهانی ئیسلامی هەمان ئەزموونی مارتن لوثەر دووبارە بکەنەوە لە خەلافەتی ئیسلامیدا لە تورکیای ئێستادا، لەساڵی (١٦٠٣)ز ایینی کەسێکی جولەکە بەناوی (سەبەطای تەزفی) دەرکەوت کەتەمەنی (٢٢)ساڵ بوو بانگەشەی ئەوەی کرد لە پایتەختی موسڵمانان لە ئەستەنبوڵ(ئەستانە) کە گوایە عیسای کوری مەریمە،! خەڵکی دەبێت گوێی بۆ بگرن، ئەو دەمە حکومەتی عوسمانی ئازادیی پێبەخشی بەو هۆکارەی کە لە سەر بیروباوەڕی خۆی دەدوێت!، لەسەر بیروباوەڕی خۆشی ئازادە، لەدوایدا ئەم کەسە زۆربەی جێگاکان گەڕا و سەفەری کرد بۆ ئەوروپا و پاشان وڵاتانی موسڵمان وەك فەڵەستین و عێراق و تونس..هتد

لە بانگەشەیەکیدا لە خاکی فەڵەستین ئەم باسەی کردوە کە هەموو جیهانی دابەش کرد بەسەر (٣٨) جێگادا بۆ هەر جێگایەك پاشایەکی دانا و خۆشی کرد بە پاشا بەسەر هەموویانەوە.!

لەدوایدا کە گەرایەوە بۆ ئەستەنبوڵ لەوێ هانی خەڵکی دا کە خۆپیشاندان بکەن و دەوڵەتی عوسمانی بکەن بە چەند بەشێکەوە، ئەم کارە چەند جار دووبارە بوویەوە، بەڵام بە هۆکاری ئەوەی کە هیچ کاریگەری

لەسەر موسڵمانان دروست نەکرد زۆر گرنگی پێنەدرا، بەڵام پاشان لە لایەن ڕیفۆرمخوازەکانی ئەوروپاوە یارمەتیان دەدرا و خەڵکییان پێچەواشە کرد، بۆیە ناچار دەوڵەتی عوسمانی هەموو ئەو کەسانەی گرت و بەسەرۆکەکەیانەوە کە (سەبەطای تەزفی) بوو، لەدوای لێکۆڵینەوە بڕیاری لە سێدارەدانیان دەرچوو لەلایەن دەوڵەتی موسڵمانانەوە بە هۆکاری خیانەتی گەورە دژ بە دەوڵەتی ئیسلامی، پاشان لەو کاتەی کە بڕیارەکە جێبەجێ دەکرا (سەباطی تەزفی) خۆی و هاوڕێکان بڕیاریان دا ببنە موسڵمان و ئیسلام بوونی خۆیان لە سەر پەتی سێدارە بە کۆمەڵ ڕاگەیاند!، لەو کاتەدا قاضی موسڵمانان بڕیارەکەی بۆ گۆڕین هەموویان ئازاد کران.

ئەوە مەنهەجی دینی ئیسلامە کە بەو شێوە ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی مونافقیش دەکات، مادام بە ئاشکرا موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، ئیتر گوێ بە باکگراوەندی نادرێت کەچی بووە، پاشان ئەم کۆمەڵە خەڵکە لە مێژوودا بە(یەهودی دۆنمە) ناسراون، واتا ئەو یەهودیانەی کە لە ئاینی جولەکە هەڵگەرانەوە، ئەمانە بەردەوام لە ناو خەلافەتی ئیسلامیدا خەریکی پلان و دروستکردنی ڕێکخراو مەحفەلی جولەکە بوون کە لەداهاتوودا بە مەحفەلی سەهیۆنی ناسراون، بە دەیان پیاوی عەلمانی وەك جەودەت نامیق و مستەفا کەمال ئەتاتورك، حیکمەت بابان، عەبدولرحمان بەدرخان، عەبدوڵڵا جەودەت، حوسێن جاهید، سەرپەرشتیاری گشتی ئەمانە کەسێکی ماسۆنی بوو بە ناوی(داود کوهین) کە توانیان دەست بەسەر مەجلیسی مەبعوثان بگرن..

زۆرێکی تر لەو ناوانە کە دەرفەت نییە بۆ باس کردنیان، ئەم عەلمانیانە کە دروست بوون ویستیان ڕیفۆرم بکەن تەنانەت زۆرێك لە مزگەوتەکانی ئەستەنبوڵیان کردە قاوەخانە و جێگای سەربازی و تەنانەت هەندێکیان کرانە

تەویلەی وڵاغ، بەڵام ئەوەی کە ئەم شاڵاوە ڕیفۆرمەی جولەکەی سەهیۆنی ماسۆنیەتی ڕاگرت (کۆمەڵەی یەکگرتووی موحەممەدی) بوو کە دوای ناسرا بە حیزبیکی ئیسلامی بەناوی (حیزبی برایانی موحەممەدی) بە سەرکردایەتی (حافظ درویش وەحدەتی) بوو کە زمانحاڵی ئەو حیزبە ڕۆژنامەیەك بوو بەناوی (بورکان)لە دوای ململانیەکی زۆر هەموو ئەم سەرکردانە دەخرانە زیندان یاخود شۆڕشەکانیان کپ دەکرایەوە، ئیتیحادییەکانی تورانی بە تەواوەتی دەسەڵاتیان پەیدا کرد ڕێکخراوێکیان دروستکرد بەناوی(لاوانی تورکیا) دوای هەر ئەم کۆمەڵە چوونە ناو ئیتحادی تەرەقی و کۆنترۆڵیان کرد، هەمووی پیاوی جولەکە بوون لە ڕۆکەشیشدا موسڵمان، وەك پێشتر ئاماژەم پێدا ناسرابوون بە یەهودی دۆنمە واتا یەهودیە هەڵگەڕاوە موسڵمانەکان..!، دوای بە ئاشکرا بانگەشەی عیلمانیەتیان دەکرد بە دەیان کەڵەپیاوی وەك شێخ سەعیدی حەفید و کوڕە بەرێزەکەی کە باوکی شێخ مەحمود بوو لە شاری موسڵ تیرۆر دەکران بەدەستی ئیتیحادییەکان.

لەو سەردەمەدا ئەم ڕێکخراوانە دەستیان کرد بەبانگەشەی نەتەوەیی، یەکێك دەیگوت تورك و ئەوی تر فارس و ئەویتر عەرەب و تەنانەت لە ناو تورەکەکاندا بەشی تر جیابوویەوە بە تۆرانی و ئەرمەنی و ئەنادۆڵی، لەناو عەرەبیش بەناوی میسری و بەناوی سوریا و وەهەروەها.. هەموو ئەمانە بوونە هۆکاری لاواز بوونی خیلافەتی ئیسلامی تا کەسایەتییەك لە شانۆی سیاسی دەرکەوت بە پاڵپشتی کورد توانی بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ هەموو ئەم پیلانانە هەڵوەشێنێتەوە نەهێڵێت فەڵەستین بچێتە ژێر ڕکێفی هیچ کەس و هەموو پلانەکانی خستە چاڵ..

لەناو موسڵمانان جولەکە توانیان خەڵکانێك بچێنن بۆ ئەوەی زیاتر پڕۆژەی ئەو دەوڵەتە دابمەزرێنن، ئەم جارە عەلمانییەکان بوونە هاوکاری جولەکە..!

لەدوای شۆرشی فرەنسا کە گەورەترین گۆڕانکاری بوو لە ناوچەکەدا دژی ئیمپڕاتۆرە و کڵێسا و بەگزادەکان بەسەرکردایەتی زۆرێك لە سەرمایەدارەکان کە ناسرابوون بە خەڵکە بۆرجوازییەکان و موفەکیری ئەو شۆرشە (ژان جاك ڕۆسۆ و ڤۆڵتێر) بوون، لەدوای سەرکەوتنی شۆرشەکە و دامەزراندنی حکومەتی کۆماری، کەسێك لە شانۆی سیاسی دەرکەوت بە ناوی (ناپلیۆن پۆناپار)..

ئەم کەسایەتییە زۆربەی زۆری ئەوروپای خستە ژێر ڕکێفی و فەرمانداری خۆیەوە، پاشان هاتە ناوچەکانی میسر و جەزائیر، ئەم پیاوە بڕوای بە هیچ ئایینێك نەبوو لەبەر چاوی مەسیحییەکاندا دەیگوت مەسیحیم و کە هاتە وڵاتی میسر موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، لەدوای ئەوەی کە لەو ناوچانەدا مایەوە کوشتارێکی زۆری کرد، خوێنرێژی زۆری ئەنجامدا، یەك ڕووداوتان بۆ دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەم کەسە چەندە دڕندەیە، لە یەك شەو ڕۆژدا ١٠ هەزار خەڵکی میسر و مەمالیك و عوسمانلی لەناوچەکانی میسر دا کوشت بە دیلکراوی، لەدوای گەڕانەوەی بۆ ناوچەکانی فرەنسا لەناو بەلەمە چارۆکەدارە گەورەکەنیدا لە شەوێکدا ١٠٠٠ کەسی موسڵمانی کوشت کە بۆ خزمەتکردن بەکاری دەهێنان..

لەو دەمدا ناپلیۆن بە ئاشکرا وتی خاکی فەڵەستین خاکی جولەکەیە، بۆ ئەم قسەیەی کرد؟

بۆ ئەوەی سەرنجی هەرچی پرۆتستاندەکانە ڕابکێشێت و ببنە هاوپەیمانی، لە کاتێکدا ئەو بڕوای بە هیچ ئایینێك نەبوو، دواتر خەلافەتی عوسمانی کە بەمەی زانی هانای برد بۆ ئینگلیز، ئینگلیزیش بەناوی پاراستنیان لەدەستی داگیرکەری فرەنسای هاتووە هاوکاری ئەو ناوچانە بکات، ئەویش دەستی کرد بە کوشتن و بڕین و داگیرکردنی ناوچەکان، فەڵەستینی خستە ژێر ڕکێفی

خۆیەوە، بانگەشەی بۆ هەرچی خەڵکی یەهودییە لەو جێگایەدا کۆببێتەوە، لەماوەی چەند مانگێکدا پێنج هەزار یەهودی لەهەموو جیهانەوە هاتنە ئەو ناوچەیە.. لەدواییدا کە خیلافەت بەمەی زانی هێرشێکی بەرفراوانی دەست پێکرد، ئینگلیز زانی لەوکاتەدا هەستی خەڵکی بە دینداری بۆ ئەو جێگایە دەجوڵێت، بە مەرج دایانەوە بە خیلافەتی عوسمانلی، ئینجا دوو کونسوڵ مەرجیان لەسەر عوسمانییەکان دانا، بۆ یەکەم جار ئەمریکا لەوێوە دێتە ناو شانۆی سیاسی و داوا دەکات ئەو پێنج هەزار کەسە بپارێزن و بەهەمانشێوە بەریتانیاش، لەدوای ماوەیەکی زۆر لەهاتنی سوڵتان عەبدولحەمید ڕەحمتی خوای لێبێت، فەڵەستینی دابراند لە هەموو ناوچە عەرەبییەکە و دەیزانی گەورەتین موئامەرە (پیلان)ی لەسەرە و کردیە ئیمارەتێکی سەربەخۆ، خۆی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی دەکرد، بینی وا دەستە دەستە جوولەکە لە هەموو دنیاوە ڕوودەکەنە ئەو جێگایە..

بۆیە ناچار هەموویانی وەستان و وتی: ئەوەی کە جوولەکەی فەڵەستینە و خاوەن خاکە و ناوی هەیە لەو جێگایەدا دەبێت ڕێزیان لێبگرێت و مافیان پارێزراوبێت، داوای سەرژمێریی کرد، ئەو دەمە والی و لێپرسراوی ئەو جێگایە موستەفا کەمال ئەتاتورك بوو..! داوای کرد کە سەرژمێری جوولەکەی بۆ بکات هەموو سەرژمێرەیەکە لە ناو فەڵەستیندا نەدەگەیشتە ١٥٠٠ کەس ئەوی تر خەڵکی جێگاکانی تر بوون بۆیە سوڵتان داوی کرد ئازادیان بکەن لەبەر ئەوەی پەیمان دراوەتە ئەمریکییەکان و بەریتانییەکان.. لەوە زیاتر کەس بۆی نیە بمێنتەوە بۆ نیشتە جێبوون، بەڵام بۆ سەردان خەڵك ئازادە.

ئەوەی کە لای من گرنگە ئەوەیە لێرەدا پێویستە باسی ئەو بیر و بۆچوونانە بکەین کە لەناو وڵاتی ئیسلامدا دەمەزرا ئەویش بزووتنەوەی

بەناو ڕۆشنگەرایی بوو یاخود ئەقڵانی بوو لەڕێگای هەندێك بەچکە جوولەکە و بێدینەکان و بە لەناوبردنی خیلافەتی عوسمانی. لەو سەردەمدا کۆمەڵێك سەریان دەرهێنا وەکو محەممەد عەلی پاشان کە خەلافەتی ئیسلامی وەك سەرکردەیەکی جەنگی ناردیە ناوچەکانی میسر، خۆی یەکێك بوو لە یەهودییە دۆنمەکان بوو ڕەچەڵەکیشی ئەلبانی بوو دەستی گرت بەسەر میسردا دژایەتی خیلافەتی دەکرد دەستی لەگەڵ فەرنسا و ئینگلیز تێکەڵ بوو کرد، چەند جار سوپای ئامادەکرد بۆ لێدانی خیلافەت و زۆر جار زۆری نەمابوو کە ناوچەکانی ئەستانە واتا پایتەختی خیلافەت ئەستەنبوڵ بگریت، ئەگەر پیاوێکی کورد نەبوایە کە بە میری میران ناسراوە لەگەڵ سەدری ئەعزەمی عوسمانلی دەمێك بوو خیلافەت کۆتایی هاتبوو ئەویش میر بەدرخانی گەورەمانە ڕەحمەتی خوای لێبێت، توانیان ئەو هێزەی محمد عەلی پاشا ڕابگرن تا وای لێهات ئەمارەتی فەڵەستین لە ڕێگای مەستەفا کەمال ئەتاتورك و محمد عەلی پاشا و هەموو مەحفەلە ماسۆنیەکان وردە وردە کارئاسانیان کرد بۆ ئەوەی ئینگلیز بیت داگیری بکات، چونکە یەهود خاوەنی هیچ نەبوون، تا بیدەنە دەست ئەوان، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٦ تا ١٩٤٤ بە تەواوتی دەوەڵەتیان بۆ جوولەکە دامەزراند و خەڵکیان بۆ پێگەیاندن و بەناوی ململانێی نێوان جولەکە و بەریتانیا، دواتر دەوڵەتی بەریتانیا لەناوچەکان کشایەوە دایە دەست یەهودی و لەساڵی ١٩٤٦ کیانی (یەهود)یان لەسەر خاکی فەڵەستین دامەزراند، گەورەترین خیانەت ئەوە بوو لەساڵی ١٨٩٩دا سەرژمێری کرا هەموو فەڵەستین ١٥٠٠ کەس جوولەکەی هەبوو، ٥٠٠ هەزار جوولەکەش نیشتە جێبوون لەماوەی ١٢ ساڵدا زیاد لە ٥٢ هەزار جولەکە چووە خاکی فەڵەستین لە هەموو جیهانەوە. لەو کاتەشەوە شۆرش بەردەوامە

یەك فەڵەستینی خاکی خۆی نەفرۆشتووە هەمووی داگیرکراوە، ئەو قسەیەشی دەڵێن عەرەبەکان خاکی خۆیان فرۆشتووە بە جوولەکەکان، ئەمەش دیعایەی بەچکە یەهودییەکانە، هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، بەڵکو ئەوان داگیرکەری ئیستیتانی ئیستبدادی بوون واتا جێگایەکیان داگیر دەکرد خەڵکەکەیان ڕاوەدوو دەکرد جوولەکەیان دەخستە جێگای بە ئاگرو ئاسن حوکمیان دەکرد.

## سەری ساڵی زاینی بناسە

یەکێك لە پیشەی خەڵکی دۆڕاو ئەوەیە کە لاسایی دوژمنەکەی بکاتەوە، لەوانەیە بەلاتانەوە سەیر بێت دەڵێم دوژمن، سەری ساڵی زایینی لە ساڵەکانی (٥٠٠) ی زایینیدا هاتۆتە ئاراوە، هیچ پەیوەندی بە لەدایك بوونی پێغەمبەر عیساوە نییە (علیه السلام)، ئەو کەسەی کە دایناوە یەکێك بووە لە "ئەکلیریۆسەکانی" مەسیحی بەناوی "گەریگۆری" ئەم تەقویمەی دانا بۆ بەڕێکردنی سوپای خاچ دروشمان و ئامادەکردنیان بۆ جەنگێکی نەگریس کە بە موسڵمانیان فرۆشت، خۆی فریا نەکەوت، چۆن خەڵکانێك لەسەری ساڵدا کە جەژنی ئەوان بوو پاپا ئۆربان سوپاکەی بە تەواوەتی ڕێکخست لەیادی ئەو سوپایەدا ئاهەنگ دەگێڕێت.

ئەوەی کە زۆر زەرەرمەند بوو لە جەنگی خاچدرووشمان و سەری ساڵدا کورد بووە، زۆربەی ناوچە کوردییەکان لە ناوچەی ئەنەدۆڵی ئێستادا کە کوردی تێدا دەژیا و زۆربەی ئەمارەتەکان کورد بوون، هەموو بەدەستی خاچدرووشمان لەناوچوون، باووباپیرانی کورد لەو ناوچانەدا هەموو هەڵکەنراو زۆربەیان بە دەستی باطنییەکان و خاچدرووشمەکان لە ناو دەبران و دەکوژران، لەوانە سەرکردەی کورد وەك "مدودی کوڕی تونتکین و عودەی کوڕی موسافیر.. زۆرێکی تر لە سەرکردە شۆرەسوارەکانی ئەم ئیسلامە.

لە هەمووی ناهەموارتر ئەوەیە کە وشەی زایینی لە زمانی کوردیدا بەکار هاتووە لە جیاتی میلادی، واتا مەبەستی پێ زاوە، کە حاشا ئەوە وەك قسەیەك بۆ خوێنەری دەگوێزمەوە و ئەوە وتەی من نیە، بەڵکو ئەوە وتەی ئەو دەمەیە

کە کورد ئاشنا بوو بەم ئەدەبیاتە عەلمانیە، دەیانویست لەسەردەمی یانەکانی ئیتحاد و تەرەقی ئەتاتورك ”حیکمەت بابان و جەلادەت بەدرخان“ بوونە خاوەنی ئەم ئەدەبیاتە کە عەلمانی بوون، دواییش کۆڕی زانیاری کورد بە نەزانی دووبارەی کردەوە لە سەردەمی عەلائەدین سەجادیدا کە واتاکەی ئەوەیە ” مەریەمی کچی عیمران“ – سەلامی خوای لێبێت- بە عیسای کوڕی زاوە، پەنا دەگرم بەخوا لەم قسەیە کە ئەمە ئەدەبیاتی عەلمانی بوو سەپاندیان بەسەر ئەم ئەدەبیاتەدا کە موسڵمانان دووبارەی دەکەنەوە.

پاشان من سەرم سوڕ دەمێنێت لەخەڵکانێك کە موسڵمانیشن و خاوەنی هزر و بیرن چۆن لە سەری ساڵدا دەڕۆنە ناو ئەو ئاهەنگەوە !، بیر لەوە ناکەنەوە کەمردن لە ئان و ساتدایە و یەك هەناسەیە کە نەهاتە دەرەوە ئیتر تەواو کۆتایی ژیانتە، تەنها بە بینینت بە ”ملك الموت“ وەك کورد دەڵێ“ ئیزرائیل“ ئیتر مەلەف و دۆسیەکەت دادەخرێت لە میتۆدی ئەم ژیانەوە دەڕۆیت بۆ ژیانێکی تر، چۆن بیر ناکەیتەوە لە تەمەنی یەك ساڵی ڕابردوو کە چیت کردووە، بەچی بەسەرت بردووە، چۆن کارت تێدا کردووە، هەموو تەلەفزیۆن و دەزگاکانی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنەکان و هەموو فەرمانگەکان بە کاری ساڵی خۆیاندا دەچنەوە، بەڵام سەیرە مرۆڤ بە کار و فەرمانەکانیدا ناڕواتەوە کەچی تێدا ئەنجامداوە.. تۆ بڵێی بێ هەڵە بووبین؟

من ئەم ساڵ بەسەر تاوانەکەی خۆمدا دەگەڕێمەوە.. لە جیاتی ئاهەنگ گێڕان، بیر لەوە دەکەمەوە کە چەندە خزمەتی مرۆڤایەتی و پاشان موسڵمانانم تێدا کردووە بەگشتی، وەرن با وا بیر بکەینەوە، نەك هەڵپەڕین و خۆمان بێ ئاگا بکەین لە تەمەنی بەسەرچوومان، چەندان کەس لەگەڵ ئێمەدا دەژیان ئێستا تۆ ماویت و ئەوان لە ژێر زەوی و خۆڵدان، تۆ بەشی هەناسەت پێماوە، ئەو لەژێر خاکدایە، تۆ فریا بکەوە

چاکەی تێدا بکە، ئەوەشت لەبەرچاوبێت کە تۆش هەر شوێنی وەك ئەو کۆتا مەنزڵگای ژیانتە کە گۆڕستانە.

ئەوەی کە ئێستاش دونیا شوێنی کەوتووە ئایینی مەسیحی نییە بەڵکو ئایینی پۆڵسە.

## پۆڵـس کـێیە؟

مێژووی (پۆڵس) کێ یە و لە کوێ وە سەرچاوەی گرتوە دیارە کە (پۆڵس) ناوی (شائول)ە لە ڕەگەز و نەژادی ڕۆمانیە لە ڕەچەڵەکدا، لە قودس خوێندویەتی و لەسەر ئایینی یەهودی پەروەردە و گەورە بووە، لە ناو خەڵکیشدا بە کابرایەکی باوك دۆست و نیشتمان پەروەر ناسرابوو وە مەسیحیەکانیشی دەچەوساندەوە لەو سەردەمەدا.

پۆڵس خۆی یەکێك بوو لەوانەی شایەدی بەرد بارانکردنی (ئیستفانۆس) بوو و خۆشی بەشدار بوو لەو کاتەدا.

ئیستفانۆس لەلای مەسیحییەکان بە شەهیدی یەکەم و پیاوێکی گەورە دەناسرێت لە ساڵی (٣٠) ی میلادی، پۆڵس لەلایەن ڕۆماوە داوای لێکرابوو کە بچێت بۆ دیمەشق بۆ بەرەنگاریکردنی مەسیحیەت، بەڵام دواتر وای بڵاو کردەوە کاتێك کە چووە بۆ دیمەشق مەسیح هاتۆتە لای و گوایە پێی وتوە بۆ دەمچەوسێنیتەوە ئەویش لە بینینی ئەو نوورەی مەسیح سێ ڕۆژ کوێر بووە و پاشان چۆتە ناو دیمەشق و لەوێ چاوی کراوەتەوە ئیتر لەو سەردەمەوە چاو و دڵی کەوتۆتە کار و دەستبەکار بووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیح.

لە ڕاستیدا مێژوونووسان دەڵێن: کە ئەمە فێڵ بووە بۆ ئەوەی دەستور و ئەحکامەکان بگۆڕێت و بە بیر و بۆچوون و داهێنانێکی نوێ بینووسێتەوە کە ئەویش بریتییە لە بیری سێدانە (الثالوث).

فەیلەسوکان و بیرمەندەکان و مێژوونووسەکان لەبارەی ئایینی مەسحییەوە چۆن دەدوێن یان پیاوانی ئایینی خۆیان چۆن باس لە ئایینەکەیان دەکەن، بۆنمونە (نیچە) لە مەڕ ئەو جیاوازیانەی کە لە نێوان ئایینی مەسیحی و هەڵبەستراوەکەی (پۆڵس) دا هەیە دەڵێت:- بانگەوازی مەسیح لەڕاستی و جەوهەر و ناوەرۆك دا بانگەوازێکە بۆ سیستەم و هێز و دەسەڵات، بەڵام (پۆڵس) گۆڕی بۆ ئایینێك کە بۆتە لانەی ترسنۆك و تۆقیوەکان، بەردەوام دەڵێت :- پۆڵس بە وە ناوزەد دەکات ناوی لێناوە (باسکاڵی یەهودییەت)، چونکە بڕوای پۆڵس لەسەر بنەمای فرتو فێڵ و ئەفسانەی ئایینە کۆنەکان دامەزراندوە.

کۆڵن ولسن: - ئەو لەسەر مەسییحیەت دەڵێت: مەسیح وتوێتی خۆت سەروەر و گەورەی خۆت بە، بەڵام بە جارێك پۆڵس ئەم بیرو باوەڕەی هەڵتەکاندوە و گۆڕیویەتی و لەسەر بنەمای ڕاستی خۆی نەماوە.. بۆیە نمونەی نامەکەی پۆڵس دینێتەوە کە بۆ ڕۆمای ناردووە، ئەم وتەیەی تێدا نووسیوە: [با هەموو کەسێك سەر بۆ دەسەڵاتداران دابنەوێنێت، چونکە دەسەڵات نایەت تاخوا نەینێرێت، وەهەر کەس لە ڕووی دەسەڵاتداراندا بووەستێت کەواتە ئەو کەسە لە ڕووی دەسەڵاتی خوا وەستاوە).

ماوەتەوە بڵێین: بیروباوەڕی ئێستای مەسیحیەت لە سەر بنەمای دەستوورەکانی مەسیح (سڵاوی خوای لێبێت) دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر ئەو ئایدیا و بۆچوونە خورافیەی کە پۆڵس دایهێناوە

لێرەدا جێگای خۆیەتی شتێکتان بیربخەمەوە کە ئازادی خوازان دەڵێن: مەبەستی ئیسلاح وڕیفۆرمی پڕۆتستانتی بە قازانجی بیری ئایینی مەسیحی بوو!

بەڵام بەداخەوە لەڕاستیدا وانەبوو بەڵکو بە قازانج و بەرژەوندی مەسیحییەتی پۆڵس بوو.

جێگەی خۆیەتی مێژوو نووسی بەناوبانگ "وێڵز" بە نمونە بێنینەوە کە لە کورتەی مێژووەکەی دا دەڵێت:- مەسیح و ئەم بیرو باوەڕەی ئێستا ئاسمان و ڕێسمان لەیەکەوە دوورن، بەڵام مەسیحیەتی ئەمڕۆ بریتییە لەوەی کە پۆڵس دایهناوە

ئەویش کەلە ئەسکەندەریەی لاهوتی دەرسی خوێندووە بۆیە کاریگەری دەستووری بتپەرستی میسریەکانی لەسەر بووە کە ئایینەکەی ئەوانی تێدا هاتووە کە مرۆڤ دەبێت بتوێتەوە لە نێوان [باوك و کوڕ و گیانی پیرۆز] دا لە ئایینی میسریەکاندا [ئیزیس و هۆرس وسیزاییس] لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگەر سەرنجتان دابێت زۆربەی مەسیحیەکان لە شێوەی خاچێکدا ئەم دەقە لەسەر سنگ و نێو چاویان دەیخوێنن بە ناوی[ باوك و دایك و گیانی پیرۆز].

خاڵی کۆتایی بریتیە لە دەسەڵاتی کڵێسا کە بەردەوام درێژەی داوە بە ناشرینکردنی شێوەی مەسیحیەت تا ئەو ڕادەیەی وای لە خەڵکی ئەم ئایینە گەیاندبوو دەتوانن لە گوناهەکانیان خۆش بێت لەسەر ئەم زەوییەدا هەر لە زەویشەوە بەهەشتیان پێ بفرۆشێت، ئەگەر چی خراپەکار و تاوانبار و سەرپێچیان ئەنجام دابێت.

ئەویش بە كڕینی پسووڵەی بەرائەت یان نامەی لێبووردن پاك دەبوونەوە، دیارە پاپاكان بەڵێنی لێبوردن و لێخۆشبون و سڕینەوەی گوناهەكانیان تیا دەدا، دیارە هۆكارەكەشی وەرگرتنی چەند بەستەیەك پارە بوو، چونكە ئەوان خۆیان بە نوێنەری خوا دەزانن، ئەوان پیاوانی ئایینی بوون.

ئەمە نەك هەر دوورە لە ڕاستییەوە بەڵكو گاڵتە بازاڕییەكە بە ئاكارە بەرزەكانی مەسیحیەت.

هەر قەشە و پاپاكان بوون.. حەڕامیان حەڵاڵ دەكرد وە یان بە پێچەوانەوە بە ئارەزووی خۆیان وشەی چاكیان دەبەخشی بە بەگزادە و سەروەت مەندەكان، ئەم دەقانەش كە باسمان كرد لە ڕێگەی یەسوعەوە دەسەڵات دراوە بە پیاوانی ئایینی مەسیحیەت، بۆ نمونە لە نامەیەكی سەدەی هەژدەهدا كە لە دائیرەتومەعاریفی ئەوروپی دا نووسراوە كە بۆ بەگزادەیەك لە بەگزادەكانی ئیتالیا نووسراوە و دەڵێت [ ئەی فڵانی كوڕی فڵان یەسوعی پەروەردگارمان بەزەیی بە تۆ بەخشی، ئەویش خۆی بە شایستە گەیشت بە ئێش و ئازارەكانی خۆی دا لە خاچ لەبەر تۆ، منیش ئەو دەسەڵات و نوێنەرایەتیەم پێ دراوە لە تەواوی گوناهەكانت خۆش بم، ئەو دەسەڵاتەش كڵێسا فەرزی كردووە، من خۆم دەتبوورم لە تەواوی گوناهەكانت و زیادە ڕەوییەكانت ئەگەر چی تاوانەكانیشت گەورە بن و بەقەد دەریایەك بن ئەوە تۆمان پاك كردەوە لەلایەن پاپای باوكی پیرۆز و كورسی نوێنەرایەتیمان پێ بەخشیت، ئەمەش مشتێك بوو لە خەروارێك لە سەر ئەو بنەمایانەی كە لە ئایینی یەهودی و مەسیحیەتی ئێستاداهاتوون.

## ئەمریکـــا بناسـە

بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر بابەتێکی وا گرنگ، پێویستم بە زانیاری مێژوویی و ئامار هەبوو، بۆیە زیاتر پەنام برد بۆ مامۆستایانی زانکۆ بە تایبەت ئامارەکانی زانکۆی قاهیرە و ڕۆژنامە ئەمریکییەکان، بۆ ئەوەی زیاتر بە بەڵگەوە ڕاستییەکان بخەمە ڕوو، هەندێك سەرچاوەی ئەوروپیم بەکار هێناوە کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئێرە وەرم گرتوە، هیوادارم بتوانم خزمەتێك بە خوێنەری کورد بکەم تا بتوانم لە ڕووی مێژوو و پێکهاتەی کۆمەڵگای ئەمریکاوە لە ڕووی بیرکردنەوەی تاکەکانییەوە شتێك پێشکەشی ئێوەی زێدە سەنگینم بکەم

دەستپێك:

سەرەتا لەوە دەست پێ دەکەم کە ئەو ئاقاری وڵاتی ئێمەی پێدا دەڕوات و زەمینەی سیاسی کوردستان و عێراق چۆن هەڵبسەنگێنین؟
لە سەرەتای داگیر کردنی کوێت کە هەموو وڵاتانی دراوسێ دژایەتی ڕژێمی پێشووی عێراقیان کرد سەر ئەنجام نەتەوە یەکگرتوەکان بە ڕابەرایەتی ئەمریکا هاتنە ناوچەکە، لای هەمووان ئاشکرایە لەبەرخاتری نەوتی ناوچەکە و چەسپاندنی پێگەی ئەمریکا لە ناوچەکەدا بوو، لەسەر داوای میرەکانی کوێت و مەلیکی سعودیە پەروەردەکراوەکانی دەستی ڕۆژئاوا وەك حوسنی موبارەك داواکرا بێنە ناوچەکە تا دەوڵەتێکی بەناو ئیسرائیل بە هێزبکەن و ئەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە نوێیە کە ئێستا هەوڵی بۆ دەدەن لە گەڵ بیری سیستەمی جیهانیەکە(جیهانگیری) لە ناوچەکەدا دابمەزرێنن، لەو سەردەمەوە کاری بۆ دەکەن تا ناوچەکە مۆنۆپۆڵ

بکەن لە ڕووی نەوت، بەڵام داگیرکردنی ناوچەکە وەك جاران نا، بەو شێوە کلاسیکییە کۆنە نازناوی داگیرکەر لە خۆیان بنێن، بەڵکو ویستیان ئاستی خەڵکی ناوچەکە بەرزبکەنەوە، تا کاڵاکانی خۆیان بەسەر خەڵکی ناوچەکدا ساغ بکەنەوە، چونکە لە سەردەمی دەستپێکردنی جیهانگیرییەوە ڕۆژئاوا بە تایبەت ئەمریکا نەخشەرێژی بۆ ئەو کارە دەکات، لای هەموان ئاشکرایە کە ئێستا زۆر ئاستەمە وڵاتێك بتوانێت لە سەر خاکی خۆی سیاسەت بکات بە شێوەیەکی ئاسایی هەر دەبێت کاریگەری جیهانگیرییەکەی ئەمریکای لەسەر بێت، کە ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، زۆر دەگمەنە وڵاتێك بتوانێت لە سەر زەوی خۆی سنووری خۆی بپارێزێت بێ ئەوەی ئەمریکا دەست تێوەربدات لە کاروباری ناوخۆ، ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا ئەمریکا ئەوا لە ڕێگای هێڵە سیخوریەکانییەوە دەستتێوەردانی خۆی هەر دەبێت.

لە دوای ڕاپەڕینەکەی بەهاری (١٩٩١) لە کوردستان توانرا ڕاپەڕینێکی جەماوەری سەرتاسەر سەر هەڵبدا، بێ ئەوەی دەستی هیچ دەوڵەتێکی زلهێزی تێدا بێت توانرا جەماوەر بەهۆی ڕادیۆی گەلی کوردستان لە ناوچەی سلێمانی و زۆر ناوچەکانی تردا کاریگەری هەبێت تا جەماوەرەکە ڕێکبخات ئەمە ڕاستیەکە دەبێت بە ئینسافەوە بوترێت، بە هەر جۆرێك بوو ڕاپەڕینەکە سەرکەوتو بوو، بۆ سەرنج ڕاکێشانی ڕای گشتی کۆڕەوە کە ڕوویدا لە ڕاستیدا توانرا ڕای گشتی و هێنانەوەی بیری ڕۆژئاوا بە کیمیابارانی هەڵەبجە و پێنج هەزار قوربانی بێ سەروشوێن کردنی خەڵکی کورد و بە ناوی ئەنفال بە دەستی بەعس، ئەمانە هەموو هۆکار بوون بۆ سەرلەنوێ دروستبوونەوەی شۆڕشی کوردی بەو هەموو شەڕە ناوخۆیی و دزی و فزی و ئاودیو کردنی سەروەت و سامانی

وڵاتەکەمان، من هەر دڵ خۆش بووم، چونکە بە قۆناغێك لە قۆناغەکانم دەزانی بەو هەموو نێگەتیڤەی دەسەڵاتی کوردی هەیانبوو چاوەڕوانی کاری باشم هەر لێدەکردن تا (٢٠٠٣/٤/٩)، بەڵام لە دوای ئەو مێژووەوە ئەوەی ڕوودات بەلامەوە سەیرنیە وە جێگای سەرسوڕمان نابێت چاوەڕوانی زۆر لەوە خراپتر دەکەم لە بەر ئەوەی ئەمریکا هاتە ناو عێراق و کوردستان، داگیری کرد، ئیتر چاوەڕوانم کە کوردستان ئەو دەسەڵاتەی کە تا ڕادەیەك خۆی دەیبات بەڕێوە ئەوەش نەمێنێت، ئەوە مادەی (١٤٠) خۆم و خۆتان خۆش.

خوێنەری ئازیز چاوەڕوانم خەڵکی ئێمە بەرەو کێشەی ڕەوشتی بڕوات، تووشی هەموو جۆرە نەخۆشییەکی سێکسی ببێت. خەڵکی هەولێر ڕقی لە خەڵکی سلێمانی بێتەوە، بەهەمانشێوە شارەکان ڕقیان لە یەکە، نوکتە و تەنانەت زۆر شتی ناشرینتر بەیەکتری بڵێن و چاوەڕوانی ئەوەم لە کوردستان تەنانەت خوشك و برا بەیەکەوە لەسەر یەك جێگا بخەون، یان باوك لەگەڵ کچی خۆیدا بخەوێت کە ئەمانە تا ئێستا زۆر بە دەگمەنی ڕووی داوە، خۆ ئەگەر ڕویدا دڵنیاتان دەکەم کە زۆر سادە و ئاسانە بەلامەوە سەیر نابێت!

لێتان ناشارمەوە کاتێك هەواڵی ئازاردانی زیندانییەکانی ئەبوغرێبیان بەو شێوە ناشرینە دامێ... بڕوا بکەن زۆر سادە بوو بەلامەوە، هێنانی ئافرەتانی کورد لە ژێر ئاڵای کوردستان بڵاوکردنەوەی وێنەکانیان سەماکردنیان بۆ سەربازانی ئەمریکی کە لەلایەن بەرپرسانی کوردەوە ئەنجام درابوو، ئەویشم بەلاوە سادە بوو و چاوەڕوانی زۆر شتی تر دەکەم تا ئەمریکا دەسەڵاتی هەبێت لە ناوچەکەدا.!!

لەوانەیە خوێنەر بڵێت بۆ؟

ئەم ڕەشبینیە بۆ لە ماکوان دەبینرێت لە کاتێکدا خەڵکی هان ئەدات بۆ ئەوەی هەرگیز ڕەشبین نەبن؟ بۆ ئەوەندە ڕەش بینە بەو ئاکار و ئاقارەی کە لە وڵاتی عێراق و کوردستاندا هەیە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دەبێت بە لێکۆڵینەوەیەك دەست پێ بکەین لە سەر ئەمریکا !!

کەواتە دەبێت بزانین دروست بوون و شارستانیەتی ئەمریکا چۆن دروست بووە؟

**مێژووی ئەمریکا چییە؟**

لە دوای گەشتێکی دوورو درێژ {کریستۆڤەر کۆڵۆمبوس} لە ساڵی (١٤٢٩)زاینی کە ویستی بڕوات بەرەو هندستان لە ئیسپانیاوە، لە دوای ماوەیەکی زۆر کە بە ئاڕاستەیەکی هەڵەدا دەریای بڕی بوو، تا خۆی لە وڵاتی ئەمریکادا بینێتەوە، لە دوای گەڕانی بە ناو وڵاتەکەدا بۆی دەرکەوت کە ئەمە (کیشوەری) تازەیە زۆر پێشوازی لێ کرا لە لایەن هیندە سوورەکانەوە کە ئەم وتەیە لە ساڵی (١٦٠٧)زایینی لە لایەن مێژوونووسی بە ناوبانگی فرەنسی کە ناوی (جۆن سمث) کە بە فەرمانی پاشای فرەنسا ناردی بۆ ناوچەکە تا لێکۆڵینەوەی لە سەر بکات کە پاشای ئەوکاتەی فەرەنسا ناوی (جیمس)ی یەکەم بوو، لەگەڵ سێ بەلەمی گەورە ڕەوانەی کردن، بەڵام زیاتر مەبەستم کۆڵۆمبوسە کە گەڕایەوە بۆ ئیسپانیا، هەواڵی دا بە مەلیکی ئیسپانیا ئەو کاتە ئیسپانیا و فرەنسا سەرقاڵ بوون بەشەڕی قودسەوە، بۆیە زۆر باری ئابووری هەردوو وڵات

بەرەو ڕوخاوی دەڕۆشت، بڕیاریان دا کە بگەڕێنەوە بۆ ئەمریکا تا ئاڵتون بە دەست بێهنن، بەڵام لە خاکی ئەمریکادا لێیان دەبێت بە شەڕ لە گەڵ هیندەکاندا برایەکی کۆڵۆمبوس دەکوژرێت، بەهۆکاری کوشتنی براکەی کرستۆڤەر شەڕ گەرم دەبێت لە نێوانی تاقمی کۆڵۆمبوس و هیندەکان تا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە بۆ ئیسپانیا بە هەڵهاتووی..

پاشان بە ناوی ئەوەی خەڵکی ئەمریکا بکەن بە مەسیحی خاچ و وێنەی بە ناو عیسا کوڕی مەریەم هەڵدەگرن دەچنە ئەو وڵاتە خەڵکی ئەو قاڕەیە بە زۆر دەکەنە مەسیحی، کە دەگەنە ئەمریکا بۆ یەکەم جار لەگەڵ گەل و هۆزێکی هیندە سوورەکان دەکەونە گفتوگۆ کە ناویان (بویلبوس) ە، زانای بە ناوبانگی ئەڵمانی (کلودلیفی شتراوس) کە پرۆفیسۆرە لە بواری {ئەنتۆلۆژیا} واتا زانستە مرۆییەکان دەڵێت بەم شێوەیە کە وەك خۆی وەرم گێڕاوە لە ئینسایکلۆپیدیای نەرویج وەرم گرتوە دەڵێت:

کاتێك ڕۆیشتن خەڵکی سوور لە شەیتان دووربخەنەوە کەچی خۆیان بوون بەشەیتانی سپی پێست!.. واتا شەرێکی گەورە ڕویدا پاشان خەڵکەکە هەمووی لە ناو بران، ئەوەی ئافرەت بوو بە زۆر هێنران بۆ ئەورو پا و منداڵەکانیان لە بازاڕەکانی ئەوروپادا فرۆشت، لە هەموو لایەکەوە لە ئەوروپا بۆ لە ناوبردنی هیندە سوورەکان دەڕۆشتن بە تایبەت لە ئیسپانیا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و پۆڵەندا و ئینگلتەرا زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا تا شەڕ لەگەڵ خەڵکەکەیدا بکەن، پیاوەکانیان دەکوشتن و ژنەکانیان ئەگەر جوان بوونایە ئەوا وەك کۆیلە بۆ خۆشییەکانی خۆیان بەکاریان دەهێنا. پاشان منداڵەکانیان دەفرۆشت کە گەورە دەبوون کاریان پێ دەکردن تا مردن، وە لە ساڵی (١٦٤٩) زاینی بە فەرمی کەنیسە بڕیاری دا لە دژی هیندە سوورەکان کە ناونرا بە(هارتیقە) دەبێت بکوژرێن و لە ناوبچن

ناونران بە (شەیتانی سوور) هارتیقە واتا ئەو کەسانەن کە دژی کەنیسە دەوستنەوە.

بەڵام لە ساڵی (١٦٥٥)زاینی دوو دەسەڵاتی مەسیحی کردیانە شەڕ بۆ ماوەیەکی کاتی، کوشتنی کۆمەڵ کوژی هیندەکان ڕاگیرا، وە لە ئەوروپا بە هەمانشێوە شەڕ دەستی پێکرد لە نێوانی پڕۆتستانت و کاثۆلیکەکاندا و لە خاکی ئەمریکادا زۆربەی پڕۆتستانتەکانی تێچون ڕایان کرد لە دەستی زوڵمی کاثۆلیکەکان، تا بە تەوای خەڵکانی پڕۆتستانت لە ئەمریکادا جێگیر بوون کە زۆریان وابەستە بوون بە ئایینەکانەوە!

دروستبوونی ئەو ژیارە گەورەیە کە ئێستا ئەمریکا خۆی پێوە با ئەدا و ناوی ناوە ژیاری دیموکراسی بە لەناوبردنی ملیۆنەها هیندی سوور کە بە ئێسقان و خۆێنی ئەوان ئەم ژیارە و شارستانیەتەیان دروست کرد، لە ساڵی (١٧٧٩)زایینی بە تەواوەتی ئەم ئەمریکایەی کە ئێستا هەیە و دامەزراوە تەمەنی نزیکەی (٢٥٠)ساڵێك دەبێت، بەڵام بەخوینی ئەو هەموو هیندە سوورە دروستکرا کە هەموویان لە ناو بردن یان بە زنجیر دەیانبەستنەوە کڕین و فرۆشتیان پێوە دەکردن، لە کاتێك دا کە هیندەکان پێش (١٢٠٠)ساڵ لەو ناوچانە جێگیربوون کە دانیشتوانەکەی لە خاکی ئەمریکادا دەگەیشتە (٥٠) ملیۆن کەس یان مێژوو نووسان دەڵێن خۆی ئەدا لە نزیکەی (٨٠)ملیۆن کەس، ئێستا لە ناو خاکی ئەمریکادا ڕێژەی ئەم گەل وهۆزە ناگاتە (٢ ) ملیۆن کەس، شارستانییەت بەو شێوە بونیادنرابێت ژیاری تێدا دروست کرابێت دەبێت چاوەڕێی چی بین لێی کە ئیستا وا نیشاندەدات کە هندە سورەکان هیچیان نەزانیوە، ئەمان هاتوون فێری دیموکراسییان کردوون، لە ناوچەکەدا بە دیموکراسیەکەیان ئەو گەل هۆزەیان لە ناو برد.

هیچ ئاستەم نیە بەلای ئەمریکاوە کە ئەو هەموو خەڵکە لەناوبات، بۆ ئەوەی تەنها دوو ملیۆن دیموکراسی بن! ئەوانەی کە هاتوون کوردستان و عێراق ئازاد بکەن باو باپیرانیان ئەو کەسانە بوون، لەوانەیە کەسانێك بپرسن خۆ ئەو زەمەنە بە سەرچوو گرنگ دوای ئەو قۆناغەیە؟

زۆرباشە من دەڵێم باشیکردنەوەیەك لەسەر دوای ئەو قۆناغە بکەین کە هیندە سورەکان جینۆساید کران کە مێژوونوسان بە زەمەنی کۆیلە و بەندە لە ئەمریکادا ناوزەندی دەکەن کەسێکی وەك {کارلهاینتس دشنر} کە مێژوونووسێکە ئەم قۆناغەمان بۆ دەست نیشان دەکات لە کتێبی (Karl-heinz Deschner Der Moloch Eine kristsche Geschichte der USA) دەڵێت لە دوای لەناوبردنی هیندە سوورەکان قۆناغی بەندایەتی لە ئەفریقا دەستی پێکرد، لە دوای ئەوەی کە ئەم ئاغا و دەسەڵاتدارانە دەستیان گرت بە سەر ئەمریکادا پێویستیان بە وە بوو کە خەڵکانێك ژیاریان بۆ دروست بکات، شەقامەکانیان بۆ پاك بکاتەوە، لە ماڵەکانیاندا خزمەتکاریان هەبێت تا خزمەتی خانمەکانیان و منداڵەکانیان بکات، بۆ ئەم مەبەستە ڕوویان کردە خاکی ئاڵتونی ئەفریقا بە زنجیر خەڵکیان دەبەستەوە دەیانگواستنەوە بۆ ئەمریکا، لە شەودا قەفەسی گەورەیان ئامادە دەکرد و ماڵ و خێمەکانیان دەسووتاندن تا ڕاکەنە دەرەوە لە لانەکانی خۆیاندا، پاشان بە خەنجەر و باڕووت و تفەنگ دەیان گرتن و ڕایان دەگواستنەوە بۆ ئەمریکا، کە لە (٪٧٠) خەڵکەکە دەمردن تا دەگیشتنە جێگای مەبەست، پاشان بە زنجیر دەیان بەستنەوە لە جێگایەك تا دەگیشتنە خاکی هیوا کە ئەمریکا بوو، جاری وا هەبوو بە چەند مانگێك دەگەیشتن، دەبوو ببەسرانایەتەوە تا دەگەشتنە ئەمریکا ئەوەی بمردایە دەیان وت ئەوا بێ هێزە و بەکەڵکی ژیان نایەت بۆیە مردووە...

لەو زەمەنەی کە ڕاوی ئەفریقییەکان دەستی پێکرد، ئەوان لەو کاتەوە ئیرهابین، خوێنی گەلانی تر دەمژن بۆ پێگەیشتنی خۆیان، ئەگەر ئەمە مێژووی زێرینیان بێت ئەی خاك بەسەر کورد و کوردستان کە ئەمڕۆ بە هاوپەیمانی دەزانن.!

بەپێی ئەم ئامارەی کە لە بەر دەستدایە دەڵێت زیانی گیانی ئەفریقیەکان گەیشتە زیاد لە (٢٠) ملیۆن کەس، بەمە دەمارگیر و ناڕەحەتی خستە نێوان ڕەش پێست وسپی پێست کە بۆ دامەزراندنی وڵاتی دیموکراسی ئەو هەموو خەڵکە لە ناو چوون، ڕەشەکان هەڵسان بە کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات و وێسگەی شەمەندەفەر و باڵەخانەی بەرز تا ژیاری ئەمریکایان دامەزراند، ئەمریکا بوو بە ئەمریکای دیموکراسی.

خەڵکانێك لە وانەیە بپرسن ئەی بۆ باسی سەدەی بیستەم ناکەیت کە ئەمریکا چۆن دیموکراسی بڵاو کردەوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێم:- خەڵکانێك وا هەست دەکەن کە دەمارگیری بە گوێرەی قۆناغەکانی مێژوو کۆتایی دێت، ئەمە لە ڕاستیدا وا نییە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو ڕێك پێچەوانەی ئەمە دەبینین! چۆن؟ ئەمریکا یەکەم دەوڵەتە کە چەکی ناوەکی و کۆمەڵکوژی بەکارهێنابێت، بێجگە لەو کەسێکی تر پێش ئەو بەکاری نەهێناوە، هەر ئەمریکا بوو لەساڵی (١٩٤٥)دا دوو بۆمبی ئەتۆمی بەکارهێنا بەرانبەر بە دوو شاری سڤیل کە (هێرۆشیما وناکازاکی) بوو، لە ماوەی یەك خولەکدا ٨٠،٠٠٠ هەزار کەس لە منداڵ و پیرو جوان تیاچوون و بە سەدەها هەزار خەڵکی کەم ئەندامی تێدا دروست بوو، بەردەوام ئەوە منداڵەی لەدایك دەبێت لەو دوو شارەدا کاریگەری تیشکی ناوەکی هەر لە سەرە، یاخود

تووشی وەرەم دەبێت یان ناژی دەستبەجێ دەمرێ. من بەلامەوە سەیرە کە فرمێسکی تمساحاوی دەڕژێت بۆ گۆڕێکی بە کۆمەڵ کە (٣٠-٤٠) کەسی تێدایە ئەی گۆڕە بە کۆمەڵەکانی هێرۆشیما و ناکازاکی.

پاشان کە لە شەڕی هێرۆشیما و ناکازاکی دەرچوو ڕووی کردە شەڕێکی تر لە ساڵی (١٩٥١) لەگەڵ کۆریادا کە زیاد لە سێ ملیۆن کۆری بە دەستی ئەمریکییەکان تیاچوون و کوژران ئەی وڵاتی دیموکراسی ئاشتی و ئازادی بردە ئەو وڵاتانە تا دڵم پێ خۆش بێت بۆ کوردستان و عێراق و ئەفغانستان.. پاشان لەوێ لە دوای ئەو هەموو کوشتارە ڕوی کردە ڤێتنام لە ساڵی (١٩٦٤) تا ساڵی (١٩٧٣) نزیکەی چوار ملیۆن خەڵکی کوشت لە ماڵی خۆیان لە خاکی خۆیان، ئایا بۆ دامەزراندنی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ بوو؟ شەڕی ڤێتنام بە گەورەترین شەڕی کۆمەڵ کوژی دادەنرێت لە جیهاندا.

پاشان ڕووی کردە وڵاتی موسڵمانان مێژوویەکی ڕەشی بۆ خۆی تۆمار کرد کە بەیارمەتی سەهیۆنییەکان لە ساڵی (١٩٤٨) تا ساڵی (١٩٦٧) گەورەترین قەسابخانەی سازدا بۆ موسڵمانان لە (بحربقر و قانا) زۆری تر لە دێهاتەکانی فەڵەستینی خۆشەویستدا، پاشان هەر لە ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٧٣)دا شەرێکی سازدا بە هەزاران موسڵمان تیاچوون لە شەڕی ڕەمەزان دا، لە دوای ئەوە لە ساڵی (١٩٨٢)دا ناپاڵمێکی هێشویی (عنقودیە) بەکارهێنا، ئەو چەکە لە هەموو وڵاتاندا قەدەغەکرا بوو کە بەرانبەر بە لوبنان بەکاریهێنا، بەڵام ئەگەر بەرانبەر موسڵمان بێت هێچ کێشەیەك دروست ناکات، لە هەمووی سەیر تر ئەوە بوو کە ئەمریکا هات بۆ لێدانی عێراق بۆ لە ناوبردنی چەکی کۆمەڵکوژی کەچی خۆی چەکی (یۆرانیۆمی) بەکارهێنا کە ئەو چەکە لە هەموو جیهان

قەدەغە کرابوو کە ئێستا کاریگەری هەیە لە سەر ناوچەکە تەنانەت مامۆستایەکی زانکۆی سلێمانی لێکۆڵینەوەی کردبوو، لەسەر ئەو تیشکە کە خۆی شارەزایی هەیە لە (فیزیای نەوەوی)دا ئیتر من هیچ گۆمانێکم نەما لەوەی کە ڕاستە، ئیتر نازانم دەسەڵاتدارانی ئێمە چۆن خۆیان بە هاوپەیمانی هێزێکی وا بەربەریی دەزانن بە ڕاستی سەیرە و شەرمە ؟! بە نهێنی چەکی کۆکۆژی دا بە {میلۆسۆڤیچ} کە لە خاکی کۆسڤۆ بە کاری هێنا کە لە دنیادا ئەم جۆرە چەکە قەدەغە کرابوو، بە هەزاران خەڵکی موسڵمانی ئەلبانی نەژاد کوژران کە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا خۆیان دانیان بەوە داناوە تا یەك ملیار ساڵی تر کاریگەری دەبێت لەسەر زەوی. جارێ با وێران کردنی ئەفغانستان بوەستێت کە بە ملیۆن خەڵکی ئەفغانی لەژێر داگیرکەرێکی وەك ئەمریکا دەناڵێنن، با شەڕی فەلوجە بوەستێت و کوشتنی خەڵکی بێتاوان لە عێراق کە هۆکارەکەی داگیرکەری ئەمریکایە، لەگەڵ ئەم هەموو کارەساتەی کە بەسەر گەلانی جهیان هێناویەتی دەبێت بزانین کێن ئەوانەی شەڕی بۆدەکەن؟

**خوێندنەوەیەکی دەروون ناسیی :**

دەبێت خوێندنەوەیەکی دەروونناسیمان هەبێت بۆ سەربازی ئەم وڵاتە، تا باش بیانناسێنین کە ئەمانە کێن؟ یان بپرسین بۆ لەزەت وەرگرتن لە ئازار و ئەو ئەشکەنجەیەی کە ئازاری زیندانیانی ئەبوغرێبیاندا بەو شێوە ناشرینەی کە بینیمان لەسەر بنەمای سێکسیی، هەروەها لە گۆنتانامو سەربازەکان لەبەرچاوی دیلەکاندا کاری سێکسی دەکەن، وەك ڕۆژنامەی دەیلی نیوزی باسی کرد، بەڵام بەرپەرچ درایەوە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی ئەمریکا کە پیاو لەگەڵ پیاوەکان دەم دەخنە ناو دەمی یەك کە بە وێنەوە بڵاو کرایەوە، پاشان ڕۆژنامەکە داخرا ئێستا بە ناوێکی

تر کار دەکات، ئەگەر مێژوویەك بەو ڕەشی ناشرینە هاتبێت بەلامەوە سەیرنییە کاری زۆر لەوە خراپتر ڕوو بدات. هەربۆیە لێرەدا دەمەوێت باسێکی ڕەوشتی سەربازەکانی ئەمریکا بکەم لە ڕووی پەروەردەییەوە:

ئەگەر سەرنج بدەین هەموو جۆرەکان ئازاردانی زیندانیان لە گۆنتانامۆ و لە ئەبوغرێب و زیندانەکانی ڕۆکی کۆن زۆربەی زیندانەکانی تریان لە سەر بنەمای سێکسیە، لەهەمان کاتدا ئەگەر سەیری کۆمەڵگای ئەمریکی بکەین ئەنجامێکی سەرسوڕێنەرمان بۆ دەردەکەوێت لە زمانی خۆیان و ئامارەکانی خۆیان..

لە شارێکی وەك لۆس ئەنجلوس و شیکاگۆ و سانفرانسیسکۆ و نیۆرك لە (٨٠٪) منداڵان کە تەمەنیان لە خواری هەژدە ساڵە هەموو بە کاری سێکسیی سەرقاڵن، کە داوێن پێسی دەکەن خەریکی (زین)ان واتا ئەو ئەوکەسانەی کە لە (٨٠٪)ی منداڵان پێك دێنن لەو وڵاتەدا!

لە شار و لادێکاندا بە کەمتر سەرژمێری کراوە کە ئاماژە بۆ (٣٣٪) دەکەن، ڕێژەکە لەجێگا بچووکەکاندا کەمتر دەبێتەوە، کەواتە شەریفترین جێگاکانیان لادێکانیانە کە لە (٣٣٪) یە.

لە سەرتاسەری ئەمریکادا سەر ژمێری کراوە کە منداڵەکان کە تەمەنیان لە خوارووی هەژدە ساڵە لە (٥٥٪) خەریکی زینان واتە کاری سێکسی ناشەرعی، ئەم ڕێژەیە لە ناو زانکۆ کە باسی دەکات لە (٩٠٪) لە ڕووگەی هەموو ئەمریکا دا.

لە هەمووی سەیر و سەمەرە تر لە ساڵی (١٩٩٨) تا ساڵی (٢٠٠٧) هەموو ساڵێك یەك ملیۆن و بیست و پێنج هەزار کەس منداڵی لە بار بردووە لەبەر ئەوەی نازانن باوکیان کێیە.

**بەڵگە لەسەر ئامارو ژمارەکان ڕۆژنامەی (US today ) :**

زۆربەی ئەو خێزانانەی ئەمریکا نازانن باوکیان کێیە واتا خێزان و باوك لە ماڵدا نیە، هێمای باوك نابینرێت کە لە (٢٤٪) خەڵکی ئەمریکا واتا چواریەکی سەربازانی ئەمریکی بێ باوکن، لە (٦٠٪) خەڵکی ئەمریکا ناپاکی لەگەڵ خێزانەکانیان دەکەن یان بە پێچەوانەوە ژنان ناپاکی لەگەڵ پیاوانیان دەکەن، لە (٢٦٪) دانیشتوانی تووشی نەخۆشی بوون لە ڕێگای کاری سێکسی یەوە، لە هۆکاری کاری سێکسی ناشەرعییەوە، وە لە ساڵی (١٩٩٣) تا (٢٠٠٣) لەماوەی ئەو دە ساڵەدا هەموو ساڵێك بەکۆی گشتی (٣٨٠) هەزار ڕووداوی دەستدرێژی دەکرێتە سەر دانیشتوانی ئەمەریکا لە لایەن خەڵکی خۆیەوە بێجگە لەوەی کە زینا دەکرێت بە ڕەزامەندی هەردوولا، ئەمە لەو سەرچاوە وەرم گرتوە کە ئاماژەم پێکردوە، بەڵام با بزانین ئەمریکا خۆی بە فەرمی لە دەزگاکانی خۆیەوە چی دەڵێت؟

ڕاپۆرتی وەزارەتی دادی ئەمریکی دەڵێت: ئەم ڕاپۆرتە لە ساڵی (١٩٩٤) دەرچوو بەڵام لە ساڵی (١٩٩٢) بە دواداچوونیان لەسەر کردووە تەنها لە دە ویلایەتی ئەمریکادا، شایانی باسە ڕاپۆرتێك بوو ئەمرکییەکان خۆیان زۆر ناڕەحەت بوون پێی کە دەڵێت لە ڕاپۆرتەکەدا نزیکەی چواریەکی ئەمریکا کە دەستدرێژیان دەکرێتە سەر منداڵانی دوانزدە ساڵەن، ئاگاداربن تەنها باسی دە ویلایەت دەکەین، لەهەمووی ناهەموارتر لە (٢٠٪) ئەو منداڵانەی کە دەستدرێژییان دەکرێتە سەر لە لایەن باوکیانەوەیە، ئەگەر سەرنج بدەن ئەم ڕاپۆرتە ڕاپۆرتێکی فەرمییە، هەندێ جار لە بەر ڕای گشتیی کارەکان وەك خۆی نیشان نادەن دەیشارنەوە، لە (٥٤٪) بەهۆی نزیکەکانیانەوە دەستدرێژی دەکریتە

سەریان وە لە (٢٢٪) لە ڕێگایی ناسینەوە وە لە (٢٪) لە ڕێگای نا ئاشانایی دەستدرێژی دەکرێتە سەریان، ئەم وڵاتە هەموو گیانیان کێشەیە لە ناوخۆی خۆیان.

خۆێنەری ئازیز وەرە با پبرسین لە هزری خۆمان ئەگەر سەربازێك لە ناو خاك و نیشتیمانی خۆی لە ناو کەس و کار و خۆشەویستانی خۆی ئەمە کار و فەرمانی بێت ئەو هەڵسو کەوت، بکات پێت وایە لەگەڵ دوژمنەکەی کە موسڵمانە و خاکی عێراقی داگیرکردووە دەبێت داخۆ چۆن ڕەفتار بکات ئازاری زیندانیان و نەوەکانی بدات..

**ئارەزوە شازەکانی سێکسی (الشذوذ الجنسي) :**

پزیشکە دەروونیەکان لە ئەمریکادا ئەو ئارەزووە شازە سێکسیانە لە سەرەتادا بە نەخۆشییەکی دەروونی دەزانی وەك ڕابواردنی پیاو لەگەڵ پیاو، مارەکردنیان لە یەکتری، مارەکردنی ئافرەت لە ئافرەت، مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵدا، بەڵام لەم دواییانەدا لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی ئەم هەموو کارەساتانەدا ئێستا لە کۆمەڵگای ئەمریکی بووە بەکارێکی ئاسایی، تەنانەت لەگەڵ کلتوردا وا تێکەڵ دەبێت، سەرۆکی ئەمریکای ڕابوردوو(بیڵ کلینۆن) بۆ ئەوەی کەسایەتی خۆی بە هێز بکات لە هەڵبژاردنەکاندا و تا خەڵکی زیاتر دەنگی بۆ بدەن بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە لە ناو سەربازانی ئەمریکی دا ڕێگای زیاتر دەکاتەوە بۆ ئارەزووە شازە سێکسیەکان، ئەم وتارەی سەرۆکی ئەمریکای وا لێکرد کە سەرکەوتنێکی گەورە بە دەست بهێنێت.

خۆێنەری زێدە ئازیز...

ئەم کارە سێکسییە شازانە وای لێهاتووە لە ئەمریکادا بۆتە کێشەی نەتەوەی ئەمریکا، تەنانەت لە ناو سەربازان دا ڕەگی داکوتاوە بۆتە کارێکی حەتمی، بۆیە سەرۆکی وڵات باسی لەسەردەکاتو، پێگەی خۆی پێ بەهێز دەکات، لە هەموو ئامارەکانی جیهاندا هاتووە کە ئەمریکا یەکەم دەوڵەتە کە لەناو سەربازەکانیان و لە ناو زیندانەکانیاندا کاری شازی سێکسی دەکرێت، هەندێك لە کڵێساکانی ئەمریکا بە ئاشکرا پیاو لە پیاو مارە دەکەن وە کارەکە فەرمییە، لە ویلایەتێکی وەك (ماساشوتس) کە لەدەستورەکەیدا هاتووە دەڵێت پیاو لە پیاو مارە دەکرێت واتا کاری یاسایی بۆ کراوە بە فەرمی ناساندوویانە هەموو پێداویستی مارەکردنەکە ئامادە کراوە لە دەستووردا وەك جیابوونەوە واتە (طلاق) و عەقدی زەواج واتا بڕوانامەکەی وەك میرات.

ئەو ئامارانە دەری دەخەن کە دانیشتوانی ئەمریکا بە نێر و مێ تووشی جۆرەکانی ئارەزوی سێکسی بوون خۆی ئەدا لە پەنجا ملیۆن کەس، حەڤدە ملیۆنی لە ناو هێزی سەربازی ئەمریکادایە، قوربانیانی نەخۆشی ئایدز لە ئەمریکا لە ساڵی (٢٠٠٢) دەگاتە (٨٨٦) هەزار کەس کە دەناڵێنن بە دەست نەخۆشی ئایدزەوە نیو ملیۆن خەڵك مردوون بەو نەخۆشییە، لەگەڵ ئەو هەموو کارەساتەدا تا ئێستا لە ئەمریکادا کاری سێکسی شاز کارێکی ڕێگە پێدراوە بەئاشکرا دانیان پیاداناوە.

جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان ئەورپا و ئەمریکادا، سەربازانی ئینگلیز بە هەمان کار و فەرمانیان، جیاوازی لە نێوانیدا زۆر کەمە تەنانەت لە ئەوروپادا هەموو ساڵێك کۆنگرەی بۆ دەبەسرێت لە ئەمستردامی هوڵندی کە زیاد لە یەك ملیۆن کەس لە هەموو جیهان کۆدەبنەوە بۆ ئەو کۆنگرەیە وە لە هەموو وڵاتەکانی تردا وەك ئەڵمانیا، نەرویج، دانیمارك،

سوید، نەمسا، بەلجیکا، فرنسا، دەیان وڵاتی تر کە خۆپیشاندان دەکرێت پیرۆزی دەدەن بە کارەکەیان و ئەم خۆپیشاندانە هەموو ساڵێك لە هاویندا دەکرێت.

تەنانەت ئەم خەڵکەی کە ئارەزووی جۆرە لەزەتەکانی سێکسی هەیە، بەڵکو بەرنامەی تایبەتییان هەیە و هەندێك کەرەستە بەکار دێنن کە چەندەها بازاڕ و دوکانیان هەیە بە ئاشکرا خەڵکی ڕووی تێدەکەن بە تایبەت لە ئەمریکا و ئەوروپا بەگشتی کە لە دوکانەکاندا زنجیر و حەبل و کورسی تایبەت و قامچی و دەیان کەرەستەی تر کە بەکاردەهنرێن بۆ ئەو کارانە، ئەم کارانەی کە باسمان کرد هەموو لەناو سەربازانی ئەمریکیدا دەبینرێت.

ئەمە ئاکاری ڕەوشتبەرزی سەربازەکانی ئەمریکایە و کە چۆن تووشی نەهامەتی سەر لێشێواوی بوون، گەورە پیاوانی ئێمەش تازە بە تازە دەیانەوێت ببنە هاوپەیمانی خەڵکێکی کەم ڕەوشت، ئایا پێتان وایە هێزێکی گەورە بەو شێوەیە دامەزرابێت خێر بداتەوە بۆ دوژمنەکانیان کە ئێمەی موسڵمانین، ئەم پرسیارە بۆ هاوپەیمانەکانیانە؟!

جیاوازییەکانی نێوان ڕەش پێست و سپی پێست لەگەڵ ئاسیایەکاندا لە وڵاتی ئەمریکای دیموکراسی:

دەست پێکردنی دەمارگیریی لە ناو سوپا و سەربازانی ئەمریکی چۆن دەستی پێکردووە؟ لە کۆمەڵگای ئەو وڵاتەدا چۆن سەری هەڵداوە؟ هەروا کاریگەری لە سەر سوپای ئەمریکا کردووە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان سپی و ڕەش پێست دا کە لە سەرەتا دا ئاماژەمان بۆ کرد لە دەستپێکی هێنانی ئەفریقییەکان ناونرا بە سەردەمی کۆیلە، وەك مێژوونووسەکان باسی لێوە دەکەن کە لە زۆربەی

باخچە و شوێنە گشتیەکان و لە زۆربەی چێشتخانە و ڕێستورانتەکاندا نووسرابوو هاتنە ژوورەوەی ڕەش پێست و سەگ قەدەغەیە.

هەرچەندە لە دەستووری ئەمریکادا هیچ جیاوازییەك لە نێوانی ڕەش وسپی پێست و جیاوازی ئایینی و ڕەگەزی ڕەت دەکاتەوە، بەڵام ئەو جیاوازییە لەم سەردەمەدا و لەم سەدەی بیست و یەکەمەدا بەئاشکرا دەبینرێت کە گەڕەکی سپی پێستەکان زۆر جیاوازترە لە ڕەشەکان و زانکۆی سپی پێستەکان زۆر پێشکەوتو ترە لە زانکۆی ڕەشەکان، ئەم جیاوازییە بە ئاشکرا لە ناو کۆمەڵگای ئەمریکادا دەبینرێت، ئەمە بۆتە هۆکاری ئەوەی کە زیاتر دەمارگیریی لە نێوانیاندا زیاد ببێت.

زۆربەی ئەو تاوانەی کە دەکرێت ڕەش پێستەکانن، زیندانەکانی ئەمریکا زۆربەی ڕەش پێستن وە هەر ئەو هۆکارەیە وای کردووە کە ڕەش پێستەکان زیاتر بیر لە کرمینالێتی بکەنەوە زیندانەکان بەوان پڕ بکەن، سەرچاوەیەکی وەزارەتی داد دەڵێت لە (٨٠٪) ڕەش پێستەکان خەریکی کاری خراپەن لە کڕین و فرۆشتنی مادە سڕکەرەکان و نانەوەی ئاژاوە لە ئەمریکادا، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەمارگیری سپی پێست بۆ ڕەشەکان.

ئەگەر بیر لەم کارەی ناو کۆمەڵگای ئەمریکی بکەینەوە، لەکاتێکدا کە سپی پێست دەمارگیر بێت بەرانبەر بەدانیشتوانی وڵاتەکەی خۆی، ئایا چاوەڕوانی چی لێدەکەیت بۆ وڵاتێك کە داگیرکرابێت، لە میدیاکانی خۆیەوە بە هەزاران ناو و ناتۆرە بە موسڵمانانەوە دەنێت و جارێك ناوی دەنێت ئیرهاب و جارێك تیرۆریزم و جارێکی تر بە خەڵکێکی گێرەشێوێن و یان لەم دوایانەدا ناویان ناین بە ئیسلامی نازی، لەوانەیە خەڵکانێك بڵێن ئەم زاراوانە بەس لە بەرانبەر ئیسلامیەکان بەکار دێت ! بەڵام خۆ

پارتی کرێکارانی کوردستان عەلمانین و چەپن لە هەمان کاتدا بە دەیان ناو و ناتۆرە لەوانیش دەنێن کە فڕیان بە سەر ئیسلامەوە نیە یان وڵاتێکی وەك کوبا، دەیان نمونەی تر کە بۆ باسی تر ئامادەکراون تەنها وەك نمونە باسیان دەکەم لێرەدا.

لە کاتێکدا کە سپی پێستی ئەمریکی بە دەمارگیری و ڕەش پێستیش داخی دڵی خۆی دەڕێژێت دەیەوێت گرێی دەرونییەکانی بکاتەوە، هەموو ئەم بارە دەروونیانە بە سەر خەڵکی وڵاتانی داگیرکراوی وەك عێراق و ئەفغانستان دەکەنەوە، ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکی موسڵمان دەدەن، سەرکردەکانی ئێمە تەنانەت توانای ئەوەیان نیە کە بەرگریمان لێبکەن نەکو دەسەڵاتی خۆی لەق بێت، نازانێت ڕۆژێك دێت نە ئەمریکی دەمێنێت نە سوپای هامان و فیرعەون دەمێنن، خۆی دەمێنێتەوە لە ناو کۆمەڵگاکەی خۆیدا پاشان داوای بەزەیی دەکات لە خەڵکی وڵاتی خۆی، بۆ تۆ ئێستا بەزەییت بەوڵاتی خۆتا نایەتەوە لە کاتێکدا دەسەڵاتێکی تا ڕادەیەك باشت هەیە.

دەمەوێت بڵێم کە ئەمریکا بە دەردی هیچ کەس ناخوات، تەنانەت بە دەردی خۆیان ناخۆن، چۆن هاوپەیمانی لەگەڵ دەبەستیت، سەیرە کە گورگ بکرێتە شوانی مەڕ!

لەگەڵ ئەوەی کە سپی پێست دەمارگیرە، ڕەش پێست ڕقی لە هەموو شتێك دەبێت تووشی هەموو جۆرە نەخۆشییەکی دەروونی بووە، بەڵام ئەمریکا ڕووکارێکی باش دەدا بە کۆمەڵگاکەی خۆی لە ڕووی میدیا و ڕۆژنامەوانییەوە، ئاساییە کە وەزیری دەرەوەی وڵات ڕەش پێست بێت ئەمە تەنها ڕووکەشە یان لە هۆلیوددا ڕەش پێستێك سپی پێستێك حەزی لێدەکات یان پێچەوانەکەی، کە ئەمە لە ڕاستیدا تەنها ڕووکەشە

بۆ سەرلێشێواندنی ڕای گشتیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دوو ڕەگەزە ئاسمان و ڕێسمانیان نێوانە ، ئەمە دامەزارندنی دیموکراسی بوو نمونەیە کە لە جیهان.

لە لایەکی ترەوە باس لەوە دەکرێت کە چینی و خەڵکانی ئاسیا بەگشتی زۆر بە کەم سەیر دەکرێن، بازاڕ و کوچە و کوڵانەکانیان زۆر جیاوازە هیچ خزمەت گوزارییەکیان بۆ ناکرێت، تەنانەت لە ناو ئەمریکییەکاندا بە مشکی زەرد ناویان دێنن.

**پەیوەندی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی نادروست :**

ئەم باسە لایەنێکی زۆر گرنگە لە ژیانی سوپای ئەمریکا و گەلەکەی بەگشتی، پێش ئەوەی باسێکی لایەنەکە و ئەم تەوەرەیە بکەم، دەمەوێت ئەوە بڵێم کە هەموو ئەم ژیانە لەسەر بەرژەوندی دادەمەزرێت، بەڵام بەرژەوندی تا بەرژەوندی جیاوازە، بۆنموونە بەرژەوەندی دروستمان هەیە کە کاریگەری نەبێت لە سەر خەڵکانی تر، چونکە من خۆم بڕوام بە بەرژەوەندی دروست هەیە کە کاریگەری لەسەر تاکەکەس و کۆمەڵگا دانەنێت، چونکە بەرژەوەندی نەبێت ژیان دروست نابێت، تەنانەت ژن و مێردایەتی لە سەر بنەمای بەرژەوندی دادەمەزرێت، بەڵام ئەوە بەرژەوندی دروستە، بەرژەوندی نادروست ئەوەیە کە کاریگەری لەسەر خەڵکی تاکەکەس و کۆمەڵگا هەبێت وەك ئەوەی کە بۆ بەرژەوەندی خۆت سەروەت و سامانی خەڵکی بەفیڕۆ بدەیت، یان تۆ خاوەنی شتێك نیت لە بەر بەرژەوەندی خۆت زەوتی بکەیت، ئەمە سەرەتایەکە بۆ تێگەیشتن لە چەمکی بەرژەوەندی.

ئەگەر سەیری بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا بکەیت لە سەر بنەمایەکی نا دروست دادەمەزرێت، بەرژەوەندی ئەمریکا کە دەست پێدەکات لەگەڵ یەهود دایە بەرژەوەندی یەکەمە، لە ڕاستیدا ئەم دوو بیروبۆچونە جیاوازن بەیەك لە ڕووی ئایدیا و دینەوە، بەڵام چونکە ئەمریکی و سەربازەکانی پەروەردەیەکی بەرژەوەندی نادروستن بۆیە لە سەر بنەمای بەرژەوەندییەکان دادەمەزرێت، لای هەمووان ئاشکرایە کە ئەمریکا زۆرینەی خەڵکەکەی مەسیحین و ئیسرائیل یەهودییە، مەسیحییەکان پێیان وایە یەهودییەکان حەزرەتی مەسیحیان کوشتووە و لەخاچیان داوە، ئەمە خۆی لە ڕاستیەوە دوورە (وما قتلوه، وما صلبوه، ولکن شُبِّهَ لهم ) النساء/ ١٥٧، واتە: نە کوژراوە نە لە خاچ دراوە بەڵکو شێوەی گۆڕاوە بەرز کراوەتەوە بۆ لای پەروەردگاری، کە لە ڕاستیدا ئەم دوو دەسەڵاتە زۆر ڕقیان لەیەکە، بەڵکو بە درێژایی مێژوو تا ئێستاش دژایەتی یەکتری دەکەن، چونکە ئێستا بەرژەوەندیان بەیەکەوەیە ئەوەتا بە ئارەزووی خۆیان لە موسڵمانان دەکوژن، واتێمەگەن کە تا سەر لەگەڵ ئیسرائیل دەبێت کە بەرژەوەندی نەما بە بڕوای من وازی لێدێنیت، ئەگەرچی پەیوەندییان لەوپەڕی توندوتۆڵیدا بێت، بۆ نمونە کاتێك کە بەرژەوەندی نەبوو لەگەڵ ڕوسیای شیوعیدا هیچ بەربەستێك نەبوو بۆ یارمەتی ئەفغانستان زۆر بە باشی یارمەتی دەدان، تەنانەت لە هۆلیود فیلمیان لەسەر دەردەکردن، تا وای لێهاتبوو کڵاوێکی ئەفغانی لە ئەمریکادا دەچوە سەد دۆلار بەڵام کاتێك بەرژەوەندی نەما لای هەمووان ئاشکرایە چۆن داگیری کرد هەر ئەو گروپە مجاهیدە بوون کە ناوی دەبردن، بەڵام ئێستا ئیرهابین.

لەکاتێك دا کە بەرژەوەندییان لەگەڵ سەدام دا بوو، سەدام پیاوێکی ئازاو بە سەرۆکی ئومەی عەرەبی بانگیان دەکرد، کاتێك کە کیمیایی

ڕشت بە هەڵەبجەدا و ئەنفالی کرد ئەمریکا دەستخۆشی لێکرد، تەنانەت لە ڕۆژنامەیەکی دا باسی نەکرد تەنانەت کە کۆمەڵێك لە کوردەکانی دانیشتووی ئەمریکا ویستیان خۆپیشاندان بکەن، سەفارەتی عێراق کەئەودەمە ئاگاداری دەزگای فیدراڵی کردەوە کە نەهێڵن ئەوە بوو کرا، بەڵام نەیان هێشت هیچ میدیایەك بیبینێت، بەڵام کە کاریان پێ نەما سەدام بوو بە ڕژێمی کۆنەپەرست و باسی گۆڕی بە کۆمەڵیان زیندوو کردەوە، پاشان ئەو موشەکانەی کە پێی فرۆشرابوو خۆ لە ئاسمانی نەکڕیبوو بەڵکو لە ڕۆژئاوا کڕابوو، هەموو ئەمانە بوونە کاری سیاسی و دەستی پێکرد، بەڵام کاتێك بەرژەوەندی لەئارادایە هێلیکۆپتەری پێ دەفرۆشن لەگەڵ موشەك، ئەو کات سەدام پیاوێکی ئازاو قارەمان بوو، ئەی ئەو کاتە بۆ هاوپەیمانی کوردیان نەدەکرد، ئەم پرسیارە بۆ بەرپرسانی ئێمە؟!

ئەمریکا لە کاتی بەرژەوەندییەکانی خۆی دا ناوی زۆر جوان دەبەخشێت بە هاوپەیمانانی وەك سەعادەتی وەزیر فەخامەتی ڕەئیس یان ئەلسەید ئەلسەفیر لەگەڵ هەموو جۆرە عیبارەتێکی جوان و باق و بریق کە کاری پێت نەما، چاوەڕێی ئەوەبە پێت بڵێت تیرۆریزم و دەیان ناوی ناشیرینی تر، کەواتە بزانە ئەمریکا لەسەر بەرژەوەندی خۆی کاردەکات، وەك خۆیان دەڵێن یەکەم ئەمریکا پاشان ئەمریکا کوتایی هەر ئەمریکا، نازانم چاوەڕوانی چین لە ئەمریکا، چۆن بیسەلمێنین کە ئەمریکییەکان وا دەکەن ؟

لە ڕاپۆرتێکی وەزارەتی سەربازی ئەمریکی بە فەرمی هاتووە بە ئاشکرا و بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك دەڵێت ئەشکەنجەی زیندانیانی عێراقی بدەن، بۆ ئەوەی چاوترسێن بن هەر بە گەیشتنی ئەم هەواڵە بۆ سەربازانی ئەمریکی لەلایان جەنەڕاڵێکی سەربازی کە ناوی (مەیجورە) ئەوە بە ئاشکرا دەڵێت کە دەبێت ئەوپەڕی سزاو ئەشکەنجەیان بدەن بۆ

چاوترسێنی خەڵکی تر، هەر ئەو ڕۆژە وەك ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی خۆی دەڵێت کە بەناوی سیخورییەوە منیان نارد بۆ عێراق هەواڵەکەیان بە فەرمی دا بە من کە ناوی (أنطونیو تَجوبا)خۆی ڕاپۆرتێکی نووسیەوە دەڵێت: کۆمەڵێك لە زیندانییەکانیان هێنا جل و بەرگی ئافرەتیان لە بەرکردن پاشان دەستیان کرد بە لێدانیان و جلوبەرگیان لە بەردادڕاندان، بە وێنەی فۆتۆگرافی گیراو پاشان بە ڤیدیۆ گیراوە کە لە فیلمێکی ئەمریکیدا بەشێکی دانراوە کە من خۆم ئێستا فیلمەکەم لایە لە بازاڕیشدا بڵاوە و لە ئینتەرنێت لە بەشی یوتوب دابەزێنراوە ئەمە ناوی فیلمەکەیە..

Valley of the wolves Iraq,,,,,,,,war without Rules

ئەوەی دەستی نەکەوت وەك سەرچاوە پێویستی بوو، دەتوانێت پەیوەندیم پێوە بکات تا بۆی دەستەبەر بکەم..

وەڵاهی کە دەیبینیت دڵت ژان دەکات بۆ ئەو موسڵمانانە، چ جای ئەوەی کە موسڵمان خۆی دڵی پڕ لە نووری ئیمانە، لەپاشاندا خێزانی کەسێکیان دێنن کە ناوی {م..س..دلێمیە} خێزانی مامۆستایە لە قوتابخانەیەکی ناوچەکە ناوی {س..آ..} کە بە چوار سەربازی ئەمریکی لە بەرچاوی مێردەکەی لەگەڵیدا ڕادەبوێرن، تا کەسێکیان لە کاتی سێکسدا دەست دەخاتە دەمی و دەیخنکێنێت و پاشان سەربازێکیان بە مردوویی هەر لە بەرچاوی مێردەکەی لەگەڵ لاشەکەیدا ڕادەبوێرێت، پاشان شەهوەتی خۆی ئەدا لە دەموچاوی مێردی ژنەکە کە بەسراوتەوە لە کۆتایدا بە پێکەنینەوە دەڕۆن وەك {آنطونیو} دەڵێت :- ویستم هەواڵی میردی ئافرەتە مردووەکە بزانم لە دوای دوو ڕۆژ لە بەندیخانە گیانی دەرچوو بوو. ئەنطۆنیو دەڵێت:- زانیان کە من زۆر بەوە ناڕەحەت بووم گەڕامەوە، بەڵام (سی.ئای.ئەی) هاتە سەرم لەگەڵ خودی شەخسی (میجور) کە ئاگاداریان

کردمەوە باسی ئەو کارەساتە نەکەم، منیش ڕام کرد و دامە ڕۆژنامەیەکی فرەنسی بۆیان بڵاو کردمەوە، وە بۆ زانیاری زیاتر ئەنطۆنیو خۆی یەهودییە لە دەزگای مۆسادی ئیسرائیلی کار دەکات، پاشان شیکارییەك دەکەم لەسەری کە چۆن بە شوێنیدا دەگەڕێن ئەم کارەی کرد لە بەر خاتری موسڵمانان نەبوو، بەڵکو دوایی دەردەکەوێت کە کارێکی سیاسی لە پشتەوەبوو لەلایان مۆساد بۆیە بە شوێنیدا دەگەرێن لە لایەن CIA.

خۆێنەری ئازیز بەلاتەوە سەیر نەبێت کۆمەڵگایەك خۆی پڕبێت لە کاری سێکسی شاز و هەموو ئینحرافاتێك چاوەڕوانی چی لێدەکەیت، هەموومان بە چاوی خۆمان بینیمان چۆن ئازاری زیندانیانی ئەبوغرێبیان دا زۆر لە سەر ئەمیان ناڕۆم هەموو لایەك کەم تا زۆر ئەوەمان بینی، بەڵام با بپرسین کێ ئاشکرایکرد ئەو کارە لە سەر دەستی کێ ئاشکرا بوو؟ بۆ لەو کاتەدا ئاشکرا کرا، هەڵبەت من وەك نووسەرەکانی تر زۆر بە شان و باڵیدا نایەم ئەوەی کە لای من مەبەستە تەنها شیکارییە، دەمەوێت ئەوە بگەیەنم بە میللەتەکەم هاوپەیمانی ئەمریکا وەك ئەوە وایە کە دوای کڵاوی بابردوو کەوتبێتی بە بەڵگەوە بۆ ئەو گەلە ڕەش و ڕووتە ئاشکرای بکەم وەك کارێکی دواڕۆژیی و لە هەمان کاتدا وەك کارێکی نەتەوایەتی، با بپرسین بۆ لەو کات و زەمەنەدا ئەو وێنانە بڵاو کرانەوە؟ نهێنی لەوەدا چی بوو کە لەو کات و ساتە دا بڵاو کرایەوە؟

هۆکارچی بوو ئەو کارە ناڕەوشتییە بەو شێوەیە بڵاوکرایەوە، بە بەرچاوی هەموو سەرکردەکانی ئەمریکاوە، ئەگەرچی پێیان خۆش بوو یان ناخۆش بووبێت بەو شێوە سەربازانی سوپای ئەمریکا ئەشکەنجەیەکی نامرۆڤانەی ئەو زیندانیانەیان دا، زۆر دوور بوو لە ئاکاری مرۆڤایەتی، من دەڵێم لە دوو خاڵ بە دەرنییە:

**یەکەم :-** پێم وایە دەسەڵاتی ئەمریکی ویستی پەیامی ئەوە بدات بە خەڵکی عێراق و ئوممەتی ئیسلامی کە ئیتر ئێوە لاوازن توانای هەموو کارێکمان هەیە بەسەرتاندا، سەرشۆڕ و زەلیلیتان دەکەین تا نەتوانن لە ئاستماندا دەنگ بەرز بکەنەوە، لە هەمانکاتدا بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی سەربازانی ئەمریکی بوو، تا پەیام بدات بەوان بڵێت هەموو شتێك کۆنترۆڵە خۆمان دەسەڵاتی تەواوەتیمان هەیە، ئەمە لە کاتێکدایە کە شۆڕشێکی وەك، شاری فەلوجە سەریهەڵدا و حەوسەد شۆڕشگێری موسڵمان کوژران و زۆرێك لە سەربازانی ئەمریکی کوژرا و بێجگە لەو هەموو زەرەرە مادیانەی کە ئەمریکا کردی، ئەمە خاڵی یەکەمە لە سایکۆلۆژی ئەمریکی و ئەم خوێندنەوەیەم بۆی هەیە، لەهەمان کاتدا پەیامێکە بۆ وڵاتانی دراوسێ بۆ داهاتوو ئەگەر بەرهەڵستی ئەمریکا بکەن ئەوە ئاکامەکەیەتی.

**دووەم:-** وا هەست دەکەم ئەمەیان ڕاستتربێت وەك کاری سیاسی سروشتی ئەو خەڵکەی کە بەیەکەوە کاردەکەن دژی موسڵمانان، چونکە ئەمەی کە بڵاوکراوە من وا هەست دەکەم ئیدارەی بۆش زۆر بێ ئاگا بوون لە بڵاوکردنەوەی ئەو وێنانە، چونکە ڕامستفێڵدی سەرشۆر کرد دوای ئەو کارەساتە وازی هێنا، ئەگەر سەرنجێك بدەین کە بە چەند مانگێك ڕامستفێڵد وتی نامانەوێت دەوڵەتێك بۆ جولەکە دابمەزرێنین پاشان ببێتە دوژمنی مەسیحییەکان کە ڕامستفێڵد خۆی لە پارێزگارە توندڕەوەکانە، دوابەدوای ئەم وتەیە، جولەکە لە ئەمریکا و ئیسرائیل زۆر دڵگران بوون، ڕەخنە گیرا لە بۆش و ئیدارەکەی و لە هەمووی سەرنج ڕاکێشتر ئەوە بوو ئەو وێنانە لە کەناڵێکی {سی.بی.ئس}ی ئەمریکی بڵاوکرایەوە کە سەد لە سەد یەهودیە، وە لە ڕۆژنامەی {واشنطن پۆست} بڵاوکرایەوە ئەویش

سەد لە سەد هەر یەهودییە، لە بەریتانیا لە ڕۆژنامەی {دەیەلی میرور} کە ئەمەیش کۆنترۆڵی تەواوی لە دەست یەهودیەکانە، وە هەر لەو کات و ساتە بوو کە ئاژانسی هەواڵی فەرەنسا بڵاوی کردەوە لە ڕێگای ئەنطۆنیۆ لە فرەنسادا کە پێشتر لە سەرەوە ئاماژەمان پێکرد کە هەموو یەهودی بوون، دەبێت ئەوە بزانرێت کە لە (٥٠٪) ڕاگەیاندنەکانی ئەمریکا و بەریتانیا یەهودین و دوو کەناڵی گەورەی دنیا{رویتر؛ – أسوشیتد برس } کە سەد لە سەد یەهودین.

بۆ یەهود ئەم کارەی کرد لەو کات و ساتەدا ؟ئامانجیان چی بوو لەو کارە؟

هۆکاری یەکەم ئەوە بوو کاتی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا بوو بۆ ئەوەی پارێزگارە توندڕەوەکان سەرشۆرکەن کە دار و دەستەی بۆشن، پاشان کار ئاسانی بۆ دیموکراسییەکان بکەن، لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو یەهود ویستی سەرنجی ڕای گشتی جیهان بەلای عێراق ڕابکێشێت پاشان فەڵەستین لە یاد بکرێت تا بەو وێنانە جیهانی ئیسلامی سەرقاڵ بکات، ئەو سەردەمە زۆر کاری چەپەڵی کرد خۆی گەیاندە مەبەست، بێگومان ئەوەی یەهود دەیکات زۆر لە داگیرکردنی ئەفغان گەورەترە و هەرگیزا و هەرگیز لە عێراق ناکرێت، چونکە بەو وێنانە ویستی ئەمریکا ڕسوا بکات تا کارە بۆگەنەکانی خۆی لە یاد بکرێت وەك تیرۆرکردنی (شێخ ئەحمەد یاسین) و دەیان موسڵمانی تر کە تیرۆری کردن، وە گەورەتر نیە لەوەی کە کردی بەرانبەر بە ڕەفح و غەزە و ضفەی غەربی ئەو وێنانەی ئەبوغرێب، وە لەهەمانکاتدا (تۆنی بلێر) ڕەخنەی گرت لە ئیسرائیل کە گوایە زۆر زیاد لە خۆی پێی ڕاکێشاوە بە دوای ئەو وتانەی (بلێر) بە چەند ڕۆژێك لە کەناڵی {بی.بی.سی} کە سەد لە سەد یەهودییە، کێشەی بەصرەی سوپای بەریتانیا خستە ڕوو، هەر ئەوە بوو دوا بەدوای ئەوە

تۆنی بلێر چوو بۆ ئیسرائیل بە ئاشکرا، داوای لێبوردنی کرد بۆ ئەوەی زیاتر ئەو کارە ناڕەوشتییانەی سوپای بەریتانیا نەخەنە ڕوو.

کەواتە ئەو وێنانە تەنها یەهود سوودی لێوەرگرت، بەڵام ئێمە کە سەیری وێنەکانمان کرد هیچمان پێنەکرا وەك موسڵمان تا بتوانین بەلای کەمەوە ئەمریکای پێ ڕسوا بکەین تا ئەو هاوکێشە قیزەونانەی ئەمریکا و یەهود شیبکەینەوە، کەچی دەسەڵاتدارانی ئێمە، بە داخەوە تازە بەتازە خەریکی هاوپەیمانی لەگەڵ ئەمریکا و ئیسرائیلن تەنانەت لە بیریان چوو سەرکردەیەکی وەك( ئۆچ ئالان)بە دەستی سەرانی ئیسرائیل درا بە دەستی دەزگای هەواڵگری تورکیا (میتی تورکی)، لە ڕاستیدا من ئەم پەیامەم بۆ خەڵکی کوردستان و سەرکردەکانمانە بە تایبەتی، کەواتە پرسیارێك دێتە پێشەوە ئێمە کارمان چییە وەك تاك دوایی وەك دەسەڵات؟ دەبێت چی بکەین لە بەرانبەر ئەم داگیرکەرە؟

وەك پیشەی هەمیشەیم دە خاڵتان بۆ باس دەکەم بۆ کۆتایی بەم داگیرکەرە، چاوەڕوانی شتی تازەم لە ئێوەی کورد تا بتوانن ئەوە کارە بکەن بە ئیسلامی و عەلمانیەوە.

**یەکەم:-** کۆشش و خەبات لە پێناوی دەرکردنیان، واتا (جیهاد) بکەن تا دەریان دەکەن و هیچ کارێك نییە لە لای خوای گەورە و ئەم ئیسلامە ئەوەندەی خەبات و کۆشش گرنگ بێت هەروەکو پێغەمبەر ﷺ بۆمان باس دەکات دەفەرمووێت( في صحيح البخاري عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: جاء رجل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال، دُلَّني على عمل يعدل الجهاد.. قال: «لا أجده».. قال: «هل تستطيع إذا خرج المجاهد أن تدخل مسجدك فتقوم ولا تفتر، وتصوم ولا تفطر؟؟».. قال: ومن

یستطیع ذلك؟!!.. هذا هو المجاهد الحق، كأنه رجل صائم قائم بلا توقف واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ڕێنمایم بکە بۆ کارێك کە هاوتای جیهاد بێت. فەرمووی *لەلام نییە* فەرمووی: ئایا ئەتوانی کاتێ کە موجاهیدەکان دەردەچن (بۆ مەیدانی جەنگ) تۆ بڕۆیتە ناو مزگەوتێك و بەردەوام نوێژ بکەی بێ ئەوەی پشوو بدەی، وە بەڕۆژوویش بیت بە بێ ئەوەی نان بخویت؟ وتی: جا ئەمە کێ دەتوانێت؟!! فەرمووی ئا ئەوە موجاهیدێکە بە ڕاستی، هەروەك پیاوێکی ڕۆژووگر و نوێژ خوێن وایە کە هەرگیز ناوەستێ.

کەواتە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە جیهاد و خەبات زۆر گەورە و پیرۆزە لەم ئیسلامەدا، دەبێت موسڵمان لەوە تێبگات هیچ کارێکی تری لە بەر دەم دا نیە بێجگە لەخەبات نەبێت بۆ دەرکردنیان لە کوردستان و عێراق و وڵاتانی تری داگیر کراو.

ئەم وتەیە لە ڕووی هزرەوە خەڵکی وابەستەیە پێیەوە و لە ڕووی شەرعەوە داواکراوە لە هەمووان، هەرچەندە ئەم کارەی هەروا سادە و سانا نیە پێویستە پێشتر خۆتت بۆ ئامادە کردبێت، بەڵام ئەگەر گەل و هۆزێك پشت بە خەبات نەبەستێت ئەوا کۆیلە و سەر شۆڕ دەمێنێتەوە دەبێت دەرگا بکاتەوە بۆ خەبات شۆڕشگێڕی لە ناو نەوەکانیدا تا نیشتیمانمان لە دەستی ئەو چەپەڵانە ڕزگاری بێت، وەك پێشتر ئاماژەم پێکرد دەبێت هێز و تواناکان ڕێکبخرێن بۆ سەرکەوتن و دان بەخۆدا بگیرێت ئارامی بەسەر هەمووانەوە ببینرێت، وە دەبێت شۆرشگێر بژیت لە ناو خێزان و کۆمەڵگادا و لاو و پیرو ژن و منداڵ فێری خەبات و شۆڕشگێری بکرێن.

**دووەم :-** خۆپاراستن لە دنیا و ترسان لە مردن، واتا تۆ خاوەنی هەرچی بیت كۆتایی دێت هەر دەبێت بمریت، كەواتە دنیات لە بەر چاو خۆشەویست نەبێت كە هەموو ژیانت ببێتە مادە، واز لە بەها ڕۆحییەكان بێنیت، كەواتە ئەوە لە مێشكی خۆت دابنێ كە هەرچەندە ئازا و جوامێر بیت هیچ لەتەمەنت كەم ناكات، وەچەندە ترسنۆك و جەبان بیت هیچ لە ژیانت زیاد ناكات، تەنها ئەوەیە كە خوای گەورە بۆی نووسیویت، بەڵام ئەتوانیت هەڵبژێریت چۆن دەتەوێت بمریت ئایا دەتەوێت لە خاكی شۆرش و خەباتا بمریت یان لە سەرجێگا، وەك (لانەواز و خانەی پیریساڵمەندان)دا ژیان بەسەر بەریت لەوێدا بمریت، كەواتە ئەگەر خۆشەویستی لە دنیا لە دڵتا بوو لە مردن ترسایت ئەوا هیچ ئەرزشێكت نامێنێت دەبیت بەكەفی سەر دەریا وەك پێغەمبەرمان دەفەرمووێت (عنه رسول الله صلى الله عليه وسلم كما جاء في حديث ثوبان رضي الله عنه وأرضاه، الذي رواه أبو داود بسند صحيح.. قال فيه صلى الله عليه وسلم: «يوشك الأمم أن تداعى عليكم كما تداعى الأكلة إلى قصعتها».. فقال قائل: ومن قلة نحن يومئذ؟! قال: «بل أنتم يومئذ كثير، ولكنكم غثاء كغثاء السيل!! ولَيَنْزِعَنَّ الله من صدور عدوكم المهابةَ منكم، ولَيَقْذِفَنَّ الله في قلوبكم الوهن».. فقال قائل: يا رسول الله وما الوهن؟؟! قال: «حب الدنيا وكراهية الموت

تێگەیشتن لە ناوەرۆكی ئەم فەرموودەیەی ﷺ كە هەروەك لە(عون المبعود) داهاتوە لە شەرحی (سنن ابی داود) واتا هەركەسێك هەڵدەسێت لە بەشی ئەم ئومە ئیسلامیە دەخوات كاتێك كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وشەیەی دركاند هاوەڵێك پرسیاری كرد دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە لە كەمیانە ئەو زەمەنە دێت موسڵمانان ئەوەندە كەمن پێغەمبەری خوا

ﷺ فەرمووی نەخێر، بەڵکو ئێوە زۆرن(هەروەك ئێستا کە ملیارێك و سێ سەد ملیۆنن)، بەڵام هیچ ئەرزشێکتان نییە وەکو کەفی سەر دەریا وان بۆیە هەرکەس هەڵدەستێت بە ئارەزوی خۆی لەم ئومەتی ئیسلامیە دەخوات خۆ ئەگەر بایەك بێت بەرەو باشوورتان دەبات، وە بایەکی باکووری بەرەو باکوور ڕێگاتان پێ دەبڕێت وە هەروەها بەردەوام دەفەرمووێت ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ کە ئەو سەردەمە هاتە پێشەوە ئێوە هیچ بەهێزییێك و توانایەکتان نامێنێ وە گەورەیتان لە دڵی دوژمنانتاندا دادەماڵرێت، واتا بە ترسنۆکی تەماشا دەکرێن. هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیان ترسنۆکی مەبەستت چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: واتا هیچ کەرامەتێك و هیچ شەخسیەتێکتان نییە لەلای دوژمنانتان، زۆر بەلاوازی و سەرشۆڕی سەیر دەکرێن واتا لاوازی لە دڵ و دەروونتاندا دروست دەبێ ئەی موسڵمانان، وە پاشان دەستنیشانی نەخۆشییەکەمان بەتەواوەتی بۆ دەکات و دەفەرموێت هۆکارەکانی ئەوەیە کە ئێوە دنیاتان زۆر خۆش دەوێت و زۆر ڕقیشتان لە مردن دەبێتەوە (لە مردن دەترسن).

جا خوێنەری ئازیز هەرکاتێك دنیا شوێنی خۆی گرت لە ناو دڵماندا و ترسیشمان لە مردن بوو لە پێناوی خوای گەورەدا، دڵنیا بن لەوەی کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بە گشتی گاڵتەمان پێ دەکەن و یاری بە هەست و سۆزمان دەکەن، کەواتە ئاگاداری خۆمان بین لە هەوڵ و کۆشش و خەباتماندا بزانین چۆن کار دەکەین و ڕەچاوی ئەو خاڵانە بکەین کە پێشەوامان بۆی دیاری کردوین.

**سێیەم:-** جوڵاندنی هەموو کێشەکان، هاندانی خەڵکی لە سەری و تا خەڵکەکە وشیاربێتەوە لەپێش هەموویەوە باسکردنی پارچەپارچەی کوردستان کێشە ڕەواکەی و ناساندنی بە خەڵکی، باس لە سیناریۆی

لۆزان و شۆڕشەکانی کورد و باسی هەموو قارەمانەکانی کورد و چۆنیەتی دابەشکردنی وڵاتەکەمان و باسکردنی لە هەموو جێگایەکدا و باسی ستەم لێکردنمان لەلایەن زلهێزانی ناوچەکە و کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەنفال و کەرکوك..هتد، وەپاشان باسی زیندانیەکان لە زیندانەکانی ئەمریکا وەك ئەبوغرێب و زیندانەکانی تر و جوڵاندنی ڕای گشتی موسڵمان بەلای خۆمان و باسکردنی زیندانیانی گوانتانامۆ و داگیرکردنی فەلەستین و سۆماڵ...هتد، باسی ئەو مەلەفانەی کە داخراون زیندووکردنەوەیان، هاندانی خەڵکی بۆ سەرخستنی پێغەمبەرەکەیان وە کردنەوەی ڕۆژنامە و وێب سایت و ڕادیو و کەناڵی ئاسمان...هتد تا ئەمریکییەکان لە ناخدا بدۆڕێن، خۆیان هەست بەوە بکەن کە دۆڕاون و تا خەڵکی بە گشتی شار بەدەریان دەکەت.

**چوارەم:-** وتوێژ لەگەڵ ڕۆژئاوادا، چونکە ئەوروپا ڕازینییە بە داگیرکردنی عێراق، دروست کردنی کۆمەڵی کوردی ڕێکخراو بۆ هاندانی خەڵکی دژی ئەمەریکا و باسی ئەو کارە قیزەونانەی کە ئەمریکا کردونی ڕسوا کردنیان لە ناو خەڵکی ئەوروپادا و ناساندنی ئیسلامەکە بە ئەوروپا، چونکە خۆیان زۆر حەز بەم ئیسلامە دەکەن و باسی کێشەی کوردستان بکەن فەلەستین و ئەفغان و عێراق هەموو ئەو وڵاتانەی کە داگیری کردووە باسی زیندانیەکان و کوشتن و بڕینی شارەکان هەموو کێشەکان زۆر بە شەفافی بخرێتە بەر چاوی ئەوروپا، لە بازاردا لە کوچە و کۆڵانەکاندا لە قوتابخانەکاندا لەگەڵ هاوڕێکەتا لەگەڵ دراوسێکانتا باسی کێشەی موسڵمان و کوردستان بکە تا گەورە دەبێت.

**پێنجەم:-** باسکردنی ئەم ئیسلامە کە چەندە بەرز و باڵایە لە هەموو بەرزەکان بەرزترە، زۆر گرنگە ئیسلامەکە بە لاوان و پیرو جوان بناسێنیت، باسی ئیسلام بکەیت کە چەندە بەدوای ئاشتی دا وێڵە و باسی

شەرەنگێزی ئەمریکا بکەیت وەك خۆی و هەرگیزا و هەرگیز فێر نەبین ئەم ئیسلامە پۆلێن بکەین بەناوی ئیسلامی سیاسی و ئیسلامی سۆفی ئیسلامی سەلەفی و ئیسلامی تەکفیری، ئیسلام هەر یەك ئیسلامە کە خوای گەورە ناردوێتی بۆ پێغەمبەرە ئازیزەکەی خۆی و لە ڕۆژنامەکانیان لە کەناڵەکانیان بەزمانی هەموو وڵاتەکان باس بکرێت و بنووسرێت بەتایبەت لە وڵاتە ئیسلامیەکان خەڵکی ڕۆشنفکر بکرێنەوە بەم ئیسلامە و بە باشی لە بیروباوەڕکەت شارەزا بکرێن.

**شەشەم:**- کۆشش کردن بە سەروەت و سامان، پێش هەموو شتێك یارمەتی خەڵکی هەژارانی وڵاتی خۆت بدە بۆ سەرخستنی ئایین وڵاتەکەت درێخی مەکە و پاشان ئەوەی پێت دەکرێت بە سەروەت و سامانت یارمەتی ڕۆشنبیرانی ئەم ئیسلامەی پێبدە بۆ بانگەوازکردنی ئەم ئیسلامە، ئەگەر بە ڕۆژنامە بوو یان گۆڤار و هەرکارێکی ڕاگەیاندن بێت، چونکە ئەم ئیسلامە زۆر پێویستی بە کەناڵی میدیایی هەیە بۆ گەیاندنی.

**حەوتەم:**- خۆدابڕان لێیان { المقاطعة }، لە هەموو کەرەستەیەکی ئەمریکی و یەهودی، کارنەکردن لەگەڵیاندا و تەنانەت کارنەکردن لە ڕێکخراوە مرۆییەکانیشیان، وازهێنان لێیان بە تەواوەتی دووربکەویتەوە لێیان و یارمەتی نەیارانی ئەمریکا بدەیت بە هەموو شێوەیەك، تەنانەت بە کارنەهێنانی ناوی ئەمریکی وەك کارگە گەورەکانیان و بەکارنەهێنانی ناوەکانیان بۆ وڵاتی کوردستان هەرچەندە سلێمانی و هەولێر هەموو هەر ناوی ئەمریکییە، نازانم بۆ ناوی کەڵە شاعیران و سەرکردەکانمان لە بیرکراون.

**هەشتەم:**- چاککردنی نێوانی خۆمان و ڕێکخستنی ڕیزی موسڵمان، واتا بیر لەوە نەکەینەوە کە ئەمە سەر بە ئەو پارتە و ئەمیان سەر بەو ڕێکخراوە

هەموو بە یەك دەست و یەك دڵ كار بكەن، پێشەنگێك بۆ خۆیان دیاری بكەن تا ببێتە مەرجەع، بەیەك هەست كاربكرێت بۆ سەرخستنی ئیسلامەكە، هەروەها نیشتیمانەكەشمان تا بتوانین وڵاتێكی ئازاد و ئاسوودە دابمەزرێنین، دەمەوێت ئەوە بڵێم بە عەرەبەكان ڕابگەیەنن بەتایبەت «عەرەبە شۆڤێنییەكان دەترسان لە وەی كە كورد وڵاتی خۆی بگرتەوە دەست، لەوە دەترسان كە عێراق كوێتی داگیركرد، كە خاكی كوێت هەژدە هەزار كیلۆمەتر چوارگۆشەیە دوو ملیۆن كەسی تێدا دەژی، كەچی ئەمریكا هات خاكی عێراقی داگیركرد چوارسەدوسی و هەشت هەزار(٤٣٨) كیلۆمەتر چوارگۆشەیە، دانیشتوانەكەی نزیكەی (٢٤) ملیۆن كەس دەبێت، بێ دەنگن لە ئاستیا بەڵام بەلاتانەوە نەنگییە كە كورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی بێت، كە هەمیشە خزمەتكاری ئایینی ئیسلامە پیاوانی وەك سەڵاحەدیین و ئیبن تەیمییە و هتد تێدا دروست بوو، كە كوردستان پارچە پاڕچە كرا وڵاتانی ئێوەش بوون بە دەیان پارچە دڵتان خۆش نەبێت، كەواتە دەبێت تێیان بگەیەنن كە ئیمە هەبین ئێوەش هەن كە دەربەدەرمان كەن ئێوەش هەر زەلیل دەبن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما، فإن بغت إحداهما على الأخرى فقاتلوا التي تبغي حتى تفيء إلى أمر الله ﴿٩﴾ الحجرات

واتە: ئەگەر دوو دەستە، یان دوو تاقم لە موسوڵمانان بوو بە شەڕیان، ئەوە دەستبەجێ هەوڵی بدەن ڕێكیان بخەن و ئاشتیان بكەنەوە، خۆ ئەگەر لایەكیان هەر دەستدرێژی دەكردە سەر لاكەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن كە ستەم و دەستدرێژی دەكات، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا، هیوا خوازم لەمەوە تێبگەن (إن هذه أمتكم أمة واحدة وأنا ربكم فاعبدون)

**نۆیەم:-** نزاو پاڕانەوە، ئەمە زۆر گرنگە، هەمیشە دەست بەدوعا بین وەك سواڵکەر بە گەردن کەچی بۆ خوا، بۆ ئەوەی ئەگەر کارێکمان کرد پێی لووتبەرز نەبین، هەمیشە داوای یارمەتی لە خوا بکەین نەك لە سەرانی زاڵمانی سەر زەوی و کردەوەمان بۆ خوابێت دڵنیا بن خوای گەورە داواکانمان بە جێ دێنێت.

**دەیەم:-** ڕواندنەوەی هیوا لە دڵەکاندا نەهێشتنی بێزاری لە دڵی میللەتەکەماندا کە دەبێت بزانین موسڵمان هەر سەردەکەوێت، بەڵام درەنگ و زووی کەوتووە، کەواتە کێ ئازایە لە سەردەمی خۆیدا مەدالیای سەربەرزی و شەرەف بە دەست بێنێت خۆی ببێتە خاوەنی کێشەکە تا لە قیامەتدا سەربەرز بێ پێی و هەمیشە بەرچاو کراوە بێت بۆ سەرکەوتن بزانێت کە موسڵمان هەر سەرکەوتووە بە مردوویی یان بە زیندوویی، ئەگەر مرد ئەوە براوەیە بە بەهەشت خۆ ئەگەر نا ئەوا سەربەرزە بە ئازایەتی خۆی و موسڵمانان.

**خۆێندنەوەیەکی کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژی) بۆ ڕەوشی ئایینی لەو وڵاتەدا**

ئەمریکا یەکێکە لە وڵاتە زەبەلاحەکان لە ڕووی سەربازی و ئابووریی و تەکنەلۆژیاوە، دەتوانین بڵێین ئێستا هاوشێوەی نیە لەسەر زەویدا و توانیویەتی هەژموون (هەیمەنەت) و دەسەڵاتی خۆی بەسەر زۆربەی زۆری جیهاندا بسەپێنێت.

هۆکاری ئەم گەشەسەندنەی ئەمەریکا ئەگەڕێتەوە بۆ پابەند بوونیان بە ئایینەوە، کۆمەڵگای ئەمەریکی کۆمەڵگایەکی دینداری مەسیحی ڕاستڕەوی توندڕەوە، هەر جۆرە پارت و ڕێکخراوێك دابمەزرێت دەبێت بنەما و پایەکانی لەسەر ئایینی مەسیحی وە بەتایبەت مەزهەبی پرۆتستانت بێت.

لە (٧٠٪)ی دانیشتوانی ئەو وڵاتە لەسەر مەزهەبی پرۆتستانتن و لە (٣٠٪)ی لەسەر مەزهەبی کاتۆلیکن، لەمێژووی ئەو وڵاتەدا یەکجار سەرۆك کۆمارەکەی کاتۆلیك بووە، ئەویش لە ڕووداوێکی نادیاردا کوژرا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کۆمەڵگایە کە مەسیحی توندڕەون پەیوەندییەکی زۆر باشیان لەگەڵ جولەکەکانی جیهاندا هەیە بەتایبەتی لەگەڵ زایۆنیستەکاندا. لە مێژووی دروستبوونی پرۆتستانتەوە نێوانی جولەکە و مەسیحی ئاشتەواییەکی تێکەوتووە، بەڵام بەدرێژایی مێژوو ئەم ڕەوشە وا نابینرێت.

ئەم بابەتە هەوڵ دەدات لێوردبوونەوەیەك لەهەمانکاتدا شیکارییەك لەسەر بارودۆخی دروستبوونی ئایین لەناو ئەو کۆمەڵگایەداو ئەو پەیوەندییە تەماویەی کە جولەکە و مەسیحییەکانی ئەمەریکای بەیەکەوە بەستۆتەوە. هەوڵ ئەدەم بەشێویەکی تەندروستانە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەستەبەر بکەین و زەمینەی ئەمەریکا بە ئێوەی خوێنەر بناسێنم، تا بتوانین لەکاتی مامەڵەکردن لەڕووی سیاسی و هەروەها کاتێك هەڵبژاردنی ئەو وڵاتە دەستپێدەکات زوو بتوانین خوێندنەوەمان بۆ ڕەوشەکە هەبێت، تەندروستانە و بە تایبەتیش ئیسلامیانە هەموو ڕەهەندەکان و جەمسەرە جیاوازەکانی ئەو وڵاتە بخوێنینەوە.

لە نێوان ئەو دوو ئایینەدا مەسیحی و یەهودی زۆرێك لە دەرئەنجامەکانی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، بەڵام مێژوو ئەم ڕاستییە ئاشکرا دەکات، لە مێژووی یەهودیەکاندا کاتێك لە دەسەڵات و توانایاندا هەبووە مەسیحییەکانیان چەوساندۆتەوە، بە پێچەوانەوە مەسیحییەکانیش «مەحاکمی تەفتیشیان» بۆ دروست کردوون بە ناوی (هەرتەقەوە).

هۆکاری ئەم ناکۆکیەی نێوان هەردوو ئایینەکە تەنها جیاوازی بیروباوەڕیان نییە، بەڵکو پێیان وایە کە عیسای مەسیح بە دەستی یەهودییەکان لە خاچ دراوە، کەواتە کێشەکە خوێنە..!

بەڵام ئێمەی موسڵمان بڕوامان وایە کە لە خاچ نەدراوە، بەڵکو ئەوەی لە خاچ دراوە کەسێکی تر بووە لەسەر شێوەی پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریم -سەلامی خوای لێبێت- خوای گەورە لە قورئاندا ئەو بەسەرهاتەمان بۆ باس دەکات دەفەرمووێت: وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ ﴿١٥٧﴾النساء.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەم ڕقو بوخزەیان لە دڵ گرتوە بەرانبەر بە جولەکە لە کتێبی خۆیاندا یەهود بە گەلێکی مەلعون ناودەبات و کارەساتی لە خاچدانی مەسیح دەخەنە سەر ئەوان، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا – ڕەزامەندی خوای لەسەربێت- کە چوونە ناو قودس مەرجی مەسیحیەکان ئەوە بوو کە دەبێت یەهود لەو شارەدا نەمێنن!.

مێژووی هەردووکیان دیارە و ناسراوە کە چەندە دوژمنی یەکتری بوون، خوای پەروەردگارمان لە قورئاندا زیاتر ڕوویماڵی هەردوو خەڵکی ناو ئایینەکەمان بۆ دەکات ئەوانمان پێ دەناسێنێت دەفەرمووێت: وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَى شَيْءٍ وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ﴿١١٣﴾ البقرة

واتا: جولەکە دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ بنەما و ڕاستییەك نین، گاورەکانیش دەڵێن جوولەکە لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەك نین..

بەڵام لەدوای گۆڕانکاری ناو ئایینی مەسیحی لە ڕێگای جولەکەوە ئەم هاوکێشەیە گۆڕانکاری بەسەردا هات، ئێستا دەبینی کە مەسیحییەکان چۆن لە هەوڵی ئەوەدان کە دەوڵەتی زایۆنیستی جولەکە لە خاکی

فەڵەستین دابمەزرێنن، بەڵکو جەختیشی لەسەر دەکەنەوە، کێشەکەشیان بە کێشەیەکی ڕەوا دەناسێنن..!

دەپرسین نهێنی ئەم نێوانە چییە و کێ ئەم مەتەڵەمان بۆ ئاشکرا دەکات و جەمسەرەکانی لێك ئەداتەوە؟

بێگومان.. مێژوو.

کەواتە تەنها کلیلی دەرگای مێژوو کە ئێستا لە بەردەستماندایە دەتوانین ئەو دەرگا داخراوانەی لە ڕووماندا پێبکەینەوە.. دەبێت سەرلەنوێ خوێندنەوەیەکی واقیعی بۆ ڕووداوەکان و پاشان ڕاڤەکردنیان سەرلەنوێ و تابتوانین ڕووداوەکانی ئێستای پێبناسین.

**مێژووی چەوسانەوەی جوولەکە لە ئەوروپادا، بوون بە مەسیحییان بە دووڕوویی (مونافیقانە) :**

جوولەکە بە درێژایی مێژووی خۆی لە ئەوروپادا لەژێر ئەشکەنجە و ئازاری مەسیحییەکاندا بووە؛ دەوڵەتی ڕۆمانی بتپەرستی - شاری قودسی خستە ژێر فەرمانڕەوای خۆی لە ساڵی (٧٠)ی زایینی، کەواتە سەربڕین و لەناوبردنی جوولەکەکان لە شاری قودسدا، بە سەرکردایەتی سەرکردەی ڕۆمانی ناسراو (تیتوس)، لە ساڵی (١٣٢) ی زاینی، هەمان کارەسات بە خراپتر لە سەریان دووبارەبوویەوە بە سەرکردایەتی سەرکردەی ڕۆمانی (ئیلیاهەدریان).. پاشان لەدوای ئەوەی دەوڵەتی ڕۆمانی کە بووە گاور؛ قەیسەری قوستەنتینیە لە ساڵی(٣٢٤)ی زاینی، بووە مەسیحی بە ئاشکرا و دەوڵەتەکەی بە ئاشکرا کردە گاور، ئیتر هەموو ئەوروپا بوونە مەسیحی و ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە ڕوویدا، دیسان سەر لە نوێ ستەم(ئیستبداد)

و کارەساتی گەورە یەك لەدوای یەك بۆ جوولەکە دەستی پێکردەوە، بەبێ ڕەچاوی بچوك و گەورە هەموویان سەر دەبڕان، چونکە لە ئایینی مەسیحدا ئەوان بە مەلعون ناسێنرابوون، بە بکوژی مەسیحیان دەزانن - سەلامی خوای لێبێت، ئەم ڕەوشە بەردەوام بوو هەندێك جار کارەساتەکان لەسەریان زۆرتر دەبوو ماوەی وا هەبوو لەسەریان کەمتر دەبووەوە، بەڵام مەسیحییەکان هەمیشە جوولەکەیان بە کافر زانیوەو خۆشیان لێنەهاتووە.

ئەوەی کە جێگای ئاماژە پێکردنە لێرەدا ئەوەیە گۆڕانکارییەکی زۆر گەورە ڕووئەدات لە ساڵی (١٢٩٠)ی زاینی، لە ڕێگای ئیمپراتۆر و پاشای بەریتانی بەناوی (ئیدواردی یەکەم) کە ئازاری جولەکەکان دەست پێدەکاتەوە، فەرمانی فەرمی دەردەکات کە نابێت هیچ جوولەکەیەك لە خاکی بەریتانیادا بمێنێت، هەموو جولەکەکان دەردەکات ئەوەیشی ناڕوات دەیکوژێت، زۆریك لە جوولەکە ڕویان کردە فرەنسا..

لە ساڵی (١٣٠٦)ی زایینی، بە شانزە ساڵ لەدوای ئەو کارەساتەی کە پاشای بەریتانیا بەسەر جوولەکەی دەهێنێت، ئینجا پاشای فەرەنسا بە ناوی (فلیپ).. سێ هەڵبژاردە دەخاتە بەردەم یەهودییەکان:

**یەکەم:** بە مەسیحبوونیان.

**دووەم:** ڕۆیشتن لە خاکی فەرەنسا و هەموو ئەوروپادا بە گشتی.

**سێیەم:** کوشتنیان لە ماوەیەکی کەمدا.

جولەکە بوون بە دوو بەشەوە؛ لەم بار و ڕەوشەدا کۆمەڵێکیان چوونە ناو خاکی ئەندەلوس و ڕێزیان لێگیراو بە زانا و حاخامەکانیان پلە و پایەی دینداری خۆیان پێبەخشرایەوە؛ هەندێکی تریان چوونە ناو دەوڵەتی عوسمانی، چونکە لای موسڵمانان ئازادی ئایینی و بیروباوەڕ

هەبووە، ئیسلام مافی هەموو ئایینەکانی داوە - لە قورئاندا بە یاسا دەستنیشانی کردووە تەنانەت کەمینەکانی تریش بیروباوەڕی خۆیان ممارەسە کردووە، لێرەدا بۆیە من پێم وایە هەمیشە ئیسلام لە دیموکراسی و لیبراڵ و هەموو ئەو بیرانەی کە ئێستا هەندێك لە ئیسلامییەکان زۆر بێشەرمانە بانگەشەی بۆ دەکەن باشترە، لە کاتێکدا ئیسلام لەوان بەهێزترە لە ڕووی تیۆری و مەیدانیشەوە.

بەشی دووەمی جوولەکەکان بوونە مەسیحی بە دووڕوویی؛ بەڵام لە ناخدا هەر جوولەکە بوون، ئەمەش لە ڕێگای حاخامێکی فەرەنسی ئەم ڕێگا چارەیە بۆ دۆزینەوە کە بەنهێنی ببنە مەسیحی و داوایشی لێکردن کە بچنە ناو کڵێساکانیان و زۆربەی دەسەڵاتی ناو کڵێسا بۆ خۆیان بە دەست بهێنن، بە درێژایی مێژووی چەند سەد ساڵ بوونە ئوممەتی گاور لە ناو کڵێسا و پۆستە حکومییەکانی ئەو سەردەمدا جێگە پێی خۆیان قایم کرد، لە ئەوروپا بە گشتی و فەرەنسا بە تایبەتی!

لەدوای ئەو چەند ساڵە یەهودی مەسیحیبووەکان پلانێکیان گێڕا، کە توانیان پارسەنگی ئەوروپا ژێر و ژوور بکەن لە بەرژەوەندی خۆیان بیگوزەرێنن، بە ناوی ڕیفۆرمی ئایین و هاتنی مەزهەبێکی نوێ.

## جوولەکە و مەزهەبێکی نوێ لە ناو مەسیحییەکاندا (پرۆتستانت).

یەهودییەکان لە سەدەی شانزدەهەمدا ستراتیژیەتێکی زۆر گەورەیان گرتەبەر، کە هەنگاوێکی زۆر ئازایانە بوو، کە گەورەترین و ترسناکترین (خەتەر) بوو بۆ شانۆی ئەوروپا و بگرە هەموو جیهانیش، ئەویش تەحریف و دەستکاریکردنی ئایینی مەسیحی بەتەواوەتی، لە بەرژەوەندی جوولەکە بوو کە خزمەت بە پرۆژەی جوولەکە بکات، بە ناوی گاورە

نوێکان، ئەمیش لە دروستکردنی مەزهەبێکی نویٚ بە ناوی پرۆتستانت خۆی نواند و بەو واجیهەیە لە زەمینەکەدا خۆی ناساند.

یەکێك لە قەشە ئەڵمانییەکان بەناوی «مارتن لۆسەر» بە پاڵپشتی جوولەکە و کاریگەریی بیر و هزری ئەوان توانی شۆڕشێك بەرپا بکات دژی کڵێسای کاتۆلیکی؛ دەسەڵاتی تەواوی هەبوو بەسەر هەموو ئەووروپادا، گەورەترین دروشمی شۆڕشەکە بەناوی چاکسازی بوو.. لە پرۆتستانت وەرگیراوە لە مانا و چەمکی چاکسازی (ئیسڵاح)، چونکە ئەو کۆمەڵە دەیانویست بزووتنەوەیەکی گۆڕانکاری دروستبکەن لە ناو ئەو ئایینە کە لەسەربنەمای کاتۆلیکی دامەزراوە، ئەو قەشە یەهودییانەی کە پێشتر بە نهێنی ببوون بە مەسیحی بەڵام لە ناخدا هەر جوولەکە بوون، پاشان هەموو پشتگیری بەرنامە و ڕیفۆرمەکەی مارتن لۆسەریان کرد.

مارتن لۆسەر- لە کتێبێکی مەنەفێست کراوە بە ناوی (مەسیح بە یەهودی لە دایکبووە) لە کاتێکدا مارتن لۆسەر هیچ پەیوەندی بە جوولەکەوە نییە، بەڵام ئەمە مەبەستی جوولەکە بوو کە خەڵکی هیچ سەرنجێك و هەستێکی گوماناوی دروست نەبێت لە لایەن شۆڕشەکەوە، چونکە بە سروشتی ئەوروپا خۆشیان لە جوولەکە نەدەهات و بە مەلعون تەماشا دەکران، بەڵام مارتن لۆسەر هەموو وتە و کارەکانی خۆشەویستی پەخش دەکرد بۆ جوولەکە و هانی خەڵکی ئەدات کە ڕێز لە جولەکە بگرن!

یەکێك لەو گۆڕانکارییانە کە لە ناو ئایینی مەسیحیدا کرد.. ئەوە بوو چەمك و مانای (روح و لقودوس)ی بە تەواوەتی گۆڕی، لە بنەرەتدا هەموو بیروباوەڕی مەسیحی کاتۆلیکی لەسەر ئەم باوەڕە دامەزراوە کە عیسا دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو وایکرد کە مەبەست بە گەڕانەوەی پیرۆزی

«سفری تەکوینی تەوراتە»، وا نیشانی دا کە ئینجیل دەستکاری کراوە هەموو دەستنووسی خەڵکییە پێویستە هیچ کارێکی پێنەکرێت، بەڵکو دەبێت لەگەڵ ئینجیلی کۆن واتا تەورات شەریعەتی لێوە وەربگیرێت، هەموو هەوڵێك بخرێتە گەڕ بۆ دامەزارندنی دەوڵەتێکی جوولەکە لە خاکێکدا، بۆ ئەوەی عیسای کوڕی مەریەم بێتەوە خوارەوە.

ئیتر بۆ یەکەم جار لێرەوە ناوی دروستبوونی وڵات هاتە ناو ئەدەبیاتی جوولەکە و مەسیحییەکانەوە، لێرەوە ڕێزی جولەکە بۆ ئەوە نییە کە خەڵکێکی خۆشەویستن، نەخێر- بەڵکو بۆ ئەوەیە پرۆتستانت بیروباوەڕی وا دامەزراندوە هەتا دەوڵەتی جوولەکە دانەمەزرێنن.. ئەوا عیسای کوڕی مەریم نایەتەوە خوارەوە لە ئاسمان، ئەم بیروباوەڕە لە ڕێگای جوولەکە بە مەسیحی کراوەکان هاتەوە ناو ئەم ئایینە نوێیەی مارتن لۆسەر و پێیوایە کە جوولەکە کوڕانی خوان! مارتن لۆسەر دەڵێت: ئێمەی گاور وەك چۆن سەگ لە قاپی خاوەنەکە دەخوات دەبێت لە بەرانبەر جولەکەدا هەست بەوە بکەن کە ئەوان سەروەر و گەورەی ئێمەن.!

بەم وتە و وشانەی کاریگەرییی زۆری لەماوەی چەند سەدەیەکدا لەسەر خەڵکی ئەوروپا بەجێهێشت، بەڵکو هەتاکو ئەم سەردەمەی ئێستایشمان هەر کاریگەرییی ماوە و بەردەوامە.

**حاخامە جوولەکەکانی ناو گاورەکان و هزری یەهودی»**

لەدوای ئەوەی کە مارتن لۆسەر پیرۆزی دا بە ئایینی جولەکە و پلە و پایەیانی بەرز کردەوە لە هەموو ئەوروپادا، پاشان دوو هزری گەورەی بڵاو کردەوە لە ناو ئەوروپادا وەك سیاسەت و ستراتیژیش کەوتنە کارکردن لەسەری، ئەم ستراتیژییە تایبەتە تەنها بە پرۆتستانت.

بیر و هزری یەکەم: بریتییە لەوەی کە ئینجیل هیچ کاری پێناکرێت و شەریعەتی لێوەرناگیرێت لەبەر ئەوەی مرۆڤ نووسیویەتیەوە، مرۆڤەکانیش دیارن کە بریتین لە چەند پیاوێکی دینداری ناو مەسیحییەکان (لوقا، یوحەنا، مارکۆس) مرقس)متا)، پاشان ئەوەیشی کردە بیانووی تەواوەتی کە ئەم ئایینە دەستکاری کراوە، دەبێت تەنها تەورات بە کاربهێنین کە وا ناویان بە ئنجیلی کۆن واتا تەورات، لە ڕاستیدا تەوراتیش بە هەمان شێوە دەستکاری کراوە، چونکە جوولەکەکان خۆیان تەورات وەك سەرچاوەی تەشریع بەکار ناهێننەوە، بەڵکو پێیان وایە کە (تیلموت) کتێبی دووهەمیانە سەرچاوەی سەرەکیانە، بەم بیرەیش وایکرد کە توانی گاوری نوێ دروست بکات، بەرنامەیان لەسەر تەورات بۆ دابمەزرێنێت کە ئایینی جوولەکەیە.

دووهەمیش لەسەرەوە هەر ئاماژەیەکی کورتم پێداوە، بریتییە لە دامەزارندنی دەوڵەتی یەهود، پرۆتستانت بڕوای وا دامەزراندوە کە هاوکاری جوولەکە بکەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لە خاکێکدا بۆ ئەوەی بە زووترین کات مەسیح بگەرێتەوە سەر زەوای، مەسیحیش یەهود لە ناو دەبات، ئیتر بۆ دوا جار هەموو جیهان دەکەوێتە ژێر ڕکێفی خۆیان، ئەمە بیروباوەڕیانە ناتوانن لێی لابدەن، هەرکەسیش بە گوێرەی ئەم بیروباوەڕەی نەڕۆشت و ڕەخنەی گرت ئەوا ڕەخنەی لە خوا گرتوە، یاخود ئەوا دژی (ڕەب)ە، واتا پەروەردگار.!

**رەتکردنەوەی کاتۆلیکەکان و بەرەنگار بوونەوەیان لە دابەشکردنی ئەوروپا»**

کەنیسەی کاتۆلیك بە هەموو شێوەیەك ڕەتی ئەم بیروباوەڕەی کردووە، ئەم بیرو بۆچوونەی مارتن لۆسەر بەتەواوەتی دژی کڵێسا و پاپا بوو، بووە هۆکاری ئەوەی کە شەڕ ڕاستەوخۆ کەوتە نێوان مارتن لۆسەرو پاپا، ئەودەمە ئەوروپا دابەش بوون بە دووبەش، یاخود بەدوو هۆزی مەزهەبگەرایی لە ناو مەسیحیەتدا؛ هۆزی یەکەم هەواداری پاپا بوون.. ئەودەمە پاپا لە فەرەنسا دادەنیشت، فەرەنسا سەرپەرشتی ئەم مەزهەبی کاتۆلیکانەی دەکرد، زۆرترین خەڵك بوون لە ئەوروپادا خاوەنی دەسەڵاتی تەواوەتیش بوون لە ڕووی سەربازی و ئابورییەوە، وڵاتانی ئیسپان و ئیتاڵیا هەموویان لەگەڵ کاتۆلیکەکان بوون، هۆزی دووەم پێچەوانەکەی پاپا بوون دژی وەستانەوە لە دوو ڕووەوە.. لە ڕووی سەربازی و سیاسی، دوو دەوڵەتی گەورەی دونیا پشتگیری مارتن لۆسەریان کرد ئەڵمانیا و بەریتانیا بەتەواوەتی چوونە ناو بیرو باوەڕی لۆسەرەوە، لەساڵی (١٥٣٨) ی زاینی هەرهەموو ئیمپراتۆری ئینگلتەرا ڕایگەیاند کە ئیتر هەموویان سەر بە مەزهەبی پرۆتستانتن و هیچ پەیوەندیان بە کاتۆلیکەوە نەماوە و خۆیان جیاکردەوە، بەڵکو ئینگلتەرە ئەو دەرگا داخراوەی کردەوە بە ڕووی هەموو جوولەکەی دونیادا کە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو وڵاتە کە لەسەردەمی «ئیدواردی یەکەم» هەموویان دەرکردبوو لە ساڵی (١٢٩٠) ی زاینی، ئیتر لەودەمەوە ئینگلیز بوون بە پشتیوانی جوولەکە لە دونیادا، خۆشیان بوونە هێزێکی گەورەی پرۆتستانی.

## ئاشكرابوونی پیلانی جوولەكە

دوای ئەوەی مارتن لۆسەر هەستی كرد بەوەی كە ئەمە پلانێكی زۆر شەڕانی جوولەكە بوو؛ هەرچی مەدح و پشتیوانی جوولەكەی كرد بوو پەشیمان بوویەوە، لە ساڵی (١٥٤٤)ی زاینی، كتێبێكی نووسی بە ناوی (ئەوەی كە پەیوەستە بە درۆكانی جوولەكەوە)، بەڵام هیچ ئەرزشێكی نەبوو، چونكە بە تەواوەتی لە ناو شار و جێگاكانی ئەوروپادا ئەم بیرە بڵاو بووبوەوە، ئیتر لە سەر ئەم مەزهەبە چەندەها كتێب و خەڵكی خاوەن بیرو هۆش و پاشان چەندین فەیلەسوف و زانا ئەم ئایینە تازەیان وەرگرت و بوونە مەزهەبی پرۆتستانتی، چونكە ڕێگای زانست و كردنەوەی ڕەخنە بۆ ئەوان كرایەوە هەموو بە ئاسانی وەریانگرت و قسەكانی مارتن لۆسەر هیچ ئەرزشی نەما، تەنانەت خەڵكانێكی دانشمەند هاتن بە تەواوەتی پەرەیاندا بەم مەزهەبە، لەوانەو ناسراوترینیان( ئیسحاق نیوتن) زانایەكی بەناوبانگی ئینگلیز بوو لە ساڵی (١٦٤٢-١٧٢٧)ی زایینی ژیاوە، پاشان چەند كتێبێكی نوێی دانا كە پەیڕەوانی پرۆتستانتی زۆر بە پیرۆز تەماشای دەكەن، نمونەی وەك تێبینی لەسەر پێشینییەكانی (تەنەبوئاتی) دانیاڵ و دید و بۆچوونی قەشە یوحەنا و گەڕانەوەی جوولەكە بۆ خاك و نیشتیمانیان، هەروەها فەیلەسوفی بەناوباگی ئەڵمانی (كانت) دەڵێت: (جوولەكە فەڵەستینین لە ناوماندا دەژین هەر دەبێت بگەڕێنەوە بۆ وڵاتیان)

لێرەدا پێویستە شیكارییەكی تر بكەمەوە بۆ خوێنەر..

پێدەچێت خەڵكانێك بپرسن، لە كاتێكدا كڵێسا لەوپەڕی دەسەڵات و توانای خۆیدا بووە، چۆن ئەم هەیمەنەتە (هەژموون) لەدەست دەدات؟

تەنها بە قسەی قەشەیەك كاریگەرییەكی ئەوتۆ دروست دەبێت؟

یاخود ئەم شۆڕشی ڕیفۆرمخوازە پێشتر زەمینەی بۆ سازێنراوە؟

لە وەڵامدا بۆ ئەوەی زەمینەکە بناسێنم ئەوە دەخەمەوە بیری خوێنەر لەسەردەمی ئەکلیریۆس دا پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوبوویەوە، کە ساڵی (١٠٠٠) ی زایینی، دونیا کۆتایی دێت ئیتر قیامەتە کەس لەسەر زەوی نامێنێت!

خەڵکی چاوەڕێ بوو، بوو بەساڵی (١٠٠٣)، سێ ساڵ خەڵکی چاوەڕێی کرد هیچ ڕووی نەدا، کڵێسا زۆر ئیحراج بوو؛ دوایی وتیان ئەو بەرواره هەڵە بووە؛ دەبێت تەمەنی مەسیحیشی بخەینە سەر واتا ساڵی (١٠٣٣) زاینی سی وسێ ساڵی تر چاوەڕێ بکەین، پارەیەکی زۆریان لە خەڵك وەرگرت بەناوی ئەوەی ئیتر دونیا کۆتایی دێت، خەڵك زۆر بێزار بوو لەدەسەڵاتی ئەکلیرۆسەکان، ئینجا دوایی ئەوە بوو بەو ساڵە هیچ ڕووی نەدا، لەدوای مردنی( گریگۆری) ئەو قەشەیەی ئەم قسەی کردبوو کە گوایە قیامەت دێت.

« پاپای گەورەی دەوڵەتی بێزەنتی شەرقی بەدەستی موسڵمانان گیراو بە ناوی «ئۆرمانۆس- ی چوارەم» دیل کرابوو واتا بە دەستی دەوڵەتی سەلجوقییەکان لە جەنگی «مەلازگرد» ئینجا بە تەواوەتی هەیبەتی کڵێسا ڕووخا، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی کڵێسا بگەڕێتەوە پاپا گەورەی ئەو سەردەمە لە ڕۆما بە ناوی « ئۆربانی دووەم» خەڵکی کۆکردەوە، وتی ئەم مێژوو و بەروارەی کە بۆ مەسیح دانراوە هەڵەیە بەڵکو (٢٠٠) ساڵی ماوە، لەگەڵ ئەویشدا توانی جەنگی خاچ دروشمان بەرپا بکات، ئەو ماوەیە ئەم وتانە بەردەوام بوو لە مێشکی خەڵکیدا تا هەیبەت و دەسەڵاتی کڵێسا لەبەردەم خەڵکیدا نەما و بەتایبەت کڵێسا زۆر دژایەتی زانا و فەیلەوسوفەکانی دەکرد بۆیە ڕێگا خۆش بوو بۆ ئەم ڕیفۆرمە نوێیەی کە مارتن لۆسەر دەستی پێکرد و سەرکردایەتی کرد.

**دۆزینەوەی ئەمریكا و شۆڕشی فرەنسا :**

ئەم ڕووداوانەی كە باسمانكرد هاوكاتە لەگەڵ دۆزینەوەی خاكی ئەمریكادا، هەوەك چۆن پێشتر یەهودییەكانیان ئازارئەدا لە ئەوروپادا بە دەستی كاتۆلیكەكان؛ ئەمجارە پرۆتستانت هاوشێوەی ئەو ئەشكەنجانە بوویەوە لە ئەوروپادا، كە پێشتر جوولەكە دەیان چەشت بە دەست مەسیحییەكانەوە، ئەم خاوەن فیكرە پرۆتستانتیە یەهودییە هەموو ڕوویان كردە خاكێكی نوێ بەناوی (ئەمریكا) لە ماوەیەكی زۆر كورتدا زۆرینەی خەڵكی ئەمریكا بوونە پرۆتستانت، تەنانەت لە مەسیحیە ئیسپانیەكان زۆر زیاتر بوون كە كاتۆلیك بوون پێش ئەوان چووبوونە ناو خاكی ئەمریكا.

لەم سەروبەندەدا ڕووداوێكی زۆر گەورەتر ڕوویدا لە بەرژەوەندی مەزهەبی پرۆتستانتی، ئەویش هەڵگیرسانی شۆڕشی فرەنسا لەساڵی(١٧٨٩)ی زایینی، ئەم شۆڕشە دژی هەموو باوەكان و قسەكانی كڵێسا بوو لە فرەنسادا، نەك دژی دەوڵەتی پاشایەتی بوون بەڵكو هەر دینیان پەراوێز كرد، زانایانی دژی دین توانیان بە تەواوەتی بە سەر كلێسادا سەربكەون، دژایەتی بیرو هزری كاتۆلیكی بكەن، چونكە بەدرێژایی مێژوو ئەوروپا لە كارەساتدا بوو بەدەست ئەو ئایینەوە، لەدوای ئەوەی كە مەسیحیەت هیچ ئەرزشی نەما، ئەوروپا لە ڕووی ئەخلاقیەوە بە تەواوەتی داڕما، ناچار سەرلە نوێ سۆسیۆلۆژەكان بۆ پارسەنگ ڕاگرتنی هێزو زانست پێویستیان بە ڕەوشتە، سەرلە نوێ ئایینیان زیندوو كردەوە بەوشێوەی كە خۆیان دەیانەوێت دین لە دەوڵەت جیا بكرێتەوە، بەڵام مەزهەبی پرۆتستانتی سەرلەنوێ زیندوو كرایەوە لە هەموو ئەوروپادا، بێجگە «ڕۆما» هەموو لاكانیش دەزانن كە ئەم شۆڕشە شۆڕشێكی عەلمانی بەحت بوو بۆ لە ناوبردنی دین، بەڵام ئەوروپا زوو هەستی بەوەكرد كە

مرۆڤ بوونەوەریکی دیندارە بە سروشتی ناتوانیت لە ئایین جیابێتەوە وەك مارکس دەڵێت: ئایین تریاکی گەلانە.

لە ساڵی (١٧٩٩)ی زاینی، ناپلیۆن پۆناپارت، لەسەر بنەمای مەزهەبی پرۆتستانتی هێرشی هێنایە سەر فەڵەستین، بانگەوازی هەموو جوولەکەکانی دونیای کرد کە بگەڕێنەوە بۆ خاکی خۆیان لە فەڵەستین بۆ ئەوەی دەوڵەتیان بۆ دابمەزرینێت، هەرچەندە تەمەنی ئیمپراتۆرییەتەکەی تەنها چەند ساڵێکی کورتی خایاند، لەوێدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و دەوڵەتی عوسمانی بە هاوکاری ئینگلتەرا و ڕووسیا توانیان ناپلیۆن بشکێنن و لە خاکی فەڵەستین بیکەنە دەرەوە، ئیتر بە تەواوەتی دەرکەوت کە ئەم بیرە دەبێت هەموو وڵاتانێك بیچەسپێنن کە درووستکردنی دەوڵەتێکە بۆ یەهود، لەگەڵ ئەوەیشدا کە فەرەنسا لە ڕوودا کاتۆلیکە، بەڵام پێدەچێت کاریگەریی پرۆتستانتیان لەسەربێت، مەبەستم ئەو بەشەیە کە بە کاتۆلیکی ماونەتەوە، ئەگینا زۆربەی زۆری وڵاتانی ئەوروپا ئێستا هەر باوەڕیان بە ئایین نەماوە.

بەم شێوەیە بانگەوازی دەوڵەتی جوولەکە لە هەموو جێگاکانی دونیاوە دەستی پێکرد، لەسەر بنەمای بیروباوەڕی پرۆتستانتی، کە دەبێت خاکێك بۆ جوولەکە دابینبکرێت، لێرەدا شتێك هەیە دەمەوێت ئاماژەی پێبکەم... ئەویش ئەوەیە.. کە جوولەکە بۆ خۆی داوای فەڵەستینی نەکردووە، بۆ یەکەم جار ویستی لە (ئۆغەندا) وڵات دابمەزرێنێت، بە هۆکاری ئەوەی کە ئۆغەندا ئەفریقین ئەمانیش سامی نەژادن، نەدەکرا لەو جێگایەدا دەوڵەت دابمەزرێنن، پاشان ویستیان لە (ئەرجەنتین) دەوڵەت دابمەزرێنن، بەڵام مەجلیسی یەهودی لە سویسرا ئەو بڕیارەی ڕەت کردەوە، بانکی بارکلی یەهودی هیچ هاوکارییەکی نیشان نەدا، بە

هۆکاری ئەوەی ئەو جێگایە دوورە و هەموو جوولەکەی دوونیا لەوێدا کۆنابێتەوە، ئینجا (تیۆدۆر هرتزل) هاتە لای سوڵتانی عوسمانی داوای «قوبروسی» لێکرد، بەڵام پێینەبەخشی، دوای ئەوە چوونە ڕووسیا لە ناوچەکانی ڕووسیادا بە دوای خاکدا دەگەڕان، بەڵام قەیسەر ڕێگەی پێنەدان..

لە ساڵی(١٨٩١)ی ز، ئەمریکا بە فەرمی هاوکاری جوولەکەی کرد لە ڕیگای( ولیەم بلاکستۆن) کە دەڵێت: بزووتنەوەی گەڕانەوەی جوولەکە دابمەزرێت بۆ فەڵەستین، ئەم کەسە گەورە پیاوی پرۆتستانتی ئەمریکیە، لە وتارەکەیدا بە کۆنگرێس دەڵێت بۆ ئەوەی «ڕەب خاکی خۆی بەسەر گەلاندا دابەش بکاتەوە سەرلەنوێ» ئەو لە کۆنگرێسی ئەمریکیدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێت خاکی فەڵەستین بکرێتە دەوڵەتی جوولەکە، بەم شێوەیە لەو سەردەمەوە بەم پڕۆتستانیانە دەوترێت مەسیحی زایۆنیست (سەهیۆنی) ئەم بزووتنەوەیە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە جوولەکە بگەڕێتەوە بۆ خاکی یەهود کە فەڵەستینە، یاخود ناسراون بە ڕەوەندی سەهیۆنی، سەهیۆنیش شاخێکە لە فەڵەستین بەلای جوولەکەوە زۆر پیرۆزە و هەروەها لای پرۆتستانتیش.

ئەگەر تەماشای ئەم بیری بزووتنەوەی گەڕاندنەوەی جوولەکەیە بکەین دەبینین پێش (هێرتزل) ە، چونکە بانگەشەی ئەم بۆ فەڵەستین لە ساڵی (١٨٩٧)ی ز، دەستی پێکردووە بۆ گەڕاندنەوەیان بۆ فەڵەستین.

**بیروباوەڕی ئەمریکا و بەریتانیا :**

سەرلەنوێ چاوێك بگێرینەوە بە ستراتیژیەتی نوێی ئەم دوو وڵاتەدا، دوای ئەوەی کە زەمینەی کۆمەڵایەتی و ڕەوشە مێژوویی و سیاسیەکەیان ناساند..

لە ڕاستیدا پێکهاتەی پرۆتستانت لە ئەمریکادا گەورەترین مەزهەبە واتا لە (٧٠٪) پێکهێناوە، کاتۆلیك (٣٠٪) پێکهێناوە، لە بەریتانیادا لە (٧٦٪) گاوری پرۆتستانتین، لە (٢٤٪) کاتۆلیکن، ئەڵمانیا زۆرینەی پرۆتستانتن لەگەڵ ئەسکەندناڤیادا، بەڵام فەرەنسا و ئیتالیا و ئیسپانیا زۆرینە کاتۆلیکن.

هەموو دەزانین ئەستێرەی ئینگلیز و ئەمریکا ڕۆژ لە ڕۆژ لەبەرزیدایە، جوولەکەش لەو دوو وڵاتەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان بوونیان هەیە، لە ڕووی ئابوریی و سیاسیەوە دەسەڵاتی تەواویان هەیە، بگرە لە هەموو جیهاندا هەر دەستیان هەیە، تەنانەت پاپای کاتۆلیکی لە ڕۆمادا فشاریان خستە سەر لە ساڵی (١٩٦٦)ی زایینی، کە بەیانامەیەکی زۆر ترسناك و کارەساتی دەرکرد لە مێژووی کاتۆلیکدا شتی وا ڕووینەداوە، ئەویش ئەوە بوو بەرامبەر بە فشاری ئەمریکاو بەریتانیا وتی: جوولەکە پاکە لە خوێنی عیسای مەسیح ئەوان نەیانداوە لە خاچ!..

لە پاشاندا لەسەر ئەم وتەی پاپا.. کاردانەوەی زۆر هەبوو بە تایبەت لە خەڵکی ئەوروپا کە ڕقی تەواویان هەڵگرتوە لە جوولەکە بەم وتەیە، بەڵام لە ناو دڵدا، نەیانوێرا لەبەر پرۆتستانتەکان و یەهودی سەهیۆنی بە ئاشکرا دەریببڕن، بەڵکو ئەمریکا ڕایگەیاند کە تەنها ئەوە بۆ پارسەنگی سیاسییە، هیچ پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە نیە، چونکە ترسان لەوەی کە کاردانەوە گەورە دروست بکات.

کەواتە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە خۆشەویستی ئەمریکا و بەریتانیا لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە بۆ جوولەکە، بەردەوام هاوکاری جوولەکەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەی لە سەر خاکی موسڵمانان و فراوان کردنی جوولەکە هاوردەکان کە ناسراون بە (ئیستیتانی داگیرکەر)، ئێستا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەوان چەندە بەدڵ و بە گیان هاوکاری جوولەکەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەی، بۆ ئەوەی مەسیحەکەی خۆیان بگەڕێتەوە، ئەمیش ئەوە نیشان ئەدات کە ئەو گەلانە چەندە پابەندن بە ئایینەکەیانەوە.

ئەم باسەی کە کردمان هەموو گەلی پرۆتستانتی ئەو بیروباوەڕەی هەیە، ئەی گەورە لێپرسراو بەرپرسەکانیان چۆن بیر دەکەنەوە، ئایا هەر هەمان بیرو بۆچوونیان هەیە؟

**دینداری لای سەرکردەکانی ئەمریکا :**

پێدەچێت هەندێك لە موسڵمان وا بزانن کە سەرکردەکانی ئەمریکا هیچ پەیوەندییەکیان بە ئایینەوە نیە، یاخود وەك ئەدەبیاتی عەلمانی تەماشای سەرکردەکانی ئەمریکا دەکەن کە ئایین تێکەڵاو ناکەنەوە بە سیاسەت؛ تا ئەوکاتەی لەسەر کورسی دەسەڵاتن، بەڵام لەڕاستیدا ئەو کەسانەی کە دەبنە سەرۆك لەو وڵاتەدا هەموو پابەندن بە ئایینەوە. واتا (مولتەزیمن) زۆر جار لە پێشبڕکێ و بانگەشەی بوون بە سەرۆك کامیان پابەندتربێت بە ئایینەوە ئەوە زیاتر ڕەواجی هەیە، ئەوەشی کە زیاتر ئاڵای دین بەرز بکاتەوە و دژی ئیسلام بێت ئەوە زیاتر و باشتر هەڵدەبژێردرێت، لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا...

بەڵگە چییە بۆ ئەم چەند دێڕەی نووسراوە..

لەسەرەوە ئاماژەمان داوە بەوەی کە ئایینی خەڵکی ئەمریکا خاوەنی مەزهەبی تایبەتی پرۆتستانتین، چۆن گەشەی کردووە لە ئەوروپا و ئەمریکادا؛ ئەم مەزهەبەیش چەندە ڕۆحی پابەندبوونی داوە بەم گەلانە بە ئایینەکەیانەوە لەوەتەی وڵاتەکەیان دروست بووە، بەتایبەت ئەمریکا زۆر پابەندن بە ئایینەکەیانەوە..

ئەگەر بە وردی تەماشای مێژووی ئەمریکا بکەین لە کۆن و نوێدا دەبینین ئەم ڕابوونە پرۆتستانتیە چەندە کاریگەریی لەسەر خەڵك داناوە، لەدوای پەنجاکانی سەدەی بیستەوە، هەروەها کاردانەوەی لەسەر سیاسییەکان و ئینجا سەرکردەی ئەو وڵاتانە دروستکردووە..

لێرەدا پرسیارێك خۆی زیت دەکاتەوە دەڵێت: ئادەی سیمای ئایینی ئەم دەوڵەتە زەبەلاحە لەکوێدایە تا ئەو کاریگەرییە گەورەیەی دروست کردبێت..؟

لە دوای ناسینی زەمینەی ئەو وڵاتە و لێکۆڵینەوەم لەسەر خەڵکەکەی کرد، ئەوەم بۆ دەرکەوت کە خەڵکی ئەمریکی بە تەواوەتی پابەندن بە ئایینەوە و سیمای ئەو دەوڵەتە ئایینی تەواوە، بەڵام ئەو خراپەکاری و دزی و پیاوکوژی و دەعارەی جنسی و هەموو ئەو کارە ناقۆڵایانەی کە ڕووئەدەن لە دونیادا هەر لە ئەمریکاوە سەرچاوەی گرتووە.

بـــــــۆ؟

لە وەڵامدا دەڵێم: ئەگەر وردبینەوە لە مەزهەبی پرۆتستانتی، ڕێك ئەو گرێکوێرانەمان بۆ دەکرێتەوە، لە مەزهەبی پرۆتستانتی وا باوە کە مرۆڤ هەر تاوانێك بکات خوا لێی خۆش دەبێت، چونکە عیسا لەبەر خاتری تاوانەکانی مرۆڤ خۆیداوە لەخاچ، ئیتر مرۆڤی مەسیحی ناچێتە ناو

ئاگر، ئەو بۆ تاوانی مرۆڤە مەسیحیەکەیان تاوانەکانی هەڵگرتووە، ئەمە وای کردوە خەڵکی لەچەند تقوسێکی دینی مەراسیمی سەری ساڵیان و «کریسمس» و هێلکە ڕەنگ کردن (ئیستەر) ئەوا ئەو ساڵە هەرچی گوناهێکیان کردبیت ئیتر پاك دەبنەوە.

بەم پێیە ئەم ڕابوونە هەموو ئەمریکای گرتۆتەوە، لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا بۆ نمونە ئەو سەرۆکەی خۆی هەڵدەبژێرێت، یان ئەوەتا دیندارە و پابەندی تەواوە بە ئایینەکەیەوە یاخود عەلمانییە، بەڵام ئەوەی کە عەلمانییە دەبێت ڕێزو ئیحترامی تەواوی هەبێت بۆ دیندارەکان، کە تائێستا ئەم عەلمانیە وەك سەرۆك دەرنەکەوتووە، ئەوەی بینراوە لە ماوەی ڕابوردوو تا ئەمڕۆش هەموو سەرۆکەکانی ئەمریکا دیندار بوون خاڵی سەرەکیان پابەند بوونیان بووە بە مەزهەبی پرۆتستانتی.

ئاشکرایشە ڕابونی مەزهەبی پرۆتستانتی لە بنەمادا لە کۆمەڵگای ئەمریکادا میحوەرێکی سەرەکییە لە ژیانیاندا، بەسە بۆ ئەوەی ئەوە تێبگەین کە هەموو سەرۆکەکانی ئەمریکا لە سەدەی بیست و بیستویەکدا هەموو پرۆتستانتن، ئەوەی کە کاتۆلیك بوو تەنها «جۆن کەندی» بوو سەرۆکی ئەو وڵاتە ئەویش لە کارەساتێکی تەماویدا کوژرا، هەرچەندە دوای ئەوە ئاشکرا بوو کە تەنها پەیوەندی هەبووە بە ئایینەکەیەوە!!..

گەلی ئەمریکی سەرۆکی کاتۆلیکی هەڵنابژێرن، تەنانەت ئێستا وەك چۆن کۆتاییان بە هیندە سوورەکان هێنا لە ماوەی چەند ساڵێکدا ٨٠ ملیۆن هیندە سووریان قاتوقڕ کرد لە ئەمریکا، بەهەمان چاو تەماشای کاتۆلیکیش دەکەن!.. با موسڵمان لەولاوە بوەستێت!..

هەموو ئەوە باش دەزانین کورسی ئەو وڵاتە لە نێوانی دیموکراتیەکان و کۆماریەکاندا دابەش کراوە، دیموکراتیەکان ناسراون بە ئازادیخوازو

لیبراڵی ئایینی و پاراستی مافی کەمە نەتەوەیەکان، کۆمارییەکانیش ناسراون بە پارێزگارە- کارەکان لە ئایین و پابەندیان بە دینەوە، هەمیشە دەیانەوێت خەڵکی ئەو وڵاتە هان بدەن لە ڕێگای کەنیسەکانەوە لە دیموکراتخوازەکان، کە پەیوەندیەکی ئەوان بە توندڕەوە مەسیحییەکان کە هەموویان پروتستانتن، ئەوانەی لە مەجلیسی پیرانی ئەمریکادا و لە شارەوانیەکاندا هەموویان پرۆتستانتن و پابەندن بە ئایینەوە بێ جیاوازی، بێجگە لە پرۆتستانت کەسی تر بۆی نیە بێتە ناوی.

ئەمەش وایکردوە کە حیزبی کۆماریەکان زۆرترین پۆستی سەرۆکی ئەو وڵاتە بۆخۆیان دەستە بەربکەن، لە (٦٠٪) توانیویانە هەموو پۆستە گەورەکان بۆ خۆیان دابین بکەن، کۆماریەکان لە ناو کۆنگرێس و مەجلیسی پیراندا بوونیان هەبێت، ئەمە ئەوەمان پێدەڵێت؛ کە گوتاری دینی چەندە کاریگەریی هەیە لەسەر ئەو کۆمەڵگایەدا، تەنانەت عەلمانیەکان توانای ڕووبەرووبونەوەیان نیە لەگەڵ ئەو ڕەوتە ئایینیە ئوصولیە پڕۆتستانتییە.

لە ساڵی (١٩٧٧)ی زاینی، بزووتنەوەیەکی ئایینی کەچالاکی بەردەوامی هەیە، ناسراوە بە کەنیسەی تەلەڤزیۆن، لەو ڕێگایەوە بیروباوەڕی خۆیان دەخەنە هەموو ماڵێکی پرۆتستانت، ئەم ڕابوونە داوای هەموو ماڵێکی ئەمریکیە، ئەو هۆزە ئایینیە ئوصولیانەی کە هەن لە ئەمریکادا بریتین لە:..

- (Baptist) ناسراوان بە هۆزی مەعمەدانی.

- (Methodist) ناسراون بە هۆزی مەنهەجی کە بەڕەوتی لە دایك بووە مەسیحەکان ناسراون (موەلدین).

- (Born Again Christians) ناسراون بە هۆزی مەسیحی زایۆنی، کە ئەم هۆزە زۆر پیرۆزی ئەدەن بە جوولەکە، پێیان وایە گەلی هەڵبژێراوی خواوەندن.

کەسێك لەم بیروباوەڕە ترسناکە گەیشتە دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری بۆ یەکەم جار لە ساڵی(١٩٧٦)ی زاینی، بەناوی "جیمی کارتەر" کە سەرۆك کۆمارێکی زۆر ديندارو پابەند بوو بە پرۆتستانتی، لەساڵی (١٩٧٩)ی زاینی، بە ڕاشکاوانە ڕایگەیاند کە پەیوەندی نێوان ئیسرائیل و ئەمریکا پەیوەندییەکی ئایینە و لەسەر بنەمای بیروباوەڕ دامەزراوە، ئەمە دەقی وتەکەیەتی کە ڕۆژنامەی ئەهرامی میسری تەرجومەی کردووە" إن علاقة أمريكا بإسرائيل أكثر من علاقة خاصة، لقد كانت ولا تزال علاقة فريدة، وهي علاقة لا يمكن تفويضها؛ لأنها متأصلة في وجدان وأخلاق وديانة ومعتقدات الشعب الأمريكي". کە پێیوایە پەیوەندی ئەمریکا و ئیسرائیل زۆر لە تایبەت تایبەت ترە، پەیوەندییەکی ناوازە و بێپسانە، ئەم پەیوەندییە هیچ کاتێك هەڵناپەسێنرێت، بەردەوام لە ناخو هەستو ڕەوشتی ئایین و بیروباوەڕی خەڵکی ئەمریکادایە.

پاشان ڕووداوێکی گەورە ڕوویدا لە شانۆی سیاسی ئەمریکادا، سەرۆکێکی نوێی ئەو وڵاتە خۆی هەڵبژارد، بۆ سەرۆك کۆماری، بە ناوی "ڕۆناڵد ڕیگن" لە ساڵی (١٩٨١)ی زایینی، لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی لەپێش هەڵبژاردنی وتی: ئەجیندای کاری من لەم وڵاتەدا پیادەکردنی ستراتیژی و ئەدەبیاتی ڕاسترەوی مەسیحی توندڕەوە، لەدوای ئەم قسەیە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کەسێك بەناوی" جیری فالویل" کە سەرۆکی کڵێسەکانی چەند ویلایەتێك بوو، تەنها بۆ ئەو وتەیەی پێش هەڵبژاردنەکان کردی لە کاتی هەڵبژادنەکاندا دەنگی

سێ ملیۆن کەسی بۆ کۆکردەوە، ڕووداوی هەڵبژاردنەکە ساڵی(١٩٨٠) ی زایینی بوو، هەروەها ڕۆناڵد ڕیگن سەردانی ڕێکخراوێکی جوولەکەی کرد لە واشنتۆن، ئەوسەردانەشی هەر لە کاتی پرۆسەی هەڵبژاردنەکەیدا بوو، بە ئاشکرا لە وتارێکیدا لەو جێگایەدا وتی: بەڕاستی ئیسرائیل تەنها ئومەتێك نیە و بەس، بەڵکو ڕەمزە بۆ ئێمەی ئەمریکی، بە ئاشکرا بەرگری لە مافەکانی ئیسرائیل دەکەین، چونکە ئەو بەرگریە سەرچاوەکەی لە ئایین و خوڕەوشتمانەوە سەرچاوەیگرتووە.

پاش بردنەوەی ڕیگن لە هەڵبژاردنەکاندا! بەڵکو جاری دووەمیش سەرکەوتەوە لەساڵی (١٩٨١-١٩٨٩)ی زاینی، ئەو چەند ساڵەی حوکمرانی ڕیگن وەك نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی"جیمس ملیز" دەڵێت: هەموو سیاسەتی ڕیگن لە سەربنەمای کتێبی پیرۆز بوو واتا تەورات، بەتایبەت لەسەر سفری حزقیال، کە لەوێدا بە ڕوونی دەڵێت پەروەردگار منداڵەکانی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ خاك گەڕاوەی خۆیان، ڕیگن زۆر باسی جەنگی "هارمجدۆن"ی دەکرد، کە واتاکەی ئەو جەنگە یەکلاکەرەوەیە کە سەربازەکانی عیسای کوڕی مەریەم بە دەستی دەهێنن دژی دووژمنەکانیان سەردەکەون، هەرمەجدۆنیش شاخێکە کە ئەو شەڕە تێیدا ڕوو ئەدا، ئەویش لە تەوراتدا باس کراوە، ڕیگن دەڵێت: ئێمە ئەو ڕەوەندەین کە ئەو شەڕە لە زەمەنماندا ڕوو ئەدات.

پاشان جۆرج بۆشی باوك لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆشتەوە، بەڵکو باشترین خزمەتی پێشکەش بە کیانی زایۆنستی کرد، بەتایبەتیش مەسیحی توندڕەو، ئەویش لە ڕێگای ئاڕاستەی سەربازی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست؛ بۆ ئەوە خەونی هارمجدۆن بەم نزیکانە ڕوودات، ئەمەیش بۆ جولاندی سۆزی هەموو مەسیحییەکان بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکە.

لە سەردەمی کلینتۆن بە هۆکاری ئەوەی تەنها داوای دوو دەوڵەتی کرد لە سەرخاکی فەڵەستین، ئەوە بوو ئەو کێشە ئەخلاقیەیان بۆ زیندوو کردەوە، تەنها کە وتی دەبێت کێشەی فەڵەستینی و ئیسرائیل لەسەر ئەو خاکە چارەسەر بکرێت، ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی کە (١٩٩٣-٢٠٠١)ی زاینی، هێواشیەك بەخۆیەوە ببینێت گەورەترین کێشە لە ڕووی ئیدارەی ئەمریکییەوە ڕووبەروی کلینتۆن دەکرایەوە، تا لە کۆتایدا چوو لەناو کڵێسادا داوای لێبوردنی کرد لە ئیسرائیل و لە گەلی ئەمریکی و ئینجا لە خێزانەکەی کە ئەم ڕۆحی پیس تێکەڵ بووە بە گیانی..!

لەدوای کلینتۆن جۆرج بۆشی کوڕ هاتە سەر حوکومرانی کە بە توندڕەوترین سەرکردە هەژمار دەکرێت، لە مەسیحییە توندڕەوەکان بوو، خۆیشی نەیدەشاردەوە کە کەسێکی ئوسوڵی توندڕەوی مەسیحی بوو، بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە گەلی جوولەکە گەلێکی تاك و هەڵبژێرراون لە خواوەندەوە، ئەم پێچەوانەی وتەکەی کلینتۆن وتی زفەی ڕۆژئاوا و غەزە بەشێکن لە دەوڵەتی جوولەکەو بە هیچ شێوەیەك جیا نابێتەوە لەو وڵاتە، ئەم قسەیەشی هەروا بە سادەیی نەکرد بەڵکو چەند دێرێکی لە کتێبی پیرۆز خوێندەوە، پاشان بێ دوو دڵی هەر لەو پەیامەیدا ڕایگەیاند بە ئاشکرا کە ئەو جەنگی خاچپەرستی دەکات دژی موسڵمانان، دوای ئەوەی کە زانی زۆر لەسەری کەوت وتی لە دەمم دەرچووە داوای لێبوردنی لە خەڵکی موسڵمان کرد، کە گوایە نایەوێت هەست و سۆزی خەڵکی تر تێك بچێت!!

لەگەڵ ئەوەی باراك ئۆباما لە دیموکراتی لیبراڵەکانە، بەڵام ئەمیش ناتوانیت لە ڕێگای ئەوان لابدات، لە کاتێکدا کە بنەچە و بنەڕەتی لە خانەوادەیەکی موسڵمانە، بەڵام بە ئاشکرا پرۆتستانتی خۆی ڕاگەیاند و، وتیشی بڕوای تەواوی هەیە بە هەموو بنەماکانی پرۆتستانتی، هەرگیز

دژی ئەو باوەڕە کارناکات، خۆشی دەوێت و هەوڵی سەرکەوتنی ئەدات.. ئەمە لە کاتی هەڵبژاردنی یەکەمیدا بوو!!

لە ڕاستیدا هەموو کارەکانیان وەك ڕۆژی درەخشان دیارن، چونکە دینداری و ئایین لەو وڵاتەدا بنەمای سەرەکی جوڵێنەری مرۆڤەکانە لە ئەمریکادا، بەڵکو زۆر لەوە زیاترە کە من ئێستا لە باسێکی ئاوادا بۆ خوێنەرم کورت کردۆتەوە، زۆر جار بە ئاشکرا سەرکردەکانی ئەمریکا بە فەخرەوە باسی ئایینەکایان دەکەن هەوڵی بۆ ئەدەن ناترسن لە باسکردنی و پابەند بوونیان بە ئایینەکەیانەوە، چونکە دەزانن ئایین کاریگەریی هەیە بەسەر گەلەکەیانەوە.

تۆ بڵێیت ڕۆژێك بێت لە وڵاتی ئێمەشدا سەرکردەکان شانازی بە ئایینەکەیانەوە بکەن، کە دەست دەکەن بە قسە کردن چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز بخوێننەوە، باسی بنەماکانی ئیسلام بکەن و بڵێن ئێمە پابەندین بە ئیسلامەوە، باس لە تەنەبوئاتی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر بکەن، بەرگری بکەن لە بیرو باوەڕێکی نەگۆڕاو دەستکاری نەکراو کە لەلای خواوە هاتووە بۆ مرۆڤایەتی؟

یان وا خەریکە سەرکردە ئیسلامییەکانیش تەنازول لە بیروباوەڕیان دەکەن بۆ ڕازیکردنی دڵی دوژمنیان دەڵێن ئیسلام و دیموکراسی موتوربە دەکەین، یان دیموکراسی و لیبراڵی دەکەنە ئالیەتی کارکردن، ئیسلامیش کە ئایینەکەیانە ڕوویان نایەت باسی بکەن.

ئەوەی باسم کرد لە وڵاتی ئەمریکا ڕوویداوە، نەك وڵاتی موسڵمان.

**جیاوازی نێوان دیموكراسی و ئیسلام بناسە :**

ئیسلام و دیموكراتی پەیوەندی نێوانیان..

لەڕاستیدا من وای دەبینم ئەم دوو چەمكە ئیسلام و دیموكراتی هیچ پەیوەندییان بەیەكەوە نیە، بە بەڵگەی ئەوەی كە دیموكراتی بوونی هەبووە لەسەردەمێكەوە چەندین ساڵ پێش زایینە، بوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنان و وشەكەش هەرلەوێوە سەرچاوەی گرتووە، یەكەم كەس بە كاری هێناوە سیاسییەكی ئەو وڵاتە بە ناوی (پێریكلیس)، ئەم ناوەی بۆ داتاشیوە بە مانای سەروەری گەل ئەم باسە مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانی(ثۆكیدیدس) یاداشتی كردووە لە(پێریكلیس) ەوە گێڕاویەتیەوە و كردوویەتی باس و خواسی لە كتێبە مێژوویەكەیدا مەبەست پێ گەل و دەسەڵاتە.. پاشان ئەم تێڕوانینە سەرەتا لەناو كۆمەڵگەكانی یۆناندا وەك میكانیزمی كایەی بەڕیوەبردن هاتە ئاراوە، چونكە ئەوەندە فرەخوازی هەبوو لە یوتوپیایەكی ڕەهادا دەژیان، فەلسەفەش لەو دەمەدا تا ڕادەیەك كاریگەری هەبوو فەیلەسوفەكانیش بۆ بەڕێوەبردنی ژیان كردیانە فەلسەفەی سیاسی و- فیكری سیاسی لەسەر دامەزرا.. لەسەر نوخبەیەك كە توانرا شێوە سیستەمێكی سیاسی دروست بكرێت بەناوی دیموكراتی نمونەیی، كە گەل ڕاستەوخۆ بەشدار بوون ناسراوە لە مێژوودا بە دیموكراسی ڕاستەوخۆ.. ئەمە قۆناغی یەكەمی دیموكراسییە..

قۆناغی دووەم: لەسەردەمی سەدەی ناوەڕاستەوە لە خۆرئاوا گەشەی كردووە بۆ بەدەست هێنانی كەرامەتی مرۆڤ و ئازادییەكانی و موڵكایێتی و بۆ بەدەست هێنانی ئازادییەكانی مرۆڤ بەگشتی بەرهەم هاتووە وەك شێوەی ڕێكخەری كۆمەڵگا و ژیان (نمط الحیاة) بۆ پاراستنی لە دەسەڵاتی

«ئەكلیریۆس» و كڵێسا بەرانبەر بە بەگزادە و سەرمایەدارەكان، لە ڕاستیدا هاوكاری سەرمایەداری خۆرئاوا بوو بۆ ئەوەی لە چوارچیوەی ئەو كۆت و زنجیرەی كە كردبوویە قاچی وملی خەڵكی ئەوروپا ومۆنۆپۆڵی كڵێسا بۆ هەموو دامەزراوەكانی ئەو سەردەمە، دیموكراتی هاتە ئاراوە بۆ ئەوەی خەڵكی مافی هەڵبژاردنی بیروباوەڕی هەبێت، بۆ ئەوەی توانای بەدەستهێنانی سەرمایەی هەبێت، خاوەنی سەربەستی و ئازادی ڕەها بێت و بوونی خۆی بەدەست بنێت و بتوانێت هەناسەیەك بدات، خەڵكی خۆرئاوا لە دەستی دەسەڵاتداریەتی « ثیوكراتی» ڕزگاریان بێت، خەباتی چەندین ساڵە كرا تا قۆناغ بە قۆناغ توانیان دیموكراسی بگەیەننە ئەو ئەنجامەی كە ئێستا بوونی هەیە لە دونیادا..

قۆناغەكان..

(Political Democracy)

- دیموكراتی سیاسی دەركەوت لەسەر بنەمای ئەوەی هەموو كەس مافی ئازادی و یەكسان و بەشداری لە كایەكانی ژیاندا هەیە بێ ڕەچاوی ڕەگەزو ئایین و ڕوخسار..

(Demo Administration)

- دیموكراتی ئیداری: ئەمیش بریتی بوو لەوەی كە كۆمەڵگا دەستە جەمعی بڕیاری خۆیان ئەدەن، گەل خاوەنی بڕیار دەبێت

(Industrial Demo)

- دیموكراتی پیشەسازی: ڕێكخستنی كارگەكان لەسەر بنەمای دیموكراتی كە كرێكاران بەشدارن تێیدا و مافی بڕیار و پلان و چاودێری دروستكردنی لیژنەكانیان هەبێت..

(Demo Centralism)

- دیموکراتی سەنتەر: کە زیاتر لە ناو شوعییەکاندا باوە، ئەوانەی کە بڕوایان بە سیستەمەکە هەبوو.. کە زۆر کاریگەری نەبوو لە ژیانی چەپەکاندا، نمونەیەك لەبەر دەستدا نیە بێجگە چین.. کە زۆر بە دیموکراسی هەژمار ناکرێت..

هەموو ئەمانە بە بیروباوەڕێك یاخود (مەبدەئێك) بارگاویکرا کە پێیدەوترێت "لیبرالیزم» کە دیدو تێڕوانینی هەیە بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ..هەموو ئەمانە پێکاهاتووە لە بەریوەبردنی دەسەڵاتی گەل لەسەر بنەمای دەستوور و یاسا ڕیکیخستووە بۆ ژیانی کۆمەڵگا و مرۆڤەکان خۆیان پیادە(مومارەسەی)ی دەسەڵاتی خۆیان بکەن، ئیرادەی خۆیان بچەسپێنن.. لەسەربنەمای دەسەڵاتی سەرمایەداری کە هەموو ئەمانە ڕێکخراون بە فیکرێك لە دیموکراسیدا.. پاشان وەك سیستەم لە حوکومڕانیدا بۆ ئازاد کردنی هەموو دامەزراوەکانی ناو حکومەت..

وەك دادگا و میدیا و دارایی و سەربازی..

فەلسەفەی ئەم ئازادی دامەزراوانە چییە کە سەرمایەداری دەیبەخشێت بەپاڵپشتی دیموکراسی؟..

بریتییە لەوەی سەرمایەداری بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی خۆی لە هەموو جیهاندا چەند دامەزراوەیەکی سازاندووە بۆ ئەوەی پشتگیری لەم فیکرە بکات، لەسەرەتای دەستپێکی خۆیەوە بە سەربازی و هێزی عەسکارتاریی خۆی سەپاندووە، یاسا و ڕێسای دامەزراندووە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، دارایی ئامادە کردووە بۆ ئەوەی بەردەوامی

بدات بە کۆمپانیا زەبەلاحەکانی، دادگای بێلایەنی دامەزراندووە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی خۆی پێ بپارێزێت، لەم کەینوبەینەدا سەرمایەداری ڕۆژنامەگەری ئازادی دامەزراندووە یاخود میدیای ئازادی دامەزراندوە بۆ ئەوەی کەس ئیختیلاس و دزی نەکات، چاودێر بێت بەسەر ئەو کەسانەی کە گەندەڵی دەکەن، دەسەڵاتی سەرمایەداری بەدوادا چوون دەکات، بەدوای ئەو گەندەڵی و دزییانەی کە دەکرێت هەمیشە لە کەمیندایە بۆ پاراستنی سەرمایەکەی خۆی نەك لە ڕاستیدا مرۆڤەکان.. بەم سیستەمە دەوترێت دیموکراسی کە خزمەتە بە ٥٠ سەرمایەداری مۆنۆپۆلی جیهانی کە جیهان دەبەن بەڕێوە!.

هەموو ئەمەی باسم کرد لەسەردەستی کۆمەڵێك زاناو بیرمەندی خۆرئاوا هاتە کایەوە دژی دەسەڵاتی کڵێسا کە هەموو زادەی بیری مرۆۆڤەکانن.!

وەبنەمای فیکرییەکەی لەسەر چوار ئازادییەکە دامەزراوە کە برتیین :

**یەکەم:** ئازادییە گشتیەکان.

**دووەم:** ئازادی موڵکایەتی.

**سێیەم:** ئازادی ڕادەربڕین.

**چوارەم:** ئازادی تاك.

ئەم چوار ئازادییە لە هەموو شتێك پیرۆزترە لە سیستەمی دیموکراسیدا وەك ئەوە وایە کە بوتریت مرۆڤ خۆی گەورەی خۆیەتی کەس گەورەی نییە..ئەمەش وادەکات هیچ ئایینێك ناتوانیت بیروباوەڕی خۆی فەرز بکات بەسەر کۆمەڵگا و تاکدا و بە دەستور و یاسا هێزی حکومەت

ڕێکدەخرێت تا مرۆڤەکان بە ئازادی ممارەسەی ژیانی خۆیان بکەن، ئیتر بۆ دواجار گەل سەروەرە بێجگە گەل هیچ خوایەکی تر نییە.!

ئەوەی کە باسم کرد دیموکراسی بوو..

ئێستا باسێکە لەسەر ئیسلام دەکەم بۆ ئەوەی بزانین ئەم دوو چەمکە چی پەیوەندییەك بەیەکەوە دەیانبستێتەوە..

ئیسلام بۆ خۆی خاڵیە و دوورە لە فیکری مرۆڤایەتی، ئەمە جەوهەری جیاوازیەکەیە ، فیکری بەشەرییەت هیچ بەشدار نەبووە لە داڕشتنی ئەم ئیسلامەدا، هەر لەبەر ئەوەشە لەو جێگایەوە هاتووە، کە هیچ شارستانیەتێك و هیچ فەیلەسوفێکی تێدا هەڵنەکەوتووە، چونکە ئیسلام ئایینە لەخواوە هاتووە، ئەکرا خەڵکێك بپرسێت باشە بۆ لە یۆنانەوە نەهات؟ ئەگەر لە یۆنانەوە بهاتایە هەمووتان ئەتان وت موحەممەد ﷺ ئەو کەسەی کە ئەم دینەی هێناوە شتێکی تازەی نەخستووەتە بەردەستی خەڵکی، چونکە پێش (موحەممەد) لە یۆنانا، ئەرەستۆ، ئەفلاتۆن، سوقرات، فەلسەفەی کلاسیك و دەیان فەیلەسووفی ناوازە و خەڵکی بە تواناو مێژوو نووسی گەورەی تیا هەڵکەوتووە وەکو هیرۆدۆت.. دەگوترا دیسان موحەممەدیش شتێکی گەورەی نەهێناوە، لەو جێگایە هەموو جۆرە فەیلەسووفی تیدا هەڵکەوتووە. هەموو خاوەنی هزر بوون.

ئەگەر بهاتایە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لە وڵاتێکی وەکو فەلەستینەوە بهاتەیە، هەموو ئەوانەی کە عەقڵانین، واتە ژیانیان لەسەر عەقڵ دادەمەزرێنن، ئەیانووت هیچ ئەرزشێکی نیە، چونکە خاکی پێغەمبەرانە بە سەدان پێغەمبەری تیا هەڵکەوتووە، وەکو موسا، عیسا، سلێمان، داوود و

دانیاڵ، دەوترا ئەوە بەخاکی پێغەمبەران ناسراوە، کەواتە بۆیە موحەممەد ﷺ لەوێوە نەهات، جێگەی سەرسامی ئێمە نە ئەبوو ئەگەر لەوێشەوە بهاتایە دەمانوت: خۆی دارێژەرەوەی ئایینەکانی ئەوانە و شتیکی زیاد کردووە.

ئەگەر لە فارس و لە وڵاتی خەوارزمەوە یان لە ئیمپراتۆرییەتی پارسیا بهاتایە، ئەمانگووت شتێکی گرنگ نییە چونکە پێشتر دەیان فەیلەسووفی وەکو زەردەشت و یەزگورد و و ئەنەشیروان و ئەو کەسانەی تر کە خاوەنی توانا و سیستەم و دەسەڵات و هێز و فیکر بوون لەو زەمینەیەشدا بوونیان هەبووە، شتێکی گەورەی نەئەهێنا.

ئەگەر بهاتایە لە چین و لە ناوچەکانی تر بهاتایە ئەمانگووت پێش موحەممەد ﷺ کۆنفۆشیۆس و بوزایش خاوەنی ئەفکار و بیردۆز و دەسەڵات و سیستەم بوون، بەڵام بۆیە ئێمە ئیسلام هەڵئەبژێرین کە خاوەنی بیری مرۆڤایەتی نییە دوورە لە بیری مرۆڤ، لە جێگایەکەوە هات هیچ شارستانیەتێکی تیدا نەبوو. دوا کەوتووبوون کچی خۆیان زیندە بە چاڵ دەکرد، لەگەڵ ئەم زیندە بە چاڵکردنەشدا، دار و بەردیان دەپەرست، شتێکی جوانتریان دەستکەوتایە ئەیانپەرست..

لیرەوە دینێك دەرئەچێت، بیرێك دەرئەچێت، ژیانێك دەرئەچێت، کۆمەڵگایەك دەگۆڕێت کە هەرچی ژیاری گەورەی دنیاش هەیە بە فارس و ڕۆمەوە کە فارس خاوەنی دوو ملیۆن سەربازی و ڕۆمیش خاوەنی یەك ملیۆن سەربازی بوون، ئەیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە کە خەڵکی ئەو ناوچەیە ئاواتەخواز بوون تەنها بە گەورە پیاوانیشەوە.. قورەیش بچنە دیوانی کیسرا بووەستن، بەس لە دوورەوە چاویان بە کیسرا بکەوێت، بەڵام هەر ئەمانن دواتر عەرشی کیسرا دەجووڵێنن..

ئەمە پرسیارە جەوهەرییەکەیە کە ئەم شارستانیەتە چۆن دروست بوو؟ ئەم ئایینی ئیسلامە نهێنییەکی تیایە ئێمە پێویستە بیدۆزینەوە، نهێنییەکەش لەوەدایە کە خاڵی یە لە فیکری بەشەرییەت. بەشەرییەت دەستی تیدا نەبووە تا دایمەزرێنێت، پاکە لە فیکری مرۆڤایەتی وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ترکتکم علی البیضاء، لیلها کنهارها لا یزیغ عنها بعدي الا هالك) واتە، لەسەر چەرچەفێکی سپی و پاك و بێگەرد ئەم دینەم بەجێهێشتووە بۆتان، شەوەزەنگی وەکو ڕۆژ درەخشانە. ئەمە سەرەتای دەسپێکی زەمینەی دینەکەیە کە دێت بونیادی تاکی لەسەر دەکات، هیوادارم ڕوون بێت ئەمە بنەماکانی ئەم ئیسلامەیە لە جێگایەکەوە هاتووە کە عەقڵی بەشەرییەت تیایا زادە نەبووە، هیچ کەسێك تیایا نەیتوانیوە بڵی من دەستم تیایا هەیە.

هەموو بیردۆزەکانی دونیا، هەموو فەلسەفەکانی دونیا خەڵکانێکی تر دەستیان تیا هەبووە، بەشدارییان کردوە لە فەلسەفەیدا لە فیکریدا، لە دامەزراندنی سیستەمیدا، بەڵام ئیسلام کە دێت هیچکەس دەستی تیا نەبووە کەسیش ناتوانێت بڵێت من بەشداربووم تیایدا، ئەمە زەمینەکەیەتی کە ساز دەکرێت..

سەرەتای دیموکراسی بەوە دەست پێدەکات لەگەڵ دین، کە دەبێت جیا بکرێتەوە لە دەوڵەت.. دیموکراتی بۆ خۆی پارێزەری عەلمانیەتە، هەروەك ئەلبیر کامۆ دەڵێت: دەبێت بەهەر شێوەیەك بووە لە ناو ئەم سیستەمەدا دین لە دەوڵەت جیا بکریتەوە جەخت لەوەدەکاتەوە ئەگەر دین هاتە ناوکایەی دیموکراتی محاکمی تەفتیش دروست دەکات، ئەمە یەکێکە لە فەیلەسوفە فرنسیە /جەزئیریەکان کە باسی ئەوە دەکات دین و لەگەڵ دیموکراسی بەڵگەنەویستە (موسەلەماتن) بۆ جیاکاری هەر دەبێت جیا بکریتەوە..

پـاشـــــان..

ئیسلام سەرەتای قورئانەکەی بەوە دەست پێدەکات کە گوتارێکی سیاسییە بە سوپاسگوزار و پاشان بە دواکەوتن و دواتر بە خۆ بەریء کردن لە ڕێ و شوێنە هەڵەکانی گەلانی تر و بڕیار ئەدەیت و نزا دەکەیت، خۆت دەناسینی کە خوا پەرستی، ناسنامەی خۆت ئاشکرا دەکەیت، تا کۆتایی قورئان تەفسیری ئەو سورەتەیە کە خوای گەورە دەفرمووێت..

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾

(ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی. مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾

وە بە پادشای خەڵکی.

إِلَهِ النَّاسِ ﴿٣﴾

وە بە خوای خەڵك.

تەنانەت کۆتاییەکەی بە دەسەڵاتداری خۆی کۆتایی پێدنێت..

بەوەی کە خوا پاداشایە، کەواتە خوا حاکمە..

پێغەمبەر ﷺ زیاتر ئاگادارمان دەکاتەوە لە سیستمەکەی خۆی دەفەرمووێت..

علیكم بسنتي وسنة خلفاء الراشدين.. واتا دەست بگرن بە ڕێگا و شوێنەکانی منەوە کە ئەنجامم داوە، پاشان خەلیفە پێگەیشتووەکانم، زیاتر ئاگادارمان دەکاتەوە دەفەرمووێت: (وإياكم ومحدثات الأمور ؛ فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة)

پێغەمبەر ﷺ کە باسی (محدثات، يحدث، حدث ) کرابێ واتە (المفسدون في الأرض) ئەوانەی کە خراپەکارن _ بەمانای تازەگەری و داهێنان کە لە شەرعدا نەبێت، واتە (المحدثات بمعنى الباغون على الحق والعدل والخارجون على قانون الدولة ( بە کەسێك دەوترێ محدث کە طغيان ئەکات واتا دەرچووە لە ئەمری خوای گەورە ئەم وشەیە زیاتر بۆ سیستەمی دەسەڵات بەکاردێت _ دەسەڵاتیش لێرەدا یاخود لە شەرعدا بەمانای ئەو دەسەڵاتەی کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە لە فەرموودەکەیدا کە دەفەرمویێت لەسەر سوننەتی من بن و لەسەر سوننەتی خەلیفە ڕێنیشاندراوەکانبن، نەك هەموو دەسەڵاتێك بەگشتی باسبکرێت، دەبێت دەسەڵاتەکان دیاری بکرێت، چونکە ئێمە باسی دەسەڵاتی ئیسلامی دەکەین، کاتێك دەسەڵاتەکە ئیسلامی نەبوو ئەوا گوێڕایەڵکردنیشی ناشەرعیە و ناشێت بۆ موسڵمان خۆی پابەندی دەسەڵاتێکی ناشەرعی بکات دەبێت بیگۆڕێت و لە هەوڵی گۆڕانیدا بێت.

مەبەست لە محدث ئەو کەسانەیە کە هەمیشە فیتنە دروست دەکەن بەرامبەر ئەو کەسانەی گۆڕانکاری دەکەن، (خارجون عن الدولة الشرعية) هەر کەس لە قانوونی دەولەی ئیسلامی بچوایەتە دەرەوە پێی ئەوترێ محدث، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموویێت: (من أحدث فيها حدثا أو آوى محدثا فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لا يُقْبَل منه صَرْف ولا عَدْل ) واتە هەر کەسێك لە سیستەمی ئیسلامیدا بچێتە دەرەوە ئەوا لەعنەتی لێ کراوە و لەعنەتی مەلائیکەت و خەڵکی بەگشتی، صرف، سەرفکردن، بەواتای تۆبەکردنی لێوەرناگیرێت چونکە سەرفکردنی تاوانە لە جێگای چاکەکردن، والعدل، عەدل، بەخشین و لەبریدان لەشەرعدا کە ئیشێك بکات حەددی شەرعی بکەوێتەسەر، وەکو دزیکردن، لەبریدانەکەی دەست بڕینە و بەوشێوەیە.

پاشان کاتێك ( موثەنی کوڕی حارثە ) تشریف دەبات بۆ عێراق لەگەڵ پێغەمەبەری خوا ﷺ دەکەونە گفتوگۆ، مثنی کوڕی حارث دەفەرمووێ (انا قد عاهدنا کسری علی ان لانحدث حدثا ولا نئووي محدثا) واتە: ئێمە بەڵێن و پەیمانمان بەکیسرا داوە کە هیچ شتێك نەکەین دژبە سیاسەتەکەی ئەو، هیچ کەسێکیش پەنا نەدەین کە دژی ئەو بجوڵێتەوە.

لێرەدا محدثات بدعەی داهێنراوە کەئەم سیستەم و ڕژێم و فەرمانڕەوایی دێت بەو مانایەی کە ئێستا هەیە و گرنگە هەموو لایەکمان هەست بەوە بکەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێت: ( من أحدث في أمرنا هذا مالیس منه فهو رد ) واتە: هەرکەسێك شتێك دابهێنێت لە سیستەمی ئێمەدا نەبێت و فەرمانی ئێمەی لەسەرنەبێت ئەوا دەدرێتەوە بەسەریداو لێی وەرناگیرێت.

ڕژێمی موسڵمان ( توحید ) ە سیستەمی دەسەڵاتی ئیسلامییە، گۆڕینی هاتنەوە کایەی ئیسلام لە ڕووی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و ...هتد، لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانەوە ئەمە پێی دەوترێ گوتاری سیاسی، بەکورتی پیکهات لە ئوصولی سێ شت ( قورئان، سوننەت، خەلیفە ڕاشدینەکان).

پێغەمەبەر ﷺ دەستنیشانی سیستەمی سیاسی ئیسلامی کردووە.

سەروەرمان محمد کۆتا پێغەمبەرە ﷺ و ئایینەکەیەشی کۆتایی ئایینەکانە، خوای گەورە و باڵا، لە پەیامەکەیدا بۆ سەر زەوی دەفەرمووێت: ( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا).٣/ المائدة

لێرەدا دەبێت ئەو لە بەر چاوبگرین کە خوای گەورە ڕازییە بەوەی ئیسلام ئایینمان بێت، دەبێت بە بچووك و گەورەی ئیسلام ڕازی بین، من گومانم لەوەدا نیە کە هەمووومان بە جیاوازی دیدو بۆچوونمان لەسەر ئەمە کۆکین، کە مادام کۆکین ئەم دەقە قورئانییە تەئویل هەڵناگرێت، نە هیچ وتە و باسێکی تر، ئەگەر مەرجە موسڵمان بین و شوێنکەوتووی محمد ﷺ بین خۆ ئەو پێغەمبەرمان بووە و سیستەمی سیاسییەکەی سیستەمی پێغەمبەرایەتی بووە.

دەفەرمووێت دوای من پێغەمبەر نایەت؛ کەواتە ئەو سیستەمە کۆتایی هات، بەڵام دوای ئەوە سیستەمێکی نوێ دەست پێدەکات خۆی ئاشکرای دەکات وەك نیشانەی پێغەمبەرایەتی خۆی و سیستەمی سیاسی و بەرێوەبردنە هەر خۆشی حاکم بووە و فەرمانڕەوا بووە (، لەدوای ئەو سیستەمە ناوی نە ناوە سیستەمی دیموکراسی، بەڵکو ناوی لێناوە سیستمی پێگەیشتو واتا(ڕاشدین)، دوای ئەو سیستەمە - سیستەمێکی تری ئیسلامی دەستنیشان دەکات بە ناونیشانی سیستەمی ویراسەت کە هاوشێوەی پاشایەتیە، بەڵام لە ناو دامەزراوەی ئیسلامیداو لە بازنەی ئیسلامەکەدایە وەك نمونەی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ڕەزامەندی خوای لێبێت زۆرێکی تر لە خەلیفەکانی ئومەوی و عەباسی و عوسمانی.. تاد، ئەمان لە شورا دەرچووبوون، سیستەمی زۆر و ستەمکار بەزمانی ئەمرۆ (دیکتاتۆر)، ئەمیش دەشێت هەر لە بازنەی ئیسلامدا بێت، بەڵام وەك حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، جەلالەدینی کوڕی محمدی خەواریزم شا، بەدرەدین لوئلوئو، برکیاروق و توتوش..تاد، لە دوای ئەم قۆناغانە قۆناغی تر جێگای نابێتەوە لەناو ئیسلامدا، دەبێت بگەرێتەوە بۆ سەرچاوە سەرەکییەکە کە سیستەمە ڕاشدینەکەیە..

ئەمەش دەقی ئەو فەرموودەیە کە ئەلبانی – ڕەحمەتی خوای لێبێت- بە ڕاستی داناوە لە ئیمامی ئەحمەدەوە– ڕەحمەت و درودی پەروەردگار بۆ سەر گیانی- ڕیوایات کراوە ئەو سیستەمەیە کە سەروەرمان باسی دەکات ﷺ (تکون النبوة فیکم ما شاء الله أن تکون، ثم یرفعها الله إذا شاء، أن یرفعها ثم تکون خلافة علی منهاج النبوة، فتکون ما شاء أن تکون، یرفعها إذا شاءأن یرفعها، ثم تکون ملکاً عاضاً فتکون ما شاء الله أن تکون، ثم یرفعها إذا شاء أن یرفعها، ثم تکون ملکاً جبریاً، فتکون ما شاء الله أن تکون، ثم یرفعها إذا شاء ثم تکون خلافة علی منهاج النبوة ثم سکت)

تێبینی: هەندێك پێیان وایە کە لە دەسەڵاتی «جەبابیرەکان» واتا دەسەڵاتی زوڵم و زۆر کە سەروەرمان ﷺ باسی لێوە دەکات مەبەست پێ عەلمانیە، ئەمە لاڕاستیدا وانیە، چونکە ئەگەر تەماشای سیستەمەکە بکەین هەمووی بەدوای یەکدا ئیسلامییە و خەڵکی موسڵمان حوکمڕانی دەکات، بەڵام ئەگەر هاتوو ناو و ناتۆرەی ئەم بەرنامەنەی لە ناو عالەمی ئیسلامیدا پیادەکرا و بەڵام هەر سیستەمەکە حاکمیەتی ئیسلام بوو، ئەوا دەشێت بە سیستەمە جەبرییەکەی (ئیستبدادی) موسڵمان هەژمار بکرێت، سیستەمی عەلمانی و سیستەمی دیموکراسی و سیستمی سەرمایەداری.. هتد، ئەوانە هیچ بە ئیسلام هەژمار ناکرێت، هیچ پەیوەندی بە ئایینی ئیسلامەوە نیە، بۆخۆیان بەرنامەوە تایبەتمەندی خۆیان هەیە.

لێرەدا گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی کە بە فەرموودەی خوای بەرزو باڵاو فەرموودەی سەرەرمان پێغەمبەر ﷺ، ئیسلام خاوەنی سیستەمی ئیسلامییە هیچ ناوێکی تر هەڵناگرێت، لەسەر ئەو چوار بنەمایەی ئاماژەم پێداوە لەسەرەوە سیستەمە ئیسلامییەکە دادەمەزرێت( حاکمیەتی خواو، دادپەروەری و یەکسانی، پابەند بوون بە گرێبەستی فەرمانڕەوایی

کۆمەڵایەتی ئیسلامی، ڕاوێژو شورا)، قورئانیش بۆ خۆی لە ناو کۆمەڵگا و کایەی سیاسەتدا کار لەسەر ئەو چوار تەوەرە دەکات.

کەواتە شیاوترە بڵێین ئێمە خاوەنی سیستەمی پێگەشتووین، نەك دیموکراسی، چونکە لەسەردەمی خیلافەتی پێگەیشتوو(ڕاشدین) کە (٣٠) ساڵی خایاندوە باسی ئەوە دەکاتەوە بۆمان پێغەمبەر ﷺ لەسەر مەنهەج و ڕێبازی پێغەمبەرایەتی بوون (خلافة النبوة ثلاثون سنة)، بەڵام لە ماوەی ئەم ٣٠ ساڵیدا کە خەلافەتی پێگەیشتوو بوون، کوشتنی نێوانی هەوەڵان و شەڕی فیتنە و هەڵگەڕانەوە لە ئایین و دروست بوونی دەیان جۆر لە بیروباوەڕی جیاواز ڕوویداوە و دروست بووە..

پرسیار ئەوەیە.. ئەی چۆن ڕاشدین و پێگەیشتووە؟ چۆن لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بووە ئەم هەموو ناڕەحەتی و جەنگ و کوشتار و فیتنەیەی تێدابووە؟

موعجیزەی سیستەمە ئیسلامییەکە لێرەدا دەردەکەوێت..

چـــــۆن؟

پێغەمبەری ئازیز ﷺ تەمەنی سیستەمە سیاسییەکەی ٢٣ ساڵ بووە.

خیلافەتی ئەبوبەکر –ڕەزامەندی خوای لێبێت- ٢ ساڵ و سێ مانگ بووە.

خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب– ڕەزامەندی خوای لێبێت- ١٠ ساڵ و شەش مانگ بووە.

خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان–ڕەزامەندی خوای لێبێت- ١٢ ساڵ بووە.

خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب– ڕەزامەندی خوای لێبێت- ٤ ساڵ و حەوت مانگ بووە.

خیلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی - ڕەزامەندی خوای لێبێت- شەش مانگ بووە.

تێبینی ئەو مانگەی نادیارە دابەش دەکرێتەوە بەسەر ئەو ڕۆژانەی دەسەڵاتی هەر پێنج خەلیفەکە.

باشترین سیستەمی سەر زەوی ئەم ( ٥٣ )ساڵەیە، ئەم سیستەمە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەتاکو حەسەنی کوڕی عەلییە، چونکە لە ژیانی هەموو موسڵمان و دەستە و کۆمەڵ و دەوڵەتێکدا ئەم ٥٣ ساڵە دووبارە دەبێتەوە، هەرچی تێیدا ڕوویداوە چارەسەری بۆ دۆزراوتەوە، کێشەکانی بە باشترین شێوە چارەسەرکراوە، کەواتە بۆ ئەم ٥٣ ساڵە باشترین سیستەمە و بە پێگەیشتوو ناوبراوە؟، ئەگەر چی ئەو هەموو ڕووداوە ڕوویداوە تێیدا، بەهۆکاری ئەوەی لە ژیانی هەموو موسڵمانێك ئەم ٥٣ ساڵە هەر دەبێت دووبارە بێتەوە، ئیتر هەیە قۆناغی ئەبوبەکری لی دووبارە دەبێتەوە، هەیە سەردەمی عوسمان..هتد.، بەڵام دەتوانین بە هاوشێوەی ئەوان بە ڕەوشی ئێستا چارەی بکەین ببێتە ئەزمونێك..

کەواتە ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە وسوننەتی خوای گەورەش گۆڕانگاری بەسەردا نایەت.

فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ فاطر

جا ئەگەر دیموکراسی وەك ئیوە دەڵێن: ئەوەندە باشە.. ئیتر بۆ شوێنکەوتوی موحەممەد بین، دەڕۆین شوێن ئەرستۆو ئەفلاتوون دەکەوین، کە ئەوانە پەییان بەم دیموکراسیە بردووە، وەك برایەکی ئیسلامی لە مەڕ خۆمان دەڵێت شورای ئیسلامیش بێ دیموکراسی بوونی

نیە، ئیتر بۆ شوێن کەوتووی سەروەری مرۆڤایەتی بین ئەم ئایینە واز لێدێنین! پەنا بەخوا دەگرم لەو قسەیە. ئەوە بۆ بزواندی ئێوەی خوێنەرە وتەکەی ئەو دووبارە دەکەمەوە.. ئادەی ئێوە پێم بڵێم ئەم قسەیە لە کوێی دیندا جێگای دەبێتەوە..

لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموویێت.. لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ الأحزاب.

مەگەر هەرچی لەژیانماندا هەیە بەندایەتی نییە؟، بەڕێوەبردنی دەسەڵات و سیستەمە، هەر بەندایەتی نییە؟، ئەی ئەگەر چاو لە موحەممەد کەین، چاو لە کێ بکەین کێ هەیە لەو باشتر؟

ئینجا ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی شەر لەگەڵ دیموکراسی بکات هەر لەسەرەتای قوڕەیشەوە..

ئەگەر تەماشای «دارولنەدوەی» قوریش بکەین، دەبینیت وەك بینای پەرلەمانی ئێستا وا بوو، هەردوولا جێگای کۆبوونەوەی نوخبە و پیاو مەعقولان سەردەمی خۆیانن، سەردەمی قوڕەیش هەر گەل و هۆزە بە گوێرەی قەبارە و توانا و دەسەڵات و پارەوە سەرباز و میلیشیاکانیان دەچوونە ناو ئەو دارولنەدوەیەوە، گەورەترین قەبیلە بەنی هاشم و بەنی مەخزوم بوون، لەگەڵ هەندێك لە هۆزەکانی تر و کەمە نەتەوەکانی دەوروبەی قوەڕیش کە بە ئەحباش و عەرەبی بادیە ناسراو بوون، جاروبار ئەوانیش نوێنەری خۆیان دەنارد..

پەرلەمانی ئێستا لەسەر بنەمای حیزب کۆبۆتەوە، هەریەکە نوێنەری خۆی دەنێرێتە ئەو جێگایە بەگوێرەی قەبارە و توانا و دەسەڵات و پارە و میلیشیا و...تاد، زۆرتر وردی ناکەمەوە، ئەگینا ئەوەندە لە یەکەوە نزیکە، جاری واهەیە بە تاڵەموو جیاوازی لە نێوان سیستەمی جاهیلی قوریش

و سیستەمی دیموکراسی ئێستا ناکەیت، ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە هەمیشە دووبارە دەبێتەوە، چونکە هەموو باسێك لە ناو ئایینەکەماندا کراوە لە ڕێگای قورئان و سوننەتەوە بەتەواوەتی باس کراوە خوای گەورە دەفەرموویت: وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ الكهف.

کەواتە کە پێغەمبەرمان ﷺ بانگەوازی دەستپێکرد دژی سیستەمەکەی قوریش بوو. هاتنە لای داوایان لێکرد کە ئەو چی دەوێت هەموو قوریش ئەیدەنێ، دەیکەنە گەورەی خۆیان و پارە و سەروەت و سامانی لە هەموویان زیاتر بێت، کام ئافرەتەی خاوەنی جوانی و نەسەبی بەرزە دەیبەخشن بە پێغەمبەر ﷺ.

وەڵامی پیغەمبەر بۆ سیستەمەکە چی بوو؟

- فەرمووی ئەگەر ڕۆژ ومانگ لای ڕاست و چەپم بێت، واز لە بانگەوازەکەی خۆم نهێنم.

ئیسلامیە دیموکراسیخوازەکان ڕێك وەك ئەو ڕەوشە وان کە ئاماژەم پێدا.

چـــــــــۆن؟

ئەگەر بە پێوەری ئێوەی ئیسلامیی بێت ئێستا دەڵێن: هەلێکی (چانسێکی) باش هەڵکەوتووە با بڕۆینە ناو ئەم کایەی سیاسییەوە تا لەو ڕێگاوە کارەکەی خۆمان ئەنجام بدەین..

بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی نەدا، لەبەر ئەوەی سیستەمە سیاسییەکەی ئەو جیاواز بوو لە هەموو داواکاریەکانی قوڕەیش، ئەو بۆ خۆی خاوەنی

سیستەمێکی تربوو، ئەمە خاڵی جەوهەرییە، وەڵامی پرسیارەکە دەستە بەردەکات، کە ئیسلام لە هیچ ناچێت نە لە دیموکراسی، نە لیبراڵی، نە لە هیچ بەرنامە و سیستەمێکی تری دونیای جاهیلی، بەڵکو نە شەرقیە و نە غەربیە.. ئیسلامیە و ئیسلامیە، ئەم دروشمە زۆر جوانە سەید قوتب و هاوڕێکانی لە زینداندا دەیانووتەوە، پاشان لە دوای فەتحی مەکە دارولنەدوە ئەرزشی نەما و فرۆشرا بە کەسێك کردی بە تەویلەی ئاژەڵ.

**هاتنی ئەم بیرە بۆ ناو ئیسلامییەکان و موسڵمانان :**

ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی موحەممەد عەلی پاشا و ڕفاعە طەهطاوی لە فرنساوە هیناویانەتە ناو وڵاتانی ئیسلام و دوای ئەوانیش جەمالەدین ئەفغانی.. تاد..

ئەمان بۆخۆیان هەموو لە ڕۆژئاوادا ژیاون لەسەردەمی کۆتایی دەسەڵاتی خیلافەتی ئیسلامی بووە کە لەکۆتایی تەمەنیدا هەموو ڕەهەندەکانی سیستەمی خیلافەی لەدەست دابوو بە هۆکاری ئەو هەموو پلان و شەڕەی بە خیلافەت دەفرۆشرا، بۆ دواجار سوڵتان عەبدولحەمید خیلافەتکەی گەڕاندەوە بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ درێژەی پێداوە لە ڕێگای سوارەی حەمیدیەوە.. ئیتر بۆ دواجار تەرەقییەکان و مەحفەلە ماسۆنی و لیۆنی و یەهودی دەۆنمە توانیان ئەو سیستەمە لابەرن.. چونکە ئەوان کە هاتن بە عەلمانی توانیان هەر ئیسلام لەسەر شانۆی سیاسی لابەرن بۆ ماوەی چەند ساڵێك، ئەگەر هێز و توانای ئیسلامەکە خۆی نەبوایە ئەوان پلانیان وادارشتبوو کە لەڕەگەوە هەڵیکەنن، سیستەمی ئەم دیموکراسیە کە ئێستا بانگەشی بۆ دەکەن لە جێگایدا دابنێن.

طەطهاوی پێیوابوو کە ئێستا مەکانەتێك و جێگایەکی بەرزی هەیە دیموکراتی لە ناو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، ئیسلامیش دەتوانێت بەکاری بێنیتەوە لە گەڵ شوڕاکەیدا بیگونجێنیت، بۆ ئەوەی لە ناو کۆمەڵگای نێودەوڵتیدا ئیسلام خۆی بارگاوی بکاتەوە بە دیموکراتی وەك ئایدۆلۆژیا..

خۆی لە بنەڕەتەوە ئەم بیرو بۆچوونە هەڵەیە کە بەم شێوە دیموکراتی و شوڕا بەیەك بشوبهێنین..

بنەمایەکی سیستەمی ئیسلامی- بریتییە لە شوڕا- مرۆڤ ناتوانێت لە هەموو شتێکی ئەم سیستەمەدا قسەکەر بێت، ئەوەی کە داڕێژراوە کۆنکرێتیە پێیدەوترێت دەقی موحکەم و لە بیروباوەڕ و ئەو دەقانەوەیە کە بە ئاشکرا و بە ڕوونی قسەی لەسەر کراوە، ئەمە بەهیچ شوڕاو بیروڕای مرۆڤ هەڵناگرێت مرۆڤ دەبێت ئیسلام بێت بەم یاسایانە، چەمکی ئیسلامەکە بۆ خۆی واتای پابەندبوونە بە یاساکانی پەروەردگارەوە کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)..کەواتە شوڕا ئەو بەشەیە کە خوای گەورە بە جێیهشتوە بۆ بیروڕای مرۆڤەکان..

سیستەمی دیموکراتی- قسە دەکات لە هەموو شتێکی مرۆڤ ئەم خۆی بە ڕابەر و دەمەزرێنەری یاسا دەزانێت.. لە هەموو بوارەکانی ژیاندا کە مرۆڤ ئەقڵی خاوەنی ئەو ئیرادەیە کە یاسا بۆ مرۆڤەکان دابنێت، هیچ پیرۆزییەك نییە لەسەرو مرۆڤەکانەوە تەنانەت خوا بۆی نییە دەستکاری ئارەزوەکانی مرۆڤ بکات، مرۆڤ خۆی خاوەنی خۆیەتی.!

جیاوازییەکان ئاسمان و ڕێسمانن، ئەشێت لێکچوونێك هەبێت لە نێوان شوڕا و دیموکراتیدا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دووانە وەك یەك بن هەروەك ئاماژەم پێدا، هەریەکە لە جێگایەکەوە سەرچاوەی گرتووە کە دیدی

فەلسەفییان زۆر لەیەكتر جیاوازە.

د. ڕاغب سەرجانی دەڵێت: «دیموكراتی وەك تەلێكی كەرەبای ڕووت وایە كە وزەی كارەباكەی پێدا دەڕوات، چەندە ئەو هێزە و تەلە كارەبایە باش و سوودی لێوەربگرین بۆ ژیان، بەڵام كە دەست بەریكەوت دەست بەجێ ئازاری مرۆڤەكە ئەدات، یان دەیكوژێت، بەڵام شوڕای ئیسلامی ئەو وایەرەیە كە پارێزەری تەلەكە و وزەكە و مرۆڤەكەشە»، ئیسلام هاتووە مرۆڤ و ئەقڵی بپارێزێت، تا تووشی كارەسات نەبێتەوە، ئێستا تا ڕادەیەك هەست دەكەم كەپەیامەكەم ڕوون بێت.

پاشان لە ڕووی سیستەمیشەوە جیاوازیە جەوهەریەكان دەخەمە ڕوو لە نیوانی ئیسلام و دیموكراتی..

دیموكراسی ئێستاكە بارگاویە بە لیبرالیزم وەك فیكر كە دیدی بۆ گەردوون و مرۆڤ و ژیان و جیهانبینی تایبەتی خۆی هەیە..

بەكورتی بنەماكانی ئەم سیستەمە بریتین لە..

**یەكەم:** دیدو تیڕوانی تایبەتی و جیهانبی خۆی هەیە بۆ گەردوون و مرۆڤ و ژیان وەك فیكر..

**دووەم:** مەرجەعیەتی یاسا بە ڕەهایی بۆ گەلە، هەر تەنها گەل سەروەر بێت..

**سێیەم:** گرێبەندی كۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای (حاكم و مەحكوم) كە پێیدەوترێ دیموكراتی..

**چوارەم:** منهەج و پیادەكردنی ئالیەتی كاركردنی لە ڕێگای پەرلەمانەوەیە..

**ئیسلام و سیستەمەکەی بریتییە :**

**یەکەم:** ئایینێکی پڕو هەمەلایەنەیە وتەی تایبەتی هەیە لەسەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیان، جیهانبینی ئەویش تایبەتە بەرانبەر بە گەردوون و مرۆڤ و ژیان..

**دووەم:** مەرجەعیەتی یاسا دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و لەسەربنەمای نەگۆرەکان کاردەکات کە سەرچاوەکەی خواو پێغەمبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم) و پاشان دەگەرێتەوە بۆ شەرعزانەکانی و شارەزای بوارەکان و خاوەن تایبەتمەندییەکان، بۆ دەرهێنان و هەڵهێنجانی یاساو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە چوارچیوەی سەوابیتەکانی (نەگۆڕەکانی) شەریعەتدا (مقاصدها العامة)مەبەستە گشتیەکانی.

**سێیەم:** گرێبەندی کۆمەڵایەتی لە نێوانی حاکم و مەحکومدا ڕێکدەخرێت بە گرێبەندێکی ئیمانی لەگەڵ خوای موتەعال بەم گرێبەندە کۆمەڵایەتییە لە ئیسلامدا دەوترێت بەیعەت.

**چوارەم:** مەنهەج و ئالیەتی کارکردنی لە ڕێگای دامەزراوەکانیەوە پیادە دەکرێت، ئەویش.. شوڕایە

کۆتایی قسە بەوە دێنم لە دیموکراسیدا مەنهەجی زۆرینە جیگای بایەخە و قسە ڕۆشتوان زۆرینە فەرمانداری و قەڵەمڕەوییان هەیە، فەزڵی زۆرینە بەسەر کەمینەدایە، هەرچەندە دەڵێت مافی کەمینە تێیدا پارێزراوە..بەڵام لە کۆتاییدا هەر زۆرینە خاوەن بڕیارە..

بەڵام لە ئیسلامدا زۆرینە زەم کراوە، زۆرینە هەموو شتێکی لێوەرناگیریت..

لَقَدْ جِئْنَاكُمْ بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴿٧٨﴾ الزخرف

وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ يوسف

مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ الدخان

هەندێك کەس پێیان وایە کە ئیمامی عومەر دیوانی کیسرای وەرگرتوە ئەمە گونجاوە بۆ ئەوەی ئێمەش دیموکراسی وەربگرین، چونکە ئیمامی عومەر ڕەزامەندی خوای لێبێت سوودی لە دەواوین وەرگرتوە.

ئەمەش لە ڕاستیدا وانیە، بەڵکو ئەم شیکاریە بچووکە دەخەمە بەردەم ئیوەی خوێنەر بۆ زانیاری زیاتر ئیوەی بەرێز دەتوانین لە داهاتوودا زیاتر بنووسین لەسەر ئەم باسە.. سەرچاوەی باسەکەی من لە ژیانی پێشەوا عومەرەوە وەرمگرتوە لە (د. محمد علي الصلابي و د، ڕاغب سرجاني)

**یەکەم:** دیوان پەیوەندی بەسەر سیستەمی ژماردنەوە هەیە، نەك وەزارەت..

**دووەم:** وشەکە فارسیە، بەڵام ڕۆمیش بەکاری هێناوە..

**سێیەم:** بێخی وشەکە پێشەوا عومەر گۆڕیویەتی، وشەی دیوان ئەصلی موستەعرەبە خۆی ناوی دەواوین بووە..

**چوارەم** : ئەم وشەیە هیچ پەیوەندی بە فیکرو جیهانبینییەوە نیە..

**پێنجەم:** دیوان تەنها وەك وشە سوودی لێوەرگیراوە، عومەر پێڕازی نەبوو تا گۆڕیان لەسەر وتەی هاوەڵێکی بەرێز بەناوی وەلیدی کوڕی هیشام.

**شەشەم:** دیوان هیچ پەیوەندی بە بیروباوەڕ و حاکمیەتی خوای گەورەوە نیە، پێوەر ناکرێت بۆ وشەی دیموکراسی، چونکە دیموکراسی جیهان بینی هەیە بۆ گەردوون و مرۆڤ و ژیان..

**حەوتەم:** وشەکە بەمانای «سجل» دێت واتا بە کوردی خۆمان دۆسیە،

هەرچەندە ئەم وشەیە فارسییە کورد بەکاری دێنیتەوە، واتا هیچ پەیوەندی نیە بەسەر سیستەمی سیاسی..

**هەشتەم:** هورمزان باسی ئەم سیستەمی ژمارەیە دەکات بۆ عومەر، بەڵام عومەر دەڵێت: نابێت هیچمان لەوان بچێت.. لێرەدا من دەڵێم: ئادەی وەرن ئەوەی کە ئەم وتەیە بەکار دێنێتەوە دەڵێت: عومەر- ڕەزامەندی خوای لێبێت- سوودی لە دەواوین وەرگرتوە، وەرن پیوەرێکمان بۆ بکەن بە دیوانی عومەری و پاشان فارس و ڕۆمیش، چیان لەیەك دەچێت؟

**نۆیەم:** خالیدی کوڕی وەلید سەرەتا ئیشارەتی کرد بە وشەکە، هورمزان شیکردنەوەی دایە عومەر کە بۆخۆی مانای چییە، ئینجا هاوەڵێکی تر هەڵساو فەرمووی ئەی عومەر: يدونون ديواناً لهم فدون لنا ديواناً.. واتا ئەوان شوێنی ژماردە و پەڕوێنیان هەیە، تۆش بۆ ئێمە لە بیتول مال ژمارە و هاتن و چوونێکمان بۆ دەست نیشان بکە..

**دەیەم:** هەموو ئەم باسەی کە کردمان چی پەیوەندی هەیە بە حوکمڕانی و یاسا و سەروەری شەرع، کە لەڕاستیدا زانایان دەڵێن وەك د.محمود دعبيس و ڕاغب سەرجانی ئاماژەیان بەوە کردووە هیچ لێکچوونێك لە سیستەمی ژماردەی بەیتولمالی موسڵمان و فارس هیچ پەیوەندییان بەیەکەوە نیە..

ئینجا من پێوەرێك بۆ ئەوەی دیوان و دیموکراسی لەیەك جیابکاتەوە، کە ئەو سیستەمی سیاسییە واتا حاکمیەتی خوای گەورەیە لە بیروباوەڕ (عەقیدە) سەرچاوە دەگرێت، ئەوی تر وەك وانەی بیرکاری و جەبر و هەندەسە وایە، با زیاتر ڕوونی بکەمەوە، ئەگەر ئێمە خیلافەتی ئیسلامی دابمەزرێنین دەبێت یاسای هاتوچۆ (ترافيك- مرور) بەکاربهێنینەوە لە

سیستەمەکەی خۆماندا کە خیلافەتە، ئەم یاسای مرورە هیچ پەیوەندی نیە بەسەر بیروباوەڕوە، بەڵکو ئەوە یاسای ڕێکخستنی هاتوچۆیە، دیوانیش یاسای ژمارەیە وەك ئەوە وایە موحاسیبێك بێنی بە سیستەمی ئەوروپی حیسابت بۆ بکات یان ئەمریکی یان ئیسلامی، ئەمە زانستە نابێتە سیستەمی هیچ لایەك، ئەمە مرۆڤەکان بەشدارن تێیدا واتا کاری (بەڕێوەبرنە) ئیدارییە حیسابا لە هەموو دوونیا هەریەکە، ئەگەر دەڵێن دیموکراسی ئیدارییە و ئالیەتە، تۆ بڵێیت ئیسلام خۆی ئیدارە و ئالیەتی نەبێت، ماوەی ١٤٠٠ حکومرانی کردووە؟ کە بۆ خۆی ئەم وتەیە بەتاڵە هیچ بنەمایەکی زانستی نیە.

## شـوڕا و دیموکراسی :

شوڕای ئیسلامی، ئەو زاراوە سیاسییە ئیسلامییەیە کە سورەتێکی بە ناو نراوە، ئەگەر باس لە فەرمانڕەوای ئیسلامی بکرێت توخمێکی گرنگی ناو ئەو سیستەمە ئیسلامییە شوڕایە، کە وەك نوێژ و ڕۆژوو و حەج و جیهادو هەموو واجیباتی تری ئیسلامی پێویستکراوە لەسەر موسڵمانان، لە نێوانی دوو هاورێیەوە دەست پێدەکات تا خێزان و گەورەتر بۆ کۆڵان و گەڕەك و پاشان گەورەتر بۆ شار و دواتر بۆ شارەوانی و دەسەڵات و حیزب و کۆمەڵ و گروپ و ڕەوتەکان تا- دەگاتە بەرزترین پلەی دەسەڵات و سەرۆکی وڵات و یاخود خەلیفەی موسڵمانان، کە دەبێت پابەند بێت بە ئەنجامی شوڕاوە لە قورئانیشدا لە زۆر جێگادا باس لە شوڕاو گرنگی شوڕا کراوە، تەنانەت پێغەمبەری خوا پابەند بووە بە ئەنجامی شوڕاوە ئەگەر چی بە دڵیشی نەبووبێت.!

لە شەڕی ئوحودا داوای کرد کە نەڕۆنە دەروەی شاری مەدینە لەناو شاردا بەرگری بکەن، بەڵام- سەربازیەکانی چواردەوری پێغەمبەرمان

ﷺ وەك مامی بەرێزیان «حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب» و»محمدی کوڕی مەسلەمە» و زۆرێکی تریان لە ئەنسار و موهاجیرین -ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت- داوایان کرد کە بڕۆنە دەروەی شاری مەدینە، چونکە سەروەرمان شورای بە خاوەن ئەزمونەکان و تایبەتمەندەکان کرد لەوبوارەدا، بۆیە دابەزیە سەر بۆچوونەکانیان، فەرمانی پێنەکرابوو وەك وەحی کە شوێن وەحی بکەوێت، پاشان پێغەمبەری خوا دابەزی بۆ ئەنجامی شوڕا.. کە چوونە دەروەی شاری مەدینە بوو، دوای ئەوەی کە شکست هات بە سەرموسڵماناندا پەرتەوازەی هات بەسەریانداو بڵاوەیانکرد و زۆربەیان ڕایانکرد لە موسڵمانان، بەڵام سەروەرمان نەیفەرموو کە بە قسەی منتان نەکردووە چوونەتە دەروەی شاری مەدینە، نا- بەڵکو_ لەسەر (شاخی ڕەمات) بە قسەی خۆشەویستمانیان ﷺ نەکرد، سەرەتا سەرکەوتو بوون کە سەنگەرکەی خۆیان بەجێنەهێشت، کە دابەزینە ناو جەنگەکە و پشتیان چۆڵ بوو.. ئینجا شکستیان هێنا، کەواتە هۆکار شوڕا نەبوو، بەڵکو سەرپێچی بوو لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرﷺ، بەڵگەیەکی بەهێزتر ئەوە بوو لە دوای کۆکردنەوەی هێزەکەی دیسان خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: شوڕایان پێبکە..(وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) ئەم ئایەتە لە ئالیعیمران دابەزی کە باس لەو ڕووداوەی ئوحود دەکات، پاشان ئەوەی کە سوپاکەی کۆکردەوە و ڕێکیخستن و سەرکەوتنی بەدەست هێناو دوای سوپای قورەیش کەوتنەوە لە «ئەسەدولحمراء» و سێ شەو سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە و بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە ناوشاری مەدینە.. هەموو ئەم کارانە بە شوڕا بوو، پەیامی من لەم سەرەتایی باسەدا ئەوەیە کە شورا فەرزە، هۆکاری شکستیش نابێتە ئەوەی کە تاوان بخرێتە سەر شورا، وەك ئەوە وایە کەسێك لە کاتی جەنگدا نوێژ بکا و لە دواوە

بپێکرێ و شەهید بێت، هەرگیز ناشێت بڵێین نەدەبوو نوێژی بکردایە! شوڕا فەرزە لە سەر موسڵمانان، ئومەتی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر کاری خراپ شوڕا ناکات و کۆنابێتەوە.

کەواتە، شوڕاو دیموکراتی دوو شتی زۆر جیاوازن...

شورا- ماناو مەدلولات و تێڕوانین جیاوازە و لە ئیسلامەوە بنەمای فەلسەفی و فیکری وەرگرتووە، یاخود لە ئایین و وەحیەوە سەرچاوە دەگرێت..

دیموکراتی- بەهەمانشێوە لە تێڕوانیو فەلسەفە و فیکری ئایینی یۆنانیەوە سەرچاوەی گرتووە، هەرچەندە سەرچاوەی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ هیندستان، بەڵام بنەمای دیموکراتی لەو سیستەمە سیاسیەوە سەرچاوەی گرتووە کە فرەخوایە ئەفسانەکانی یۆنان سەپاندیان بەسەر ئەو ڕەوشەدا، لە یۆنانی کۆندا فرەخوای هەبوو، دەبوو، لەم خوایانەوە سەرچاوەی یاسا وەربگرن، بەڵام چونکە خواکانیان هەمووی داتاشراو بوون گەورەی خواکەیان «ژوپیتەر» بتێکی گەورە بوو..هیچ سەرچاوەی یاسای لێوەرنەدەگیرا، ناچار ئەم دیموکراسییە لە ڕێگای زانا و فەیلەسوفەکانیانەوە هاتە ئاراوە بۆ ئەوەی لەو تەنگەژەیە دەربچن، ئەو دەمە خەڵکی نوێنەری خۆیان هەڵدەبژارد، هەر شارە لە یۆنانی کۆندا فەرمانڕەوایەکەی بەم شێوەیە بوو.. لە سەردەمی فەلسەفەی کلاسیکەوە دەست پێدەکات تا ئەفلاتون و سوقرات تا ڕادەیەك گرنگی پێ دەدرێت، ئەوەی لای خەڵکی ئێمە کە باس ناکرێت، ئەوەیە فەیلەسوفێکی تر دێت ئەم سیستەمە لا دەبات، گوایە ئەو خەڵکە بە نەزانی خۆیان.. خەڵکی مشەخۆری نوخبە بەسەر خۆیانەوە دروست دەکەن، بۆیە لەو دەمەوە

ئەدەبیاتی دیموكراتی تا سەردەمەكانی ڕێنسانس باو و مۆدێلی نیە.. بە مشەخۆری و سیستەمی خراپ باسی لێوەكراوە، لە بەردەمیدا سیستەمی پاشایەتی بە باشترین سیستەم دانراوە، ئەمەش لە دیدو بۆچوونی فەیلەسوفی گەورەی ئەودەمەوە سەرچاوەی گرتوە كە «ئەرستۆیە“.

جیاوازیەكە بە گەورەتر نیشان ئەدەم لەم دوو سیستەمەدا..

سیستەمی ئیسلامی- بنەمایەكی بریتیە لە شوڕا- مرۆڤ ناتوانێت لە هەموو شتێكی ئەم سیستەمەدا قسەكەر بێت، ئەوەی كە داڕێژراوە كۆنكرێتیە، پێیدەوترێت دەقی موحكەم و لە بیروباوەڕ و ئەو دەقانەوەیە كە بە ئاشكراو بە ڕوونی قسەی لەسەر كراوە، ئەمە هیچ شوڕاو بیرو ڕای مرۆڤ هەڵناگرێت مرۆڤ دەبێت ئیسلام بێت بەم یاسایانە، چەمكی ئیسلامەكە بۆ خۆی واتای پابەندبوونە بە یاساكانی پەروەردگارەوە كە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەكەی موحەممەد ﷺ كەواتە شوڕا ئەو بەشەیە كە خوای گەورە بە جێهشتوە بۆ بیروڕای مرۆڤەكان..

سیستەمی دیموكراتی- قسە دەكات لە هەموو شتێكی مرۆڤ ئەم خۆی بە ڕابەرو دامەزرێنەری یاسا دەزانێت.. لە هەموو بوارەكانی ژیاندا كە مرۆڤ ئەقڵی خاوەنی ئەو ئیرادەیە كە یاسا بۆ مرۆڤەكان دابنێت، هیچ پیرۆزییەك نیە لەسەرو مرۆڤەكانەوە تەنانەت خوا بۆی نیە دەستكاری ئارەزووەكانی مرۆڤ بكات، مرۆڤ خۆی خاوەنی خۆیەتی.!

كەواتە ئەوەی دەڵێت شواری ئیسلام و دیموكراتی وەك یەكن، من وا هەست دەكەم لە گوێی گایە خەوتووە، ئەگەر هەر ئینكاری كرد دەڵێم نا ئەمجارە گا لە گوێی تۆدا خەوتووە.

جیاوازیەکان ئاسمان و ڕێسمانن، ئەشێت لێکچوونێك هەبێت لە نێوان شوڕا و دیموکراتیدا، بەڵام لە ڕاستیدا جاهیلیە ئەم دوانە وەك یەك بن، هەروەك ئاماژەم پێدا هەریەکە لە جێگایەکەوە سەرچاوەی گرتووە کە دیدی فەلسەفییان زۆر لەیەکتر جیاوازە.

د. ڕاغب سەرجانی دەڵێت: «دیموکراتی وەك تەلێکی کارەبای ڕووت وایە کە وزەی کارەباکەی پێدا دەڕوات، چەندە ئەو هێزە و تەلە کارەبایە باش و سوودی لێوەربگرین بۆ ژیان، بەڵام کە دەستت بەری کەوت دەست بەجێ ئازاری مرۆڤەکە ئەدات، یان دەیکوژێت، بەڵام شوڕای ئیسلامی ئەو وایەرەیە کە پارێزەری تەلەکەو وزەکە و مرۆڤەکەشە»، ئیسلام هاتووە مرۆڤ و ئەقڵی بپارێزێت، تا تووشی کارەست نەبێتەوە، ئێستا تاڕادەیەك هەست دەکەم پەیامەکەم ڕوون بێت.

## دەوڵەتی ئیسلامی ناسراو بە (داعش) بناسە

دەرکەوتنی ئەم ڕێکخراوە کە ئێستا ناسراوە بە « دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام» موخابەراتی سوری یەکەمجار ئەم ناوەی بۆ کورتکردنەوە و ناساندنی بە (داعش)، ئەم کۆمەڵە لە مانگی چواریساڵی (٢٠١٣) دەرکەوتن، سەر بە ڕیکخراوی قاعیدە بوون، لە ئەنجامی یەکگرتنیان لەگەڵ بەرەی نووسرە لە مانگی (٢) ساڵی (٢٠١٤) دا، دوای ماوەیەکی کەم ئەم ڕێکخراوی داعشە وتی: هەموو ڕیکخراو و باڵە سەربازییەکەی لەناو مندا تواونەتەوە، هیچ شەرعییەتێکی نەماوە، لەوکاتەوە بوون بە دوو دەستەوە، جەنگان لەگەڵ یەکتری بەسەرکردایەتی هەردوو سەرکردەی ڕێکخراوەکانی نووسرە و داعش کە ناسراون بە «جولاني» و "بغدادي» تا ئەمڕۆ بەردەوامە.

لە هەمانکاتدا داعش بە ئاشکرا ڕەدی کردەوە کە لە ژێر سایەی ڕێکخراوی قاعیدەدا بێت و بە هەموو شێوەیەك وتەکانی» د. ئەیمەن زەواهیریان " بەرپەرچدایەوە کە ئەو داوای لە نووسرە کرد کە مەیدانی سەربازیی لە سوریادا بێت و داعش تەنها چاوی لەسەر عیراق بێت و سوریا واز لێبێنێت بۆ نووسرە.

- یەکەمجار داعش لە عێراقدا کاری دەکرد لە ژێر ناوی «کۆمەڵەی تەوحید وجیهاد» (جماعة التوحيد والجهاد) دوایی گۆڕا ناوەکەی بۆ «قاعیدەی وڵاتی ڕافیدەین» لەو دەمەوە «ئەبو موسعەبی زەرقاوی" سەرکردایەتی ئەم ڕێکخراوە دەکات لە ساڵی (٢٠٠٤)ەوە بەیعەتی داوەتە سەرۆکی قاعیدە «ئوسامە بن لادن» هەر لەسەرەتایشەوە کە ناسرا

جیاواز لە کارەکانی قاعیدە لە وڵاتانی تردا، ئەمان لە تۆڕەکانی ئینتەرنێتی دەستیان کرد بە لەسێدارەدان و سەربڕین، بە بیانووی ئەوەی دوژمن دەترسێنن و لێرە بەو شێوە کار دەکەن.

لە دوای کوژرانی زەرقاوی لە مانگی (٧)ی ساڵی (٢٠٠٦) بەدەستی ئەمریکییەکان لە عێراق، دوابەدوای ئەوە کەسێکی تر هەڵبژێردرا بە سەرۆك کە بەناوی»ئەبو حەمزەی موهاجیر«، لە دوای چەند مانگێك تەشکیلی «دەوڵەتی ئیسلامی عێراقی» کرا بەسەرکردایەتی « ئەبوعومەری بەغدادی»، هێزەکانی ئەمریکا توانیان لە مانگی (٤)ی ساڵی (٢٠١٠) دەستیان بگات بە ئەبو عومەری بەغدادی و ئەویش کوژرا؛ لە هەمانکاتدا جێگرەکەشی کوژرا کە ئەبو حەمزەی موهاجیر بوو، ئیتر ئەم ڕێکخراوە «ئەبوبەکری بەغدادییان» هەڵبژارد کە ئێستا خەلیفەی ئەو دەوڵەتەیە.

لە ساڵی (٢٠٠٦) بۆ ساڵی (٢٠١٠) لەو ماوەیەدا دەوڵەتی عێراقی بەسەرۆکایەتی تاڵەبانیی و پاشان ئەمریکا توانرا بۆ ماوەیەکی کاتی ئەم ڕێکخراوە لاواز بکرێت و کارەکانی سنووردار بکرێت، بە هۆکاری ئەوەی هێزی « سەحوە»ی عێراقی دروستکرا کە بریتیبوون لە میلیشیای سوننییەکان، ئەو دەمەش ئەم ڕیکخراوە (٣٤) کەسیان لە سەرکردایەتی ئەم سەحوەیە گرت و کوشت.

لە دوای گەڕانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق لە کۆتایی ساڵی (٢٠١١) دا ” دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق « هەڵسا بە هەڵمەتێکی تەقینەوەی چڕوپڕ لە شارەکانی عێراق و بە تایبەتیش لە بەغدادی پایتەخت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرا، هەر ئەودەمە ئەمریکییەکان (١٠) ملیۆن دۆلاریان کرد بە خەڵاتی ئەو کەسەی کە

ئەبوبەكر بەغدادی بگرێت، یاخود بیكوژێت..، دوابەداوای بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵەی ئەمریكا، ئەم ڕێكخراوە لە كارێكی كەم وێنەییدا، هەڵسان بە ئازادكردنی زیندانیان لە زیندانی تاجیی و ئەبوغرێب، كە دوو زیندانی ناسراون لە عێراقدا، لە ڕووی هێزی ئاسایشەوە تا بڵێی قایم و توند و تۆڵە، كەچی ئەمان توانیان لە ماوەیەكی كەمدا دیوارەكانی بڕوخێنن و زۆربەی زۆری زیندانییەكان ئازاد بەكەن.!

لە مانگی چواری ساڵی (٢٠١١)دا ئەبوكر بەغدادی لە تۆماركراوێكی دەنگیدا ڕایگەیاند: كە بەرەی نووسرە درێژكراوەی ڕێكخراوی دەوڵەتی عیراقییە و ئەم دوو ڕێكخراوە ئێستا لە ژێر ناوی «دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام» كار دەكەن، بەڵام لە دوای ڕۆژێك لە قسەكانی بەغدادی؛ بەرەی نووسرە قسەكانی ڕەفزكردەوە، كە بە هیچ شێوەیەك هیچ یەكگرتنێك لە نێوانیاندا نییە.

لە دوای ئەو بڕیارەی بەغدادی زۆرێك لە بەرەی نووسرە ڕاكێشران بۆ ناو داعش و بڕیاردرا كە چالاكییەكانیان لە سوریادا بێت، توانیان لە ماوەیەكی كەمدا دەستبگرن بەسەر هەرێمی ڕەقە و دەیرزوور، سەرلەنوێ هەمان ئوسلوبی زەرقاویی بەكار هاتەوە لە سەربرین و زیندانی كردن و لە سێدارەدان... بەرانبەر نەیارانیان كە پێشتر هاوسەنگەر و برا بوون.

لە ڕاستیدا ڕیكخراوی داعش خۆی تووشی چەند جەنگێك كرد.. هەر لە ناو خاكی سوریادا:

**یەكەم:** جەنگ دژی نووسرە.

**دووەم:** جەنگ دژی سوپای سووریای ئازاد كە ناسراوە بە بەرەی ئۆپۆزسیۆنی سووری.

**سێیەم:** جەنگ دژی کوردەکان کە ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژئاوایان ئازاد کردووە و لە ئێستادا سەربەخۆن لە بەڕێوەبردندا.

**چوارەم:** جەنگ دژی وڵاتی سووریا و سوپای خوێنڕێژی بەشار.

**پێنجەم:** لەگەڵ خودی قاعیدە دەجەنگان و لە مانگی دووی ساڵی ڕابردوودا واتا (٢٠١٣) توانیان نوێنەری د. ئەیمەن زەواهیری بکوژن لە سووریا.. کە ناسرابوو بە « ئەبو خالدی سووری» بە تەقاندنەوەی بارەگاکەی لە شاری حەلەب.

پاشان لە مانگی دووی ئەم ساڵدا واتا (٢٠١٤) هێزەکانی داعش توانیان سنوورەکان بۆ خۆیان پاك بکەنەوە و بگەنە ناوشاری فەلوجە و ڕومادیی و دوای مانگێك لە جەنگ لەگەڵ سوپای عێراقیدا لە پارێزگای ئەنبار توانیان کۆنرۆڵی ئەو ناوچانە بکەن، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك حکومەتی عێراقی توانی ناوچەکان بگرێتەوە، بەڵام فەلوجە بووە سەنتەری ئەوان و حکومەتی عێراقی نەیتوانی بەهیچ شیوەیەك بچێتە ناو شاری فەلوجە و ئەو شارە لە ژێر دەستیاندا مایەوە.

لە گۆڕانکارییەکی چاوەڕوان نەکراودا لە (١٠) ی مانگی (٦)ی ساڵی (٢٠١٤) داعش هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر ناوچەکانی موسڵ و خودی شاری موسڵ کە دووەم شارە لە عیراقدا بۆ گەورەیی و توانی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەو پارێزگایە بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و هەموو هێزە چەکدارەکانی عێراقی دەرکرد و ڕاوینان و یان جوانتر بڵێم هەر هەڵیوەشاندنەوە و ئێستاش لە عیراق هێزی سەربازی دەوڵەت نییە... بەڵکو هەموو میلیشیاتە کە جەنگ دەکەن، لە پاشاندا توانی بڕواتە ناو ناوەندی عێراق کە پارێزگای سەلاحەدینە و لە باکوری ئەو شارە بچیتە

ناو شارۆچکەی بێجیی کە گەورەترین پاڵاوگەی نەوتی عیراقی لێیە و ویستی پەلاماری کەرکوکیش بدات کە دیارە ئەو ناوچانە دەوڵەمەندن بە نەوت، لە دوای شکستی هێزی عێراقی، بەڵام پێشمەرگە توانی ئەو ناوچانە هەمووی کۆنترۆڵ بکات و نەهێڵێت داعش بێتە ناو کەرکوك و پێشمەرگە توانی کەرکوك و هەندێك لە ناوچە دابڕاوەکان ئازاد بکات.

لە دوای ئەوەی داعش کۆنترۆڵی زۆرێك لە ناوچەکانی عیراقی کرد بە تایبەت پارێزگای ئەنباری سوننی و لە ڕۆژئاوای عێراق لە (٢٩) مانگی (٦)ی ساڵی (٢٠١٤) ئەم دەوڵەتە گۆڕا بە «دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامی» بە سەرکردایەتی یاخود با بڵێین بە خەلیفایەتی ئەبوبەکری بەغدادی کە خەڵکی بەیعەتیان پێدا و تەنها ناوەکە لە ڕێکخراوەکەوە ئیتر گۆڕا بۆ دەولە..

دەوڵەتی ئیسلامی بانگەشەی ئەوەی کرد کە سنوور لە نێوانی عێراق و شامدا نەماوە و بانگەوازی موسڵمانانیان کرد بۆ هیجرەت.. بۆ دەوڵەتی خیلافەت.

دوای چەند ڕۆژێك خەلیفەی ئەو دەوڵەتە خۆی نیشاندا لە یەکێك لە مزگەوتە گەورەکانی شاری موسڵ و داوای کرد لە موسڵمانان کە بەیعەتی بدەنێ، خۆ نمایشکردنیش بە شێوەیەکی زۆر کیبارانە و کەسێکی ڕیش ماش و برنجیی وەك کورد دەڵێت بە عەبا و عەمامەی ڕەشەوە کە هەموو سوننەتی پیغەمبەری لە خۆدا چەسپاندبوو، خوتبەکەشی بێ بیدعە و بە شێوەکی زۆر ئارام و عەرەبییەکی زۆر پاراوەوە پێشکەش کرد.

دوای ئەوەی کە خیلافەت ڕاگەیەنرا مەسیحییەکان لە ناوچەکانی موسڵەوە ڕۆیشتن بەرەو بەغدا و ناوچەکانی تری هەرێمی کوردستان، دوای

ئەوەی سەربازێکی دەرەجەداری بەعسی دەستگیر کرا زۆرێك لە پلانی سەربازییەکانیان لەلایەن بەعسییەکانەوە دادەڕێژرا، ئیتر لەو ساتەوە کێشە لە نێوانی ئەوان و بەعسییەکانیشدا ڕوویداوە، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو ململانێیە لە گەورەبووندایە لەگەڵ بەعسییەکان و میلیشیاکانی عیزەت دووریی.. بە ناوی سوپای نەقشبەندیی.

لە دوای ئەم دەستکەوت و دەسەڵاتەی کە بەدەستیان هێناوە لە ڕووی سەربازیی و جوگرافیا و دیمۆگرافییەوە.. لە ڕووی ئابوورییەوە سەرچاوەی داراییان دەخلی جۆراوجۆریان هەیە، لە وانە فرۆشتنی نەوتی ڕەش لە بازاری ئازاددا و دەستکەوت و پارەی لە دەستیاندایە لە دوای نەمانی هەر دوو حکومەتی عێراق و سوریا، وەك ئەوەی باسکراوە لە ڕاگەیاندنەکانەوە، بۆ هەر ئەندامێکیان لە سوریا بڕی (٤٠٠) دۆلاریان هەیە و بۆ هەر ژنێك (١٠٠) دۆلارە و بۆ منداڵێك (٥٠) دۆلارە و بۆ ئەوانەی لە دەرەوەی سوریاوە هاتوون و خەڵکی ئەو وڵاتانە نین بڕی (٤٠٠) دۆلاری تریش دەخرێتە سەر موچەکەیان.

لە ڕووی ژمارەوە سەنتەری لێکۆڵینەوەی «بروکینگز» لە دۆحەی پیاتەختی قەتەرە و بەرپرسەکەی بەناوی «تشارلز لیستر» ڕاگەیاند کە سەربازەکانی دوڵەتی ئیسلامی (٥ بۆ ٦) هەزار سەربازن لە عیراق و لە سوریا نزیکەی (٧) هەزار سەربازن...

ئەوانەشی کە خاوەنی ڕەگەزنامەی جیاوازن لێکۆڵەرەوەیەك لە بزووتنەوە ئیسلامییەکان کە بۆ خۆی خەڵکی فەرەنسایە ناوی «رۆمیان کاییە» لە ”پەیمانگای فەرەنسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست « دەڵێت: زۆربەی سەربازانی ئەم دەوڵەتە سوورین و لە خالی سووریادان.. بەڵام زۆرێك لە

سەرکردەکانیان عیراقین و بە هۆی جەنگی مەیدانیان لە عێراق خاوەن ئەزموونێکی باشن و زۆربەیان عیراقین و پاشان چیچانیی و ئەفغانین، هەڵبەت ئەمەی باسم کرد لە سووریادا، بەڵام لە عێراق زۆربەی سەربازەکانیان عیراقین.

نزیکەی (١٠٠٠) سەربازی دەوڵەتی ئیسلامی مەغریبین و خاوەنی ڕەگەزنامەی فرنسین و زۆربەشیان عەرەبی نازانن هەر بە فەرنسیی قسە دەکەن، هەندێکیشیان گەیشتوونەتە پۆستە گرنگ و قیادەکان لە ناو ئەم دەوڵەتەدا.

من هەست ناکەم هیچ وڵاتیك ئەمانی دروست کردبێت، بەڵام دڵنیام لەوەی کە موخابەراتی وڵاتە زلهێزەکان کونیان کردبێتە ئەم ڕێکخراوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان کاری تێدا بکەن، هەندێك لە کاری دەوڵەتی ئیسلامی کە بینیمان هیچ پەیوەندی نییە بە ڕەوشتی ئیسلام و مامەڵەی موسڵمانانەوە، بۆیە ئێمەومانان کە شکمان بۆ درووست بووە لەسەریان کەسیان ناناسین، هەموو سەرکردەکانیان تاڕادەیەکی زۆر لاون، زۆر کەم تەمەنیان چووەتە (٤٠) ساڵەوە.. ڕاگەیاندنیان نییە، لێدواندەری فەرمیان نییە، بێجگە ئەبو عەدنان کە بە ئارەزووی خۆی قسە دەکات و بڵاوی دەکەنەوە، بۆ نموونە لە ناو هەموو دەوڵەتدا من و جەنابت ئەگەر زۆر لێوردبوونەوە بکەین لە (١٠) کەس زیاتر ناناساین، کە لە ناو ئەم دەوڵەتەی خیلافەتدان، ئەوانی هەمووی مەوالیدیان لە (١٩٧٠)وە دەست پێدەکات تا (١٩٧٧).

بـــۆ نمـــــونە:

ئەوەی کە تا ئێستا ئاشکرا بووە ئەویش لە ڕێگای موخابەراتەکانی ڕۆژئاواوە ناساندوویانە بە ڕاگەیاندنەکان بریتین لە:.

**یەکەم:** ئەبوبەکری بەغدادیی.. موالیدی ١٩٧١ ناوی ئیبراهیم عەواد ئیبراهیمە، پۆستی خەلیفەیە و خەڵکی سامەرایە، لە ناو قاعیدەدا پەروەردە بووە، فێرگەکانی سەربازی لە ناو ئەواندا بینیووە، پێشتر هیچ تاوان و ڕووداوێکی نەبووە.

**دووەم:** ئەبوموحەممەدی عەدنانی کە قسەکەری فەرمی ئەو دەوڵەتەیە.. مەوالیدی ١٩٧٧ و خەڵکی سوریایە، لادێیەك بەناوی « ڕیف ادلب» ناوی خۆی تەها سوبحی فەلاحە.. پیشتر هیچ تاوان و ڕووداویکی نەبووە لە سوریادا.

**سێیەم:** عبدوڕەحمان موحەممەد زافر دبیسی جەهنی.. بەڕەگەز خەڵکی سعودیایە و لەو وڵاتە داواکراوە چەند کێشەیەکی هەبوو لەسەر تیرۆر و ئیرهاب و نوینەری قاعیدە بوو لە سوریا و ئێستا قیادەیەکی گەورەی ناو دەوڵەتی ئیسلامییە، یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی جیهان و هاوکاری دەوڵەتی ئیسلامی لە لایەن ئەمەوە دەکرێت.

**چوارەم:** حەجاج کوڕی فەهد عەجمی.. خەڵکی کوێتە، خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆرە و پێشتر ئەم هاوکاری ماددیی ئەدایە بەرەی نووسرە، ئیستا هاوکاری تەواوی ماددیی بە دەوڵەتی ئیسلامی دەکات، لە کوێت ڕایکردووە و کێشەی سیاسیی و ئیرهابی لەسەرە وەك باسکراوە.

**پێنجەم:** عەبدولموحسین عبداڵلا ئیبراهیم شارخ.. خەڵکی وڵاتی سعودییە.. ئەم کەسە یەکێکە لەسەرکردەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی و لە دەوڵەمەندەکانی سعودییە.. کیشەی سیاسیی و ئەمنی هەبوو لە سعودییە و نوێنەری قاعیدە بووە لە سوریا و پاشان لە پاکستان، پێشتر چەند کەسی لە نەتەوە یەکگرتوەکان کوشتوە ئێستا لە نێودەوڵەتی ئەم کەسە داواکراوە.

**شەشەم:** سەعید عارف: خەڵکی جەزائیرە و یەکێکە لە قیاداتی گرنگی دەوڵەتی ئیسلامی، وەزیری تەجنیدی جیهادی ئەو دەوڵەتەیە، زۆر بە توانایە لە دامەزراندنی موجاهیدانی هاتوو لە جێگاکانی ترەوە وەك خۆیان دەڵێن و کەسێکی داواکراوی نیودەوڵەتییە و پیشتر لە جەزائیردا کێشەی زۆری هەبوو لەسەر تیرۆر لەگەڵ بەرەی نووسرەدا بووە ئیستا لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدایە.

**حەوتەم:** حەمید حەمەد علی: بۆم ڕوونەبۆتەوە خەڵکی کوێیە، بەڵام لە قیاداتی گەورەی دەوڵەتە و زۆرێك لە پلان و کارە سەربازییەکانی دەولە ئەم کەسە دایدەڕێژێ.. لە وانەی هەندیك قیادی سەربازی مەیدانی هەن ناویان هەیە وەك ئەبو عومەری چیچانی و هەندێك کەسی تر، ئیتر نازانین کامە قازییە.. یان کامە زانایانە.. سەرچاوەی یاسا لە کام مەزهەب و فیقهەوە وەردەگرن، مەنهەج و کتێبیان تا ئیستا ئاشکرا نییە، ئەڵبەت تا ئەم ساتە کە من دەنووسم من ئەوەندە زانیاریم لەسەریان هەیە، ئەشێت خەڵکی تر زانیاری زیاتری هەبێت، بەڵام من لەوە زیاتر شك نابەم، بۆیە زۆر جار قسە ناکەم لەسەریان؛ چونکە نایانناسم و تەنها لە ڕێگای ڕاگەیاندنەکانەوە شت دەبیستم، زانراوە - ئەم ڕاگەیاندنانە هیچی ڕاستگۆ نین، ئەوانیش وەك دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بێ ئیعلامن و کارەکانیان بەو شیوە دەبینین کە هەیە، جا ئەمانە جێگای گومانن لە کارکرنیاندا و زۆرێك لە کارەکانیان لە مەیدانی سەربازیدا ناچێتە خانەی ئیسلامەتییەوە.. بە دڵنیایی ئیسلام لە کارەکانیان بێبەرییە.

ئەشێت ئەوان پاساوی ئەوەیان هەبیت کە بۆیە ئیرهاب دەکەن دوژمن بترسێنن، بەڵام لای من ئەمە پاساوێکی زۆر نالۆژیکە؛ چونکە ئیسلام بە

ڕەحمەتی دوژمن دەترسێنێت و دڵی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت و خودای گەورە ترس و بیم دەخاتە دڵی دوژمنەوە، نەك بەسەربڕین و بە زۆر خەڵك بە موسڵمان کردن.

ئەوەمان لەبیر نەچێت.. لەڕاستیدا داعش بەرهەمی نەگریسی زوڵمی عەلمانیی بەعسیی و ئەمریکا و ڕۆژئاوایە بە گشتی، پاشان ئێران و شیعەی عێراق بە تایبەتی، بۆیە ئەوەی لەناو ئەم هێزەدا دەیبینیت، هەموو خاوەن ئیمانێکی شێتانەن، تا بڵێی داخ لە دڵن، بۆ ئیسلام دەمرن، بۆ ئیسلام دەژین، بەڵام کێشەی ئەمانە ئەوەیە ئەگەر زانا و بیرمەند و خەڵکی سیاسییان لەگەڵ بوایە هێزێکی زۆر باشیان لێدەردەچوو، ئەوەی لەگەڵ ئەم هێزەدایە هەمووی خەڵکی سەربازیی پارەدار و چاونەترس دوور لە سیاسەتن، دوور لە دبلۆماسین، دوور لە زانین و تێگەیشتنن لە واقیع، دوور لەوەن تێبگەن چی لە پێشە بۆ کردن و نەکردن، هیچ بازنەیەکیان نییە یاخود پلەبەندیی و نمرەیەکیان نییە بۆ خەڵکی و دوژمن و نەیارەکانیان، بۆ نموونە لە ڕووی فیکرییەوە من ململانێ لەگەڵ شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەکەم.. پاشان عەلمانیی، ئینجا شیعە، هەڵبەت وەك فیکر وتم، بەڵام ئەم هێزە لە ڕووی ململانێی سەربازیی و فیکریی و هەموو کارەکانی تر.. جیهان وەك یەك تەماشا دەکات، ئەمەش ئەوپەڕی کلۆڵیی و داماوییە، دنیایان لێبووە بە دوژمن، دۆستیان هەر نییە.. ئیسلام خەڵك دەکات بە دۆست نەك دوژمن، ڕۆحی تۆڵە سەندنەوە لای ئەمانە زۆرترە وەك ڕۆحی ڕەحمەت و پێکەوەژیان.

## ئافرەت و مێژووی لە ناو گەلاندا بناسە

لە سەردەمانی پێش هاتنی ئایینی ئیسلام لە ناو گەل و هۆزە جیاجیاکاندا ئازار و ئەشکەنجەی ئافرەتانیان زۆر دەدا، زۆربەی زۆری ئەو ئازاردانە لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە ئەنجام ئەدرا، لە ڕێگای یاسا ئازار دەدران، چونکە یاساکانیان لە لایەن عەقڵی مرۆڤەکانەوە دانرابوون بەبێ ئەوەی پشت ببەستن بە یاساکانی خوای گەورە.

لە ئەنجامدا ئافرەتان تووشی ئازار و ئەشکەنجە دەبوون، ئێستاش بە بیستنی ئەو ڕووداوانەی کە بەسەر ئافرەتانیاندا هێناوە، عارەقی شەرم بە نێوچاوانی مرۆڤایەتیدا دێتە خوارەوە، هۆی سەرەکی ئەو هەڵانەی کە دەیان کرد دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خۆیان بە بێنیاز دەزانی لە بوونی ئایینێکی خوای، بەڵکو پشتیان دەبەست بە زانستی ئینسانی، دەیانویست لەو ڕێگایەوە مرۆڤەکان خۆش بەخت بکەن.

ئەڵبەتە بوونی کەسانێك کە خاوەنی بەرژەوەندی بوون.. بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان هاتن دەستکاری پەیامی خوای گەورەیان کرد بە سوود و قازانجی خۆیان، تەورات و ئینجیل شاهیدێکی زۆر باشن بۆ ئەم ڕووداوە.

لە تەوراتی دەستکاری کراودا هاتووە کە «ئافرەت لە مەرگ تاڵترە"، هەروەها هاتووە کە «ئەو پیاوەی دەیەوێت پیاوێکی باش بێت و پەرستشی خوا بکات، ئەوا دەبێت ژن نەهێنێت.!

لە ناو هەزار پیاودا، پیاوێکی باش دەست دەکەوێت، بەڵام لە ناو هەموو ئافرەتانی جیهاندا تەنانەت ئافرەتێکی باش دەست ناکەوێت، لە

دینی مەسیحیەتی ئەمڕۆدا دەڵێن کە «کەسێك ئەگەر بیەوێت پیاوی خوا بێت ئەوا دەبێت بە تەنیا بژی و دوور بێت لە ئافرەت“.

ئەمانە نمونەیەکی بچوکن لە گۆڕانی دین و بەکەم زانینی ئافرەتان.

(مونتسکیو) لە کتێبی (روح القوانین) لاپەڕە (٦٧٠)دا دەڵێت:”دادگاکانی یابان بۆ سزادانی ئافرەتانی تاوانبار، ڕووتیان دەکەنەوە و بە نێو خەڵکیدا دەیانگێڕن و دەبێت وەك چوارپێ بڕۆن“.

لە ڕاستیدا ئەمانە ڕاستییەکی تاڵن، مێژوو بە چاوی خۆی دیویەتی کە چ بێ ڕێزییەك کراوە بە ئافرەتان لە پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

**ئافرەت لە شارستانیەتی یۆنانی کۆندا..**

یۆنان یەکێکە لە شارستانیەتە کۆنەکان، کە پشکێکی زۆری هەیە لە بەرەو پێشبردنی زانست و تەکنەلۆژیای ژیانی ئەمڕۆدا؛ بە تایبەتی کۆمەڵگای ڕۆژئاوا زۆر شانازی پێوە دەکەن، بۆیە وا بە باش دەزانم کە لە سەرەتاوە باس لە ڕەوشی ئافرەتان بکەم لەو وڵاتە پڕ لە زانست و شارستانیەتە کۆنەدا.. با بزانین چۆن سەیری ئافرەتانیان کردووە و ئافرەتان چ ڕۆڵێکیان هەبووە لەو شارستانیەتەدا..

لە یۆناندا ئافرەت زۆر بە چاوێکی سووك تەماشا دەکرا، کەسایەتی پشتگوێ دەخرا، لەم بارەیەوە «ئەرەستۆ» دەڵێت: ئافرەت پیاوێکی ناتەواوە، سروشت هەروا بە جێی هێشتووە لە خراپترین شێوەدا بە بێ دەستکاری کردن.

ئسکولیاست دەڵێت: لە نێوان یۆنانیە دێرینەکاندا مارەکردنی خوشکی دایکی و باوکی لە ڕووی یاساوە هیچ قەدەغە نەبووە.

**کۆمەڵگای ئاخای..**

ئاخاییەکان یەکێك بوون لە هۆزەکانی کۆمەڵگای یۆنان، کە لە دەوروبەری ساڵانی (١٢٥٠)ی پێش میلاد فەرمانڕەوای یۆنانیان دەکرد، ئافرەتان لە ناو ئەم هۆزەدا شانبەشانی پیاوان کاریان دەکرد، جاروباریش لە گفتوگۆ گرنگەکاندا بەشداریان دەکرد، هەرکات فەرمانڕەواکان بیانویستایە سوپا ئامادە بکەن بۆ جەنگ باسی خاڵي سیاسی و ڕەگەزیان نەدەکرد بۆ سوپاکەیان، بەڵکو ئافرەتانی جوانیان دەهێنایە ناو سوپاکە، تەنها ئاوات و هیوای ئەوان بەس ڕابواردن بوو لەگەڵ ئافرەتاندا و مردن و ژیانیان زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو، هەروەها لە سەر خێزانیان دامەزراندبوو،

**پایەی باوك سالاری (patriartchy) :**

باوك دەسەڵاتی هەبوو بەسەر هەموو ئەندامانی خێزاندا، بە هەر شێوەیەك بیویستایە بەکاریان بهێنێت، کاتێك میوانی بهاتایە کچەکانی دەخستە خزمەتی میوانەکانی، منداڵەکانی لە سەر کێوەکاندا و لە پەرستگاکانیاندا دەکردە قوربانی بۆ خواکانیان، هاوسەرگیری لە ناو ئەو هۆزەدا بە شێوەی کڕین و فرۆشتن بوو، کڕیار دەبوایە ئاژەڵێکی گرانبەهای بدایە بە باوکی کچەکە، باوکی کچەکەش دەبوایە هەموو پێداویستیەکی ژیانی لەگەڵ کچەکەیدا بناردایە..

ئافرەتان لە دوای هاوسەرگیرییان خانمی ماڵ دەبوون، بەڵام دەسەڵاتی ناو ماڵەکەی بەند بوو بە ڕەگەزی منداڵەکانیەوە، واتا ئەگەر کوڕی ببوایە ئەوا ئازاد تر بوو لەوەی کە کچی بوایە.

**سـپارتـــا :**

لە ناو هۆزی سپارتادا ئافرەتان دیلی دەستی فەرمانڕەوایان بوون، فەرمانڕەوایان داوای سەیر سیریان لە ئافرەتان دەکرد، دەبوایە لە یاری ڕاکردن، زۆرانگرتن و تیرهاوێژی دا بەشداری بکەن تا جەستەیەکی جوان و پتەو و بەهێزیان هەبێت، ئەگەر ئەم کارانەیان بکردایە ئەوا پێیان دەوتن کە شایستەی دایکایەتیتان هەیە، ئافرەتانیان بەکار دەهێنا بۆ حەز و ئارەزووەکانی پیاوان بەوەی کە دەبوایە سەمایان بکردایە بۆ پیاوان بە ڕووتی، کە دەیان وت کە کاتێك خۆیان ڕووت دەکەنەوە ئەوا عەیب و عارەکانیان دەردەکەوێت، دەبێت چارەسەر بکرێت. یەکێك لە نووسەرە یۆنانیەکان «پلوتارخوس» دەڵێت: ڕووتبونەوەی ئافرەتان لە بەرچاوی پیاوان شتێکی شەرم ئامێز نەبوو، چونکە خۆ پارێزی دروشمیان بوو، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا خۆپاراستن دوای دڕاندنی پەردەی حەیا و ئابڕوو دەبێت چی بێت؟ ئایا دەتوانرێت تەنها بە وشەی خۆپاراستن ئەو کردارە نا شایستە بەرانبەر بە ئافرەتان بکرێت؟

بۆیە دەڵێین: نەخێر، هیچ کات لە شەرمەزاری و بێ ئابڕوو ئەو کردارە کەم ناکاتەوە.

”سپارتاکان» گوێیان نەدەدایە پەروەردەی فیکری کچانیان؛ چونکە ئافرەتیان بە کەم ئەقڵ و ناتەواو لە قەڵەم دەدا.

لێرەدا دەڵێین بۆ دەبێت وا بێت؟

ئایا ئافرەتان مرۆڤ نین؟

قانونی دەوڵەت سنووردارنەبوو بۆ بە سووك سەیرکردنی ئافرەتان، بەڵکو لەوە زیاتریان پێ دەکرا کە لێرەدا باسمان کردووە، دەوڵەت کات و

ساتی هاوسەرگیری بۆ دیاری کردبوون کە بۆ پیاوان سی ساڵی بوو و بۆ ئافرەتانیش بیست ساڵی بوو، هیچ ئافرەتێك بۆی نەبوو کە هاوسەرگیری نەکات بە تەنها بمێنێتەوە، ئەگەر وا بوایە ئەوا نەیدەتوانی لە هیچ کارێکدا بەشدار بێت وەك هەڵبژاردن و تێکەڵاو بوون بە کۆمەڵگا" پلوتارخوس» دەڵێت: ئەو ئافرەتانەی کە ژیانی تەنهاییان هەڵدەبژارد، بۆیە زۆریان لێ دەکرا لە وەرزی زستاندا دەبوایە بە ڕووتی بەناو خەڵکدا بڕۆشتنایە وە سرودێکیان بوتایە کە ماناکەی ئەمە بوو )ئەمەیە چارەنووسی ئەو کەسانەی کە سەرپێچی قانون دەکەن).

لە لایەکی ترەوە ئەو کوڕانەی کە نەدەچوونە ژیانی هاوسەرییەوە و تەنهاییان هەڵدەبژارد ئەوا هەمیشە دەکەوتنە بەر هەڕەشە و لێدان، ئەم ئازار و ئەشکەنجەیەش بۆیە دانرا بوو، چونکە کوڕان و کچانی "سپارتا» خۆیان بە دوور دەگرت لە ژیانی هاوسەرگیری و ئارەزوویان زیاتر بەلای کاری «هاوڕەگەزبازی» دەچوو.

ئەڵبەت دەبێت ڕەچاوی ئەوەش بکەین کە تەنها بە تەنیا ژیان بۆ ئافرەتان نەنگی نەبوو، بەڵکو منداڵ نەبوونیش دەبووە عەیب و عارێکی گەورە بۆیان.

لە کۆمەڵگای سپارتادا دایکان و باوکان بەرپرس بوون لە ئامادەکردنی پێداویستییەکانی ژن هێنان و شوو کردنی کچ و کوڕەکانیان، ئەم کارەشیان بە شێوەیەکی زۆر عەجیب ئەنجام دەدا، زاوا دەبوایە بووکی بەزۆر لە ماڵی باوکی ڕابکێشایەتە دەرەوە، بووکیش دەبوایە لە بەرامبەریدا بەرگری بکردایە و وای نیشان بدایە کە بە زۆر دەبرێتە ماڵی زاوا، بەم هۆیەش بوو کە هاوسەرگیری بە مانای دزین دەهات.

دایك و باوكانی كۆمەڵگای سپارتا بە كوڕ و كچەكانی خۆیان دەووت كە ئەو كەسانەی هەڵیان دەبژێرن بۆ هاوسەرگیری ئەوا دەبێت سەیری قەد و قیافەی بكرێت، چونكە پاشاكەیان»ئارخیداموس» لەبەر ئەوەی كە لەگەڵ ئافرەتێكی زەعیفدا هاوسەرگیری كردبوو بەدانی غەرامە حوكم درا.

تاكە هۆكاری هاوسەرگیری لەناو كۆمەڵگای سپارتادا خستنەوەی منداڵ بوو، ئەگەر ئافرەتێك منداڵێكی ساغ و سەلامەتی نەبوایە ئەوا ئەو ئافرەتەیان دەكوشت یان بە قەرز دەیاندا بە پیاوانی بەهێز و دەسەڵات تا بەڵكو خێزانەكەیان منداڵێكی باشی ببێت.

**ئەسـینا :**

لە ناو ئەم كۆمەڵگایەدا باوك دەسەڵاتی تەواوی هەبوو بەسەر خێزاندا، ئەگەر منداڵێكی نەخۆش یان كەمئەندامی هەبوایە، ئەوا باوك دەیتوانی منداڵەكەی بكوژێت، لەم نێوەندەدا ئافرەتان زیاتر دەكوژران، چونكە لەكاتی بە شوودانیدا پێویستی بە پێداویستی ماڵ دەبوو كە دەبوو ماڵی باوكی بۆی ئامادە بكەن، باوك دەیتوانی كچەكەی بفرۆشێت و پیاو پەیدا بكات بۆ ژنەكەی خۆی، كاتێك كە لێی جیا دەبوویەوە.

لە ئەسینا ئافرەتان لە ماڵەكانی خۆیاندا دەیانخوێند لە لای داكەكانیان، یاخود لای دایەنەكانیان فێری نووسینو خوێندنەوە و ڕستن و چنین و سەما و ئاوازی موسیقا دەبوون، لەوە زیاتر نەیاندەتوانی لە قوتابخانەكان بخوێنن، چونكە پێیان وابوو ئافرەتی ئابڕوودار ناچێتە دەرەوەی ماڵ، كۆمەڵێكی كەم لە ئافرەتان خوێندنی باڵایان تەواو دەكرد كە ئەوانیش لە ناو كۆمەڵگادا بە چاوێكی سووك تەماشا دەكران.

ئەم کۆمەڵگایەش هەمان کۆمەڵگا بوو کە چەندان زانا و بیرمەندی تێدا هەڵکەوتووە وەك سوقرات، ئەفلاطون و ئەرستۆ.

ئامادەکردنی کچەکانیان بۆ بە شوودانی لە لایەن باوك و دایکانەوە یاخود لە لایەن کەسانی لێهاتووەوە بوو کە دەبوایە کوڕێکی دەوڵەمەند و خاوەن خانەوادەیان بۆ بدۆزیایەتەوە، دەوڵەمەندی گرنگترین خاڵبوو بۆ ئەوان نەك خۆشەویستی و ڕێز گرتن لە کچەکەیان.

ئەرکی باوك ئەوە بوو لە کاتی بەشوودانی کچەکەیدا دەبێت مەبلەغێك پارە و هەندێك جل و بەرگ و کەمیك لە خشڵی متومۆر و هەندێ جارێش چەند بەندەیەك، کە هەموویان موڵکی کچەکە بوو ئەگەر پیاوەکە بیویستایە ژنەکەی تەڵاق بدات دەبوایە هەموو موڵك وماڵەکەی بگەڕاندایەتەوە بۆ ئافرەتەکە، ئەمەش بۆیە وایان لێ کردبوو تاوەکو پیاوان بیر لە تەڵاقدانی ژنەکانیان نەکەنەوە.

کچێك کە ماڵی باوکی دەستکورت بوونایە و نەیانتوانیایە کە پێداویستی ژیان بۆ کچەکەیان دابین بکەن تا بیدەن بە شوو، ئەوا نەیدەتوانی شوو بکات وە یان دەبوایە لەلایەن خزم و کەسەکانیەوە شتیان بۆ بکڕیایە تا نەمێنێتەوە و شوو بکات، لە کۆمەڵگای یۆنانی کۆندا ژنهێنان و شووکردن لە ڕێگای کڕین و فرۆشتنەوە بوو، کە ئافرەتەکان دەبوایە پیاویان بۆ خۆیان بکڕیایە.

لە نمایشتنامەی تراديژیای «میدیا» دا کە «ئەریپیدوس» نووسیویەتی باس لە ئافرەتێك دەکات کە لە و کۆمەڵگایەدایە و ڕەخنە دەگرێت لەو فەرهەنگانەی کە لە کۆمەڵگاکەیاندا باوە، کە هاوسەرگیری لە کۆمەڵگای یۆنانیدا هۆکاری هاوسەرگیری خۆشەویستی نەبووە، نە ڕێز لە یەکتری

گرتن بوو، چونکە هەمیشە لە دژواریەتی ئەو کارەیان باس کردووە نەك لە خۆشیەکانی.

پیاوانی یۆنانی زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی ژنەکانی خۆیان تەڵاق بدەن بە هەر بەهانەیەك بێت بەبێ ئەوەی دەستنیشانی بکەن کە بۆچی ژنەکەیان تەڵاق داوە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە نەزۆك بوایە و نەیتوانیایە ببێتە خاوەنی منداڵ ئەوا نەیدەتوانی ژنەکەی تەڵاق بدات، بەڵکو دەبوایە پیاوانی خزم و کەس و کاری یارمەتیان بدایە، واتا ژنەکەی خۆی بە قەرز دەدانێ تا لە ڕێگای ئەوانەوە ببێتە خاوەنی منداڵ. ئەم کارەش لە قانونی دەوڵەتدا نووسرابوو کە پیاوان بۆیان هەیە ئەو کارە بکەن.

لەڕاستیدا ئافرەتان لە یۆناندا مەحروم و مەظلوم بوون، چونکە نەیدەتوانی هیچ پەیماننامەیەك ئیمزا بکات بۆ کڕین و فرۆشتن و لە دادگاکانیشدا هیچ مافێکیان نەبوو بەهیچ شێوەیەك هەژماریان نەدەکردن تەنانەت ئەگەر حەقی ئەویش بێت. لە پاش مردنی مێرد، ئافرەت هیچ میراتێکی لە ماڵی مێردەکەی بەرنەدەکەوت، منداڵیش تەنها بۆ باوکەکەی بوو، چونکە ئافرەت تەنها ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکەی لە ئەستۆدا بوو هیچی تر..

یەکێکی کە لە هۆکارەکانی کەم سەیر کردنی ئافرەتان لەلایەن مێردەکانیانەوە ئەوە بوو کە پیاوەکان دەبوایە تەمەنیان دوو بەرابەری ئافرەتەکە ببوایە لە کاتی هاوسەرگیریدا، ئەمەش وای دەکرد کە پیاوان زۆر بە ئاسانی بتوانن کە فکری خۆیان فەرز بکەن بەسەر ژنەکانیاندا.

پیاوانی «ئەسینا» ئازاد بوون لەوەی کە لەگەڵ ئافرەتانی تردا جووت بن لە کاتێکدا کە خۆیان خاوەنی خێزانن، کچ و ژنەکانیان نەدەبوو لەماڵ بێنە دەرەوە، بۆیە ئەمەش ئازادی زیاتری دابوو بە پیاوان. ئافرەتان لە

ماڵەکانی خۆیاندا ئازاد بوون و ئەرکی بەخێوکردنی منداڵ و خزمەتکردنی خێزان لە ئەستۆی ئەواندا بوو، ئەم ئازادییەش دەبوو لە سنوری ماڵەکەی خۆی نەچووبایەتە دەرەوە.

هەر چوار ساڵ جارێك لە مانگی چوارەمی یۆنانیدا جەژنێکی گەورەیان دەگێرا، بە ناوی «تەسموفری» کە لەو جەژنەدا ئافرەتان ڕیزیان لە قانون و گوزارانی وڵاتەکەیان بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەگرت کە دەبوو ئافرەتەکان لە بەرچاوی پیاواندا قسەی ناشرین بە یەکتری بڵێن، وە پیاوان بە جوامێر و کامڵ باس بکەن.

لە دوای مردنی باوك موڵك و سەروەت دابەش دەکرا بەسەر کورەکانیدا، بەڵام کوری گەورە دەبوو بەشی لە هەمووان زیاتر بێت. لە کاتێکدا لە کۆمەڵگای سپارتا دا تەنها کوڕی گەورە بوو کە میراتی دەبرد و باقی منداڵەکانی کە بێ بەش دەبوون.

لە سەدەی (٨)ی پێش زاییندا کاتێك شاعری گەورەی یۆنانی «هەسیۆ» باس لەوە دەکات کە لە ناو خێزانەکانی ئەسینادا ببووە باو کە نەهێڵن منداڵی زۆریان بێت، چونکە لەوە دەترسان کە نەوەك ماڵەکەی دابەش کات بەسەر کوڕەکانیدا و باوکەکە خۆی هیچی بۆ نەمێنێتەوە. ئەوەمان لە بیر نەچێت کە ئافرەتان هیچ حەقێکیان نەبوو لە وەرگرتنی میرات، تەنها ئەوە نەبێت کە باوکیان بۆیان دابین کردون لە کاتی شووکردنیدا.

**ئافرەتان لە شارستانیەتی ڕۆما..**

لە ڕۆمدا، پیاو حاکمی یەکەم بوو لە خێزانەکەیدا و کەس بۆی نەبوو لە قسەیدا قسە بکات، تەنها ئەو بوو کە مەرگ و ژیانی بۆ ژنەکەی هەڵدەبژارد.! ئەگەر منداڵێك لە منداڵەکان یاخود ژنەکەی تووشی تاوانێك بوونایە ئەوا پیاوەکە دەیتوانی حوکمیان بدات، ئەگەر بە حوکمی لە سێدارەدانیش بێت.

هەر لەسەر ئەم بنەمایە یەکێك لە ڕۆمییەکانی سەدەی دووەمی پێش میلاد بەناوی «کاتون» دەڵێت: پیاوان حاکمی گەورە بوون بەسەر ژنەکانی خۆیانەوە، کە دەسەڵاتی تەواوەتی هەبوو بەسەریدا، کە ئەگەر تاوانێکی بکردایە وەك مەی نۆشین ئەوا سزای دەدا و یان ئەگەر لەگەڵ پیاویکەدا ڕاییبواردایە ئەوا دەیکوشت.

ئافرەت لە ڕۆمدا وەك کەنیزێکی بێ ئەرزش سەیر دەکرا کە هیچ ڕێز و قەدرێکی نەبوو لە کۆمەڵگادا، لە سەر بنەماکانی قانون بە کەسێکی کەم ئەقڵ و ناکامڵ سەیر دەکرا، هەمیشە ئاغا و حاکمی هەبوو، ئەگەر مێردی هەبوایە ئەوا مێردەکەی بوو، خۆ ئەگەر مێردیشی نەبوایە ئەوا کوڕە گەورەکەی حاکم و دەسەڵاتدار بوو بە سەریەوە.

ئامانجی سەرەکی ژن و ژنخوازی لە ڕۆمدا تەنها لە سەر بنەمای زیاد بوونی نەوە بوو، پیاو.. ژن و منداڵەکانی وەك موڵك و سامان بۆ حیساب دەکرا، هەڵبژاردنی مێرد یاخود ژن بۆ منداڵەکانیان لە ئەستۆی دایك و باوکدا بوو، هەندێ جار هەر بە منداڵی دەدرانە یەکتری و هیچ کات بە بێ ڕازی بوونی باوك هاوسەرگیری ئەنجام نەدەدرا.

لە قانونی ڕۆمدا ژنهێنان و شوو کردن بە زۆر بوو تا لە ساڵی (٤١٣)ی پێش زاین کاتێك کە «کامیلیۆس» موچەی بڕیەوە بۆ پیاوانی تەنهان، واتا ئەوانەی کە ژنیان نەهێناوە، ئەو قانونی بە زۆر ژنهێنان و شوو کردنە هەڵوەشینرایەوە.

**لە ناو ڕۆمەکاندا ژن هێنان بە دوو جۆر بوو:**

جۆری یەکەم: دانی کچەکە و ماڵ و سامانێکی زۆر بوو لە لایەن باوکەکەوە بە کوڕەکە.

جۆری دووەم: دانی کچەکە بوو بەبێ سەروەت و سامان.

جۆری یەکەمی هاوسەرگیری بە شێوەیەك بوو کە دەبوو کچ و کوڕەکە ساڵێك پێش زەماوەند بە یەکەوە بژیانایە، بۆیە باوکەکە دەبوو کچەکەی لەگەڵ ماڵ و موڵکدا بدات بە کوڕەکە، ئەم مەراسیمەش بە شێوەیەك بەڕێوە دەچوو کە پێیان دەوت نان و شیرینی خواردن، بەڵام جۆری دووەمی ژن هێنان پێویستی بە زەماوەند نەبوو، بەڵکو دایك و باوکی کچەکە.. کچەکەیان دەفرۆشت بە کوڕەکە کە یەکێك لە فەرمانڕەوایان دەبوو ئامادە بێت.

کوڕەکە پارەیەکی مسی دەدایە دەست فەرمانڕەواکە ئەویش لە تەرازوویەکدا دای دەنا بەمانای نرخ و بەهای ئافرەتەکە.

پرۆسەی هاوسەرگیری لە ڕێگای کڕین و فرۆشتنەوە هەر لە سەرەتای مێژووی ڕۆمی ئەو سەردەمەوە کەم کەم ڕەونەقی نەما، پێچەوانە بووە، تا وای لێهات دەبوو ئافرەتان بەو موڵك و سامانەی کەلە ماڵی باوکیانەوە دەیبەن لەگەڵ خۆیان پیاوان بکڕن. ئەو ماڵ و سامانەش دەبوو لە ژێر ڕکێفی پیاوەکەدا بوایە، بەڵام هەر بە مردنی پیاوەکە یان تەڵاق دانی ژنەکەی ئەوا هەموو موڵك و سامانەکە دەگەڕایەوە بۆ ژنەکە.

ئەو پرۆسەی هاوسەرگیریانەی کەلە ڕێگای نان و شیرینی خواردنەوە دەگیرا جیا بوونەوە تیایدا زۆر دژوار بوو، چونکە پیاوان بەهۆی موڵکی ژنەکەوە کەلە ماڵی باوکی هێنابوی نەیدەویست ژنەکەی تەڵاق بدات.

لەو دوو جۆرە هاوسەرگیریەی کە باسمان کرد جۆری یەکەمیان جیابونەوە تەنها بە دەست پیاوەکە بوو، بەڵام لە جۆری دووەمدا هەردوو لا دەیان توانی لەیەك جیا ببنەوە هەرکات بیان ویستایە، بە بێ ئەوەی لایەنی دووەم ئاگادار بێت.

لە ڕۆمدا باوك دەیتوانی بە زۆر کچەکەی وا لێبکات تا لە هاوسەرەکەی جیا بێتەوە، تەنانەت ئەگەر کچەکەش خۆی ڕازی نەبووایە.

کاتێك ئیمپراتۆری مەسیحی ڕۆم قانونی «ژوستین»ی دامەزراند ئەگەر بهاتایە و ژن و مێرد لە یەك جیابونایەتەوە ئەوا هیچ کام لەوان نەیان دەتوانی دووبارە بچنە ناو ژیانی هاوسەرێتیەوە تا ساڵێك بەسەر جیا بوونەوەیاندا تێدەپەڕی، ئەگەر جیا نەبوونایەتەوە، بەڵام یەکێك لەوان بمردایە ئەوا ئەویکەیان تا دوو ساڵ دوای مەرگی ژنەکە یاخود پیاوە نەدەبوو ژنیان بهێنایەوە، یان ژنەکە مێردی بکردایەتەوە.

کاری زیناکردن ئەوەندە باو بوو کەس گوێی بەو کارە نەدەدا، مەگەر لەناو فەرمانڕەوایاندا ئەگەر ڕووی بدایە ئەوا دەبووە شەرمەزاری بۆ ئەو سیاسەتمەدارە لە ناو دەسەڵاتدا.

پاش ماوەیەك قانونی تەڵاق هەڵوەشایەوە کە دەبوو ئافرەتەکە هەموو سەروەتەکەی خۆی وەربگرێتەوە کە لە ماڵی باوکیەوە هێنابووی، بۆیە ئەمەش وایکرد کە پیاوان تەنها هۆکاریان لە ژنهێنان ئەو موڵك و ماڵە بوو

کە ئافرەتەکە لەگەڵ خۆی دەیهێنا. باوبوو دەبوایە کە ئافرەتە دەوڵەمەندەکان بەلایەنی کەمەوە یەك جار تەڵاق بدرانایە.

یەکێك لە پیاوانی ناوداری ڕۆم بە ناوی «کاتۆ»دەڵێت: ئیمپراتۆری ڕۆم وای لێهاتبوو کە زیاتر وەك نووسینگەیەکی ژن هێنان و ژن تەڵاقدان دەهاتە پێش چاو تاوەکو ئیمپراتۆرێکی گەورەو دەسەڵات دار..

ئەمەش وایکردبوو لە پیاوان کاتێك ژنێکیان دەهێنا و دەبوونە خاوەنی ماڵ و سەروەت خێرا دەچوونە لای ئافرەتێکی کە و ژنی یەکەمی خۆیان تەڵاق دەدا، تا بتوانن ژنێکی تر بێنن و ماڵ و موڵکێکی تر بەدەست بێنێت، ئەم جۆرە هاوسەرگیریەش زیاتر سیاسی بوو تا پێکەوەژیانێك کە لە سەر بنەمای خۆشەویستی و ڕێز دابمەزرێت.

لە ناو ڕۆمدا هەندێك پیاویش دەستدەکەوتن کە هەرگیز ژنیان نەدەهێنا، هۆکاری ئەم کارەشیان دەگەڕاندەوە بۆ کەم ئەقڵی و ناتەواوی ئافرەت.

"متلۆس مادینۆس» یەکێك لە گەورە پیاوانی ڕۆم لە ساڵی (١٣١) دەیوت دەبێت هەموو پیاوان ژن بێنن، چونکە ژنهێنان خزمەتە بە دەوڵەت، هەرچەندە ئافرەتان مایەی ئازار و ئەشکەنجەن بۆ پیاوان،

بەڵام کەس گوێی بۆ قسەکەی «مادینۆس» نەگرت بۆیە ڕۆژ بەرۆژ پیاوانی تەنها و دایك و باوکانی بێ منداڵ ڕوو لە زیاد بوو لە ڕۆم.

لە دوای هەموو لە دایکبوونێك ترسی ئەوە هەبوو ڕووداوێك ڕوو بدات، چونکە ئەگەر بهاتایە و منداڵەکە کەمئەندام بوایە وە یان ئەگەر کچ بوایە ئەوا باوکەکە بە پێی عادەت و تەقالید دەیتوانی منداڵەکە بکوژێت، خۆ ئەگەر منداڵەکە کوڕ بوایە ئەوا ئەیانوت پێی بەخێرە، هەرچەند

ڕۆمەکان ڕێگایان لە زۆربوونی خێزان دەگرت، بەڵام ئارەزووشیان بوو کە ببنە خاوەی کوڕ.

لە ڕۆمدا ئەگەر ژن و پیاوێك خاوەنی منداڵ نەبوونایە ئەوا بە چاوێکی سووك سەیر دەکران، پیاوانی دینی بە خەڵکیان دەووت، ئەگەر کەسێك خاوەنی منداڵ نەبوایە وە بمردایە ئەوا هەتا هەتایە لە گۆڕەکەیدا ئازارو ئەشکەنجە دەدرێت. خەڵکیان هاندەدا تا ببنە خاوەنی منداڵ، جوانتر بڵێین هانی دەدان تا ببنە خاوەنی کوڕ، چونکە ئەوان تەنها کوڕیان بە مایەی ئارام بەخشی ڕۆحی باوك دەزانی نەك کچ.

لە ناو ماڵدا باوك دەوری سەرۆکی کۆماری دەبینی، چونکە تەنها ئەو بوو کە دەیتوانی هەموو کارەکان ڕابپەڕێنێت و حوکم بدات بەسەر ئەندامانی خێزانەکەیدا، هەر ئەویش بوو دەیتوانی کاری کڕین و فرۆشتن بکات.

لەو سەردەمەدا پیاوان خاوەنی ماڵ و سەروەتی ژنەکانیشیان بوون، ئافرەتان بۆیان نەبوو لە دادگا ئامادە بن گەرچی بۆ شاهیدی دانیش بوایە، ئەگەر مێردەکەی بمردایە ئەوا هیچ مافێکی نەبوو لە وەرگرتنی میراتی لە ماڵی مێردەکەی، لەو سەردەمەدا ئافرەتان لە هەر تەمەنێکدا بونایە دەبوو لە ژێر دەسەڵاتی پیاوێکدا بوونایە، جا ئەو پیاوە باوکی بوایە یان برای یان مێردەکەی وە یان کوڕی. بەبێ ئیزنی ئەو سەرپەرشتەی نەیدەتوانی هیچ کارێك ئەنجام بدات.

ئەگەر ئافرەت تووشی گوناهێك ببوایە ئەوە مێردەکەی بوو کە حوکمی دەدا نەك قازی، تەنانەت دەیتوانی حوکمی کوشتنیشی بدات.

**ئافرەت لە شارستانیەتی هیندستان :**

لە هیندی كۆندا بڕوایان وابوو كاتێك خواوەندەكەیان «تواشتری» ئافرەتی دروست كرد، هات پاشماوەی هەموو ئەو شتانەی كە پێشتر دروست كرا بوون كۆكردەوە و ئافرەتی لێ دروست كرا.

لە قانونی ئەواندا هاتبوو كە (قەزا و قەدەر، تۆفان، مەرگ، دۆزەخ، زەهر، مار پێوەدان، ئاگر) ئەمانە هیچ كامیان لە ئافرەت خراپتر نین. لە ناو كۆمەڵگای هیندا ئافرەتیان بە دروستكراوێكی پیس و زیادە دەزانی لە سروشتدا، لەسەر ئەو باوەڕەش ڕەفتاریان لەگەڵدا دەكردن.

لە كۆمەڵگای هیندەكاندا پێكەوە ژیان زۆر باو بوو، ئەگەر پیاوێك ژنی نەهێنایە ئەوا هیچ پلە و پایەیەكی نەبوو لە كۆمەڵگادا، لە ئەستۆی دایك و باوكاندا بوو كە هاوسەر بۆ كچەكانیان هەڵبژێرن. لە قانون نامەی» مانوا» لەفزی» گاندهاروا» هاتووە كە هاوسەرگیری ئەگەر بە ڕەزامەندی هەردوولا بێت، واتە بە خۆشەویستی بێت، ئەوا پەسەندكراو نەبوو، چونكە پێیان وابوو كە ئەو دوو كەسە یەكتریان خۆش دەوێت، كەواتە پێش چوونە ناو ژیانی هاوسەریانەوە، پەیوەندی جنسیان هەبووە، بۆیە ئەو كارە پەسەند نەبوو.. هۆكاری ئەمەش ئەو ئاووهەوا گەرمەی هیندستان بوو كە كاری دەكردە سەر زوو پێ گەیشتنی كچان.

ئەمەش دەبووە هۆی تێكچوونی كۆمەڵگا بەهۆی پەیوەندی كچان و كوڕان پێش هاوسەرگیری. بۆیە بۆ ڕێگەگرتن لەم كارە هەڵسان بە دان بە شووی كچەكانیان لە تەمەنی منداڵییەوە، تا توانیبێتیان ڕێگربن لە پەیوەندی كچەكانیان لەگەڵ كوڕان پێش پرۆسەی هاوسەرگیری.

هاوسەرگیری چەند شێوەیەك بوو هەندێك لەوانە (دزینی کچەکە، بە زۆر بە شوودان، کڕینی کچەکە لە لایەن زاواوە، یاخود بە ڕەزامەندی کچەکە) ئەڵبەتە وەك باسمان کرد ڕەزامەندی هەردوولا بە کارێکی باش دانەدەنرا لە کۆمەڵگادا، ئافرەتانیش خۆیان پێیان باش بوو کە بکڕدرێن باشترە، خۆ ئەگەر بدزرانایە ئەوا پێیان وابوو کە لە کۆمەڵگادا ناودار دەبن.

قانوننامەی «مانوا» هەشت جۆر ژنهێنانی ڕێگە پێدا بوو کە پەسەندترینیان دزینی کچەکە بوو، نا پەسەندترینیان ژن هێنان بوو بە خۆشەویستی، هەروەها باوترینیان لە کۆمەڵگادا لە ڕیگای کڕین و فرۆشتنەوە بوو.

قانون گوزارانی هیند پێیان وابوو کە ژن هێنان لە ڕیگای کڕین و فرۆشتنەوە دەتوانێت بەردەوام بێت، بۆیە لە قانونی هیندا وشەی (ژن کڕین)دانرا بوو بە موراديفی وشەی (هاوسەرگیری).

نووسەرێکی گەورەی هیند کە لە ساڵەکانی ٢٠ی زایندا دەژیا، شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەی نووسیوە لە سەر ڕەفتار و فەرهەنگی هیندەکان دەڵێت: «ئەو خێزانانەی کە بە هۆی دەستکورتی و نەبوونییەوە نەیان دەتوانی کچەکانی خۆیان بە شوو بدەن، ئەوا دەهاتن کچەکانی خۆیان بە تەپڵ و زوڕناوە دەبردە ناو بازاڕەکان، خەڵکیان لە خۆیان کۆ دەکردەوە، هەر پیاوێك کە دەهاتە پێشەوە ئەوا لە پێشدا بەشی پشتەوەی کچەکەیان نیشان دەدا، پاشان بەشی پێشەوەی لەشی کچەکایان نیشان دەدا..

ئەگەر کوڕەکە کچەکەی پێ باش بوایە ئەوا دەیکڕی و چەند مەرجێکی بۆ کچەکە دادەنا و دەیکردە خێزانی خۆی".

دەبێت ئەوەشمان لە بیرنەچێت کە بەندێك لە بەندەکانی تری قانون نامەی «مانوا» دەربارەی ئافرەتان کە دەڵێت: «ئافرەتان سەرچاوەی بێ ئابڕووین، ئافرەت سەرچاوەی سەرشۆڕییە، ئافرەت سەرچاوەی فەقیریە، بۆیە دەبێت خۆتان لە ئافرەت بە دوور بگرن".!

ئەوە باوەڕی کۆمەڵگای هیند بوو بەرامبەر بە ئافرەتان، کە دەبوو ئافرەتان مێردەکانیان بە(سەروەر) یا (ئەرباب) و تەنانەت بە (خوای من) بانگ بکردایە. لە کاتی ڕێگە ڕۆشتندا لە بەرچاوی خەڵکدا دەبوو لە دوای مێردەکەیەوە بڕۆشتایە، نەدەبوو قسەی بکردایە لە ڕووی مێردەکەیدا، بەڵکو دەبوایە خۆی خەریك بکردایە بە کارو باری ناوماڵەوە و خواردنی ئامادە بکردایە بۆ مێردەکەی و منداڵەکانی کە ئەم کارەش بە بچووکترین کار دانرا کە ئەو ئافرەتە دەیکرد.

نەدەبوو لەگەڵ مێردەکەیدا نانی بخواردایە، بەڵکو دەبوو چاوەڕێی بکردایە تا مێردەکەی یاخود کوڕەکانی نانیان بخواردایە و هەرچی لە بەردەمی ئەوان بمایەتەوە ئەوجا ئەو نانی بخواردایە.

کارێکی تر کە ئافرەتانی هیندی دەبوایە بیانکردایە ئەوە بوو کە دەبوو قاچی مێردەکانیان ماچ بکردایە پێش ئەوەی بخەوتنایە.

لە قانونی «مانوا»دا هاتبوو کە «ئەو ئافرەتانەی کە گوێڕایەڵی مێردەکانیان ناکەن ئەوا لە دنیای دوای مردن دا دەبێت بە کارەکەر"

فرەژنی لە ناو کۆمەڵگای هیندیدا باو بوو لە ناو پیاو ماقوڵان و دەوڵەمەندەکاندا. داستانی «دروپادی» باس لە فرە مێردی دەکات بۆ ئافرەتان کە لە داستانەکەدا هاتووە کە ئافرەتێك شووی کردووە بە پێنج

برا، ئەم کارەش باو بووە لە هەندێ ناوچەی هیندستاندا کە ئافرەتێك شووی دەکرد بە چەند پیاو کە زۆر جار ئەو پیاوانە برای یەکتری بوو. دەگێڕنەوە کە ئەم کارە تا ساڵی (١٨٥٩)ی زایینی مابووە لە ناوچەی سیلانی هیندستاندا، هەروەها دەڵێن ئێستاش ئەم کارە لە هەندێ لە لادێکانی «تبت» دا هەر بەردەوامە.

لە ناو خێزانە هیندەکاندا باوك موڵکداری ژن و منداڵەکانی بوو، بەجۆرێك کە دەیتوانی هەرکات بیویستایە کە بیان فرۆشێت و یان لە ماڵەکە دەریان بکات.

لە قانون نامەی «مانوا» دا هاتووە کە ئافرەتان هەمیشە دەبێت لە ژێر سایە و سێبەری پیاوێکدا بژین کە گەورەو سەروەری یەکەمی باوکە، دووەم مێردە و سێیەم کوڕە. مێرد دەیتوانی بە هەر هۆکارێك یان بیانوویەك بێت دەیتوانی ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات، بەڵام ئافرەتان هەرگیز بۆیان نەبوو داوای تەڵاق بکەن.

یەکێکی کە لە نەریت و ئادابەکانی کۆمەڵگای هندستان مەراسیمی «ساتی“ بوو، کە ئەگەر ئافرەتێك مێردەکەی بمردایە ئەوا دەبوو ژنەکەشیان بە زیندوویی لەگەڵ تەرمی مێردەکەیا بسووتاندایە، یان بە زیندوویی دەیان خستە گۆڕەوە.

**ئافرەت لە شارستانیەتی ئێرانی کۆندا :**

ئەگەر سەیری مێژووی ئێرانی کۆن بکەین ئەوا دەبینین کە سەردەمی ساسانیەکان بەرزترین و پێشکەوتوو ترین سەردەم بووە، بۆیە وا بە باش دەزانم کە ئەو سەردەمە بکەمە نمونە بۆ سەیرکردنی بارودۆخی ئافرەتان.

لە ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا کە لە کۆنەوە بۆیان مابووە و ئافرەت هیچ شەخسیەت و مافێکی نەبوو لە ژیاندا. بە مانای ئەوەی کە وەك مرۆڤێك خاوەنی کەسایەتی و ماف بێت سەیر نەدەکران.

لەو سەردەمەدا ئافرەتان وەك یەکێك لە پێداویستییەکانی ژیان سەیر دەکران کە دەبوو لە خزمەتی پیاواندا بونایە وەیان پیاوێك خاوەنیان بووایە.

دەبوایە ئافرەتان هەمیشە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکی خێزاندا بووایە کە لەو سەردەمەدا بە «کتك ختای» یان «کد خدای» ناویان دەبرد..

لە سەردەمی ساسانیەکاندا قانونی خێزان کۆمەڵگایان دروست دەکرد، یەکێك لەو قانونانە ئەوەبوو کە پیاوان بێ سنور دەیان توانی ژن بهێنن.

پیاوانی کەمدەست و هەژار لە یەك ژن زیاتر نەیان دەتوانی بیهێنن، بەڵام دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندانی ئەو سەردەمە بە قەدەر دەنکی تەزبیحەکانیان ئافرەتیان لە حەرەمسەراکانیاندا کۆدەکردەوە.

مێژوونووسان، جۆرەکانی هاوسەرگیری دابەش دەکەن بە سێ جۆر لەو سەردەمەدا:

**یەکەم: پاشـــاژن.**

ئەم جۆرە ژنهێنانە لە ناو دەوڵەمەندان و خانەدانەکاندا باو بوو، لە ناو ئەم خێزانانەدا دوو جۆرە ژنی مێرددار هەبوو کە ژنی یەکەم پلە و

پایەیەکی بەرزتری بوو و بە (پاشاژن) ناو دەبرا، ئەو ژنانەشی کە خاوەنی مێرد بوون و مێردەکانیان مردبوون و یاخود تەڵاق درا بوون، مێردیان دەکردەوە پێیان دەوترا «چاکرژن» یان (کارەکەرژن).

پاشاژن ڕۆژانە پارەیەکی لە لایەن مێردەکەیەوە وەردەگرت، میراتی بە قەدەر کوڕەکانی وەردەگرت لە دوای مردنی مێردەکەی، بەڵام کارەکەرژن پایەیەکی کەمتری هەبوو لە پاشاژن بە جۆرێك بەس دەوری کارەکەر و یارمەتیدەری پاشاژن بوو لە کارو باری ناوماڵدا. ئەڵبەتە ئەویش پارەیەکی کەمی وەردەگرت تا ئەو کاتەی کە توانای کارکردنی بووایە.

کارەکەرژن دەیتوانی پلەی بەرز بێتەوە و ببنە پاشاژن.

پیاو دەبوایە تا کاتی مەرگ چاودێری پاشاژنی بکردایە و کوڕەکانی تا تەمەنی باڵق بوون و کچەکانی تا کاتی بەشوودان بە خێو بکردایە، بەڵام کارەکەرژن ئەم مافانەی نەبوو. تەنها ئەو منداڵانەی کە کوڕ بوون مێردەکەی بەخێوی دەکردن.

**دووەم: ژن هێنانی ئیستقرازی..**

ئەم جۆرە ژنهێنانە «عاریەتیشیان» پێ دەوت، بە مانای ژنهێنانی کاتی لەگەڵ ئافرەتێکدا کە خۆی خاوەنی مێرد بوو. لەم حاڵەتەدا پیاو دەیتوانی ژنی یەکەمی خۆی بە قەرز بدات بە پیاوێکی تر، کە پێویستی هەبوو بە ژنێك بۆ بەخێو کردنی منداڵەکانی. لەم کاتەدا تەنها ڕەزامەندی پیاو گرنگ بوو، گوێیان نەدەدا بەوەی کە ئایا ئافرەتەکە ڕازییە یان نا.

دیاریکردنی کاتی ئەم ژن بە قەرزدانە لە دەستی پیاواندا بوو.لەم جۆرە ژنهێنانەدا ماڵ و سامانی ئافرەتەکە لە لای مێردی یەکەمی دەمایەوە و

تەنها ئافرەتەکە بە قەرز دەدرایە پیاوێکی دیکە، ئەو منداڵانەشی کە لەو ماوەی ژن بە قەرزدانەدا لە دایك بوونایە ئەوا بە منداڵی مێردی یەکەم دەژمێردران، بەڵام سەرپەرستی و بەخێو کردنیان لە ئەستۆی مێردە کاتیەکەدا بوو تا تەواو بوونی ماوەی ژن قەرزکردنەکە.

**سێیەم: هاوسەرگیری لەگەڵ مەحرەمەکاندا.**

لە ناو کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی ئێراندا ژن و ژنخوازی لە نێوان مەحرەمەکاندا بە بیانووی پاکڕاگرتنی نەسەب و خوێنی خانەوادەکانیان ڕێگە پێدراو بوو، پێیان دەوت «خویذوگدس“.

ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە بەکردنی ئەو کارە ئەوا گوناهە گەورەکانیان پاك دەبێتەوە.

یەکێك لە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە بە ناوی «آدرای ویراز» حەوت خوشکی خۆی مارەکردبوو، هەروەها «بهرام چوبین» خوشکەکەی خۆی مارەکردبوو.

دەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە لەو سەردەمەدا خەڵکی ئێران لە پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت بوون.!

لێرەدا وای بە باش دەزانم کە چەند نمونەیەك بخەمە بەردەستی خوێنەرانی خۆشەویست لە دەسەڵاتدار و پاشایانەی ئێرانی کۆن لە هەمان کاتیشدا لە پەیڕەوانی دینی زەردەشت بوون.

**یەکەم:** جوتە گرتنی «کامبوزیا» لەگەڵ خوشکەکەی.

هێرۆدۆت مێژوونووسی گەورە (٤٨٤-٤٠٩)ی پێش زایین ڕوونکردنەوەی مەسەلەکەی لە کتێبەکەی خۆیدا بەم شێوەیە هێناوەتەوە: «دووەم هەڵەی

کامبوزیا کردی، کوشتنی خوشکەکەی بوو. لەگەڵ خۆیدا بۆ میسری هێناو وەکو ژنی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، هەرچەندە خوشکی بوو لە یەك دایك و باوك بوون.

**دووەم:** «ئاردەشێری» دووەم و مارەکردنی کچەکەی.

یەکەم نووسەری یۆنانی کە ئاماژەی بەم بابەتە کردووە «کتزیس»ە لە ساڵی (٤٤٠)ی پێش زاین ژیاوە. نووسینەکانی ناوبراو لە بەردەستدا نین، بەڵام «پلۆتار» کە لە ساڵی (٦٦)ی زاین لە دایك بووە، لە بارەی ژیانی (ئاردەشێری دووەم) پاشای هەخامەنشین بە پشتیوانی وتەکانی»کتزیاس“ ئەم پاشایە بە مارەکردنی کچەکەی تاوانبار کردووە.

**سێیەم:** قوباد و مارەکردنی کچەکەی.

بابەتی قوباد و مارەکردنی کچەکەی خۆی بۆ یەکەمجار «ئاگاتیاس» کە لە سەردەمی»ئەنەوشیرەواندا» دەژیا، نووسیویەتی «قوبادی» باوکی ”ئەنەوشیرەوان» کچەکەی خۆی کە ناوی»زەنبەق» بوو مارەکرد.

(بطریق ماربها) یەکێك لە ئێرانیانی سەردەمی ئەنەوشیرەوان دەڵێت: ” پیاوچاکی و پەرستش بۆ ئاهورامەزدا، بە جۆرێك بەڕێوە دەچوو کە دەبوایە دایك و کچ و خوشکەکانی خۆیان مارە بکردایە» ئەم پیاوە دەڵێت لە ناو زەردەشتییەکاندا ئەم کارە بە کارێکی ناپەسەند سەیر نەدەکرا، بەڵکو بە کارێکی خێر و پەسەندیان دادەنا لە لایەنی دینییەوە، پاداشتێکی زۆری هەبوو.(زن در حقوق ساسانی ل ٥٦تا٥٨)

پرۆفیسۆر(کریستیان بارتلمە) دەڵێت: «باوکێك کاتێك دەیبینی کە یەکێك لە کوڕەکانی گەورە بووە کاتی ژنهێنانی هاتووە، ئەوا یەکێك لە ژنەکانی خۆی بۆ مارە دەکرد“

**مافەکانی ژن و پیاو لە ئایینی زەردەشتدا..**

لەم ئایینەدا پیاو دەسەڵاتی بەسەر ماڵی ژنەوە هەبوو، ژن بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی مافی دەست تێوەردان و بەکارهێنانی ماڵی خۆی نەبوو، بە پێی یاسای ژن ومێردی، مێرد تەنها کەسایەتییەکی یاسایی بوو، بە بەڵگەی یاسایی دەیتوانی هاوسەرەکەی لە کەل و پەلی ماڵدا بکاتە هاوبەش، لە کاتێکی ئاوادا ئافرەت مافی بەکار هێنانی هەموو کەل و پەلی مێردەکەی هەبوو. هەرکاتێك مێردێك بە ژنەکەی خۆی بوتایە، ئا لەم کاتەوە تۆ ئازادی خاوەنی ئیختیاری خۆتیت، ئەم ژنە لای مێردەکەی دەرنەدەکراو مۆڵەتی ئەوەی هەبوو کە بە ناونیشانی کارەکەرژن مێردێکی کە هەڵبژێرێت. ئەو منداڵانەی کە لەم مێردە نوێیە لە کاتی ژیانی مێردی یەکەمیدا لە دایك دەبوون، دەبوونە منداڵی مێردی یەکەم، مێرد مافی ئەوەی هەبوو کە ژنی گەورەی یان باشترین ژنی بە ئەمانەت بدات بە پیاوێکی دیکە، تاوەکو ئەو پیاوەش لە خزمەتگوزاری ئەو ژنە سوود وەربگرێت. لەم بە ئەمانەت بەخشینەدا مەرج نەبوو ژنەکە ڕازی بێت یان نەبێت، ئەو منداڵانە لەم جۆرە ژن و مێردایەتییە لە دایك دەبوون بە منداڵی مێردی یەکەم دەژمێردران، هەروەك منداڵی مێردی یەکەم مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا، ئەم کارەشیان بە کاری خێر دەزانی بە یارمەتی یەکتر و هاوئایین و دەست کورتیان دەزانی".

**ئافرەت لەسەردەمی جاهیلیەتی عەرەبدا :**

عەرەب پێش ئیسلام ئافرەتیان بە دروستکراوێکی پیس دەزانی لە بەینی مرۆڤ و ئاژەڵدا کە تەنها بەکار دێت بۆ زیاد کردنی نەسل و خزمەتکاری، بوون بە خاوەنی کچ ئەوا بە کارەساتێکی گەورە سەیر دەکرا.

(تمدن اسلام عرب ل ٥٠٣ )

هەرکات هەواڵیان بدایەتە پیاوێك کەوا ژنەکەی کچی بووە، ئەوا خەفەت ڕووی تێ دەکرد و دەم و چاوی ڕەش هەڵدەگەڕا، هەروەك قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت: (وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ )﴿٥٨﴾ النحل

"واتە: خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك (لەو نەفامانە) ڕووی گرژوتاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە"

ئەوان هەرچۆن توتکەی سەگیان دەخستە ناو ئاوەوە هەر ئاواش کچەکانی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکرد تا بەڵکو لە دەستی نەنگی کچدار بوون ڕزگاریان بێت. هیچ کەس ئەو کارەی بە نەنگی نەدەزانی و سەرزەنشتی ئەو کەسانەیان نەدەکرد کە کچەکانی خۆیان دەکوشت، تەنانەت ژنەکانیشیان نەیاندەتوانی ببنە ڕێگر لەبەردەم باوکاندا بۆ کوشتنی کچەکانیان، چونکە تەنها پیاو بوو کە دەسەڵاتی هەبوو بەسەر منداڵەکانیدا و بڕیاری ژیان و مردنی دەدان.

عەرەبە جاهیلەکان بە هێنانی یەك ژن ڕازی نە دەبوون، ئەم کارەیان بۆ ئەوە دەکرد یان بۆ زیاد کردنی منداڵ بوو یان بۆ کاری سیاسی بوو، چونکە کچی پیاوانی ناودار و بە دەسەڵاتیان دەهێنا.

ژنهێنان لەو سەردەمەدا چەند جۆری هەبوو، کە هەندێکیان باس دەکەین.

**یەکەم:** ژنهێنان بە شێوەی دانی مارەیی..

ئەم جۆرە ژنهێنانە وەك ژنهێنانی ئەمڕۆ وایە کە کوڕەکە دەچێتە خوازبێنی ئەو کچەی کە خۆی هەڵی بژاردووە، مارەیی دەدات بە کچەکە و مارەیی دەکرد و دەیکردە هاوسەری خۆی.

**دووەم:** ژنهێنانی موتعە.

لەم جۆرەدا ژنهێنان کاتیبوو کە پیاوەکە کاتێکی دیاری دەکرد، کاتێك کە کاتەکە کۆتایی دەهات ئەوا ڕاستەوخۆ پەیوەندی ژن و مێردییەکەیان هەڵدەوەشایەوە. ئەڵبەت پیاو مارەییەکی دەدا بە ژنەکە و ئەو منداڵانەشی کە لەو کاتەدا لە دایك دەبوون مافی سەرپەرشتی و میراتگریان هەبوو لە لایەن ماڵی پیاوەکەوە.

**سێیەم:** ژنهێنانی زەعینە.(ظعينة).

هەرکاتێك پیاوێك لە کاتی جەنگدا ژنێکی بە دیل بگرتایە، ئەوا مافی ئەوەی هەبوو کە مارەی بکات لە خۆی و ئافرەتەکەش نەیدەتوانی هیچ ناڕەزاییەك دەرببڕێ، چونکە بە بەشێك لە موڵك و سامانی پیاوەکە حساب دەکرا، ئەم جۆرە ژنهێنانە بەبێ مارەیی و گرێبەست (عقد) دەکرا.

**چوارەم:** ژنهێنانی شغار (ژن بە ژن).

کچێك یان خوشکێکی خۆی لە پیاوێك مارە دەکرد و لە جیاتی مارەیی یان ماڵ و سەروەت ئەوا دەبوو ئەویش کچێك یان خوشکێکی بدایەتێ. لەم کاتەدا تەنها ڕەزامەندی پیاوان گرنگ بوو، ئافرەتان نەیاندەتوانی هیچ ناڕەزاییەك دەرببڕن، هەر وەك کاڵایەك ئاڵوگۆڕیان پێ دەکردن.

**پێنجەم:** ژنهێنانی مبادلە (ژن گۆڕینەوە).

ئەم ژنهێنانە بە شێوەیەك بوو کە پیاو دەیتوانی یەکێك لە ژنەکانی خۆی بدات بە پیاوێکی کە. لەو سەردەمەدا ئەگەر پیاوێك ژنی کەسێکی کەی بە دڵ بوایە ئەوا زۆر بە سادەیی پێشنیاری دەکرد بە مێردەکەی کە

ژنەکانیان بگۆڕنەوە، ئەم ژنگۆڕینەوەیە بە بێ مارەکردن و مارەیی دان بە ئافرەتەکە بوو. تەنها پیاوەکە دەی وت: (انزل لي عن امرأتك و أنزل لك عن امرأتي).

عمدة القاری، ج ١٠، ص ١٢٣؛ بلوغ الارب، ج ٢، ص ٥و المفصل، ج ٥، ص (٥٣٧)

**شەشەم:** ژنهێنانی ئیسبزاع «استبضاع".

ئەم جۆرە ژن و مێردایەتییە بۆ منداڵبوون بوو، ئەگەر پیاوێك حەزی لە منداڵێك بوایە کە چەند خەسڵەتێکی تایبەتی تێدا بوایە، خۆی خاوەنی ئەو خەسڵەتانە نەبوایە، بۆ نمونە منداڵێکی دلاوەر و نەترس و ئازاو بە جەرگ، یاخود منداڵێکی شاعیر و قسەزانی هەبێت. ئەوا ژنەکەی دەنارده لای ئەو پیاوانەی کە خاوەنی ئەو خەسڵەتانە بونایە، بۆ ماوەیەك تا دەبووە خاوەنی منداڵێك لەو پیاوە، ئەو منداڵەشی کە لە دایك دەبوو مێردی یەکەمی ئەو ئافرەتە دەبووە باوکی منداڵەکە، دوای ئەوەی کە ئافرەتەکە حاملە دەبوو ئەوا دەگەڕایەوە بۆ لای مێردی یەکەمی خۆی.

**حەوتەم:** ژنهێنانی مقت(ضیزن).

یەکێکیتر لەو ژن و ژنخوازییانە کە باو بوو لە ناو خەڵکی ئەو سەردەمەدا، ئەم جۆرە ژنهێنانە بوو. ئەگەر پیاوێك بمردایە هەروەك چۆن سەروەت و سامانەکەی دەبووە میرات بۆ منداڵەکانی ئەوا ژنەکەشی دەبووە میرات، ئەگەر پیاوەکە کوڕی گەورەی هەبوایە ئەوا ژنەکە دەبووە موڵکی کوڕە گەورەکەی.

ئەگەر ژنەکە گەنج بوایە و سیمایەکی جوانی هەبوایە ئەوا کورەکە دەیکردە ژنی خۆی، ئەگەر نا پەڕۆیەکی دەدا بەسەر ژنەکەی باوکیدا و بە

مارەییەکی تازە دەیدایە یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی، ئەو مارەییەشی کە دەدرا لە حەقی ئەو ئافرەتەدا بۆ کوڕە گەورەی ئەو پیاوە دەبوو.

ئەگەر بهاتایەو ئەو پیاوەی کە مردووە و خاوەنی کوڕ نەبووایە ئەوا ئافرەتەکە کەس و کاری پیاوەکە دەبوونە خاوەنی، خزم و کەس و کاری پیاوەکە هەرکەس دەهات دەیووت کە خۆی دەیەوێت ببێتە خاوەنی ئافرەتەکە، بۆیە هەرکەس زووتر پارچە قوماشێکی بدایە بەسەر ئافرەتەکەدا، ئەوا دەبووە خاوەنی ئافرەتەکە.

ئەو کەسەشی دەبووە خاوەنی ئافرەتەکە ئەگەر بیویستایە ئەوا ئافرەتەکەی دەکردە ژنی خۆی، ئەگەر نەدەیتوانی مەحرومی بکات لەوەی کە مێرد بکات بە یەکێکی کە، دەبوو خزمەتی ماڵی ئەو کەسەی بکردایە تا ئەو کاتەی کە دەمرد.

هەندێك کەس دەڵێن ژنهێنانی (ضیزن) واتا پەیوەندی بەستنی ژن و مێردایەتی لەگەڵ ژنی باوکدا، ئیتر هیچ جیاوازی نەبوو ئاخۆ باوکە کە مردووە یاخود ژنەکەی تەڵاق داوە.

**هەشتەم:** هاوسەرگیری ڕهط (یاخود هاوسەرگیری بە کۆمەڵ).

لەم جۆرە هاوسەرگیرییەدا کۆمەڵێك پیاو کە لە دە کەس کەمتر نەبوون ژنێکیان دەهێنا، لە بەرانبەر ئەو کارەدا دەبوو بە هەموویان بژێوی ژیانی ئافرەتەکەیان دابین بکردایە.

ئەگەر ئەو ئافرەتە منداڵی ببوایە ئەوا دوای لە دایکبوونی منداڵەکە، ئەگەر کوڕ بوایە ئەوا یەك یەك پیاوەکانی بانگ دەکردە ماڵەکەی خۆی و بە یەکێکیانی دەوت کە ئەو منداڵە، منداڵی ئەوە ئەو پیاوەشی کە

هەڵدەبژێردرا نەیدەتوانی هیچ نارەزایەتیەك دەرببڕێت، خۆ ئەگەر ئەو منداڵەی کە لەدایك دەبوو کچ بوایە ئەوا هیچ کام لە پیاوەکان خۆی نەدەکردە خاوەنی، چونکە هیچ کامیان ڕازی نە دەبوون ببنە باوکی کچ.

**نۆیەم:** هاوسەرگیری خدن.

لەم جۆرە هاوسەرگیرییەدا ژن و مێرد پەیمانی ژن و مێردایەتییان دەبەست، بەڵام پیاوەکە هیچ مارەیی یان خەرجی بژێوی ژیانی ئافرەتەکەی نەدەدا. ئەم جۆرە ژن و مێردایەتیەش هیچ ڕەسمیەتێکی نەبوو، تەنها نهێنی نێوانی ژن و پیاوەکە بوو.

کۆمەڵگا ئەو جۆرە ژن و مێردایەتییەی بە ڕەوا دەزانی تا ئەو کاتەی ئاشکرا نەبوایە و بەس نهێنی نێوان ژن و پیاوەکە بوایە، خۆ ئەگەر ئاشکرا ببوایە ئەوا مایەی بێ ئابڕویی بوو بۆیان، بۆیە دەیان وت"ما أستتر فلا بأس وما ظهر لؤم"

**دەیەم:** هاوسەرگیری (جمع).

یەکێك لە سونەتەکانی عەرەبی سەردەمی جاهیلیەت ئەوەبوو لە ڕێگای ئافرەتان و کەنیزەکانەوە ماڵ و سامانێکی زۆریان کۆدەکردەوە و لە ناو بازاڕدا ماڵێکیان دروست دەکرد و ئاڵایەکی تایبەتیان هەڵدەکرد لەسەر ئەو ماڵەدا، بەمانای ئازادی و سەردانی هەموو کەس ئازادە بۆ ئەو ماڵە، کۆمەڵێکی زۆر لە پیاوان سەردانی ئەو مالەیان دەکرد، وە بەو ئافرەتانەیان دەوت (بغایا) واتە (لەشفرۆشان)، جەهالەتی ئەو خەڵکە لەو سەردەمەدا نەك ئەو کارەیان بە ناڕەوا نەدەزانی، بەڵکو ئەگەر یەکێك لە ئافرەتەکان منداڵی ببوایە ئەوا کەسانی شارەزایان بانگدەکرد کە باوکی

منداڵەکە بدۆزنەوە بەوەی سەیریان بکەن و بزانن منداڵەکە لە کام لە پیاوەکان دەچێت.

مێژوونووسان باس لە جۆرێکی تری هاوسەرگیری دەکەن کە لە خێزانێکدا چەند برا هەبوایە بە هەموویانەوە ژنێکیان دەهێنا، بەوتەی کە دەیان وت ماڵمان یەکە دەبێت ژنیشمان یەك بێت، لەم پەیمانەشدا برا گەورە سەرۆکی ئەو خانەوادەیە بوو، ئافرەتەکە لە ژێر دەستی برا گەورەکەدا بوو، ئەگەر یەکێك لە براکانی کە بڕۆشتنایەتە لای ئافرەتەکە ئەوا گۆچانێکیان لەبەردەم ژوورەکەدا هەڵدەواسی بۆ ئەوەی نیشانەیەك بێت بۆ براکانی تر کە ئەو لای ئافرەتەکەیە تا کەسێکی کەیان نەچێتە ژوورەوە.

ئەم ڕایەی مێژوو نوسانیش لە کتێبی (المفصل، ج٥،ل ٥٤٠-٥٤١)دا باس کراوە.

عەرەبەکانی ئەو سەردەمە هێنانی دوو خوشکیان لە یەککاتدا بە ڕەوا دەزانی و هەرگیز بە حەڕامیان نەدەزانی. ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە ئافرەتان لەو سەردەمەدا حەقی وەرگرتنی میراتیان نەبوو.

### ئـافرەت لە ئیســلامدا :

جەهل و تاریکی هەموو جیهانی گرتبوو، ڕەوشت و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی لە دەست ئیبلیس و قوتابییەکانی ئیبلیسدا بوو. ئەو خودایانەی کە لە دار و بەرد دروست کرابوون لە ماڵ و پەرستگاکاندا دانرابوون و دەپەرستران، بەڵام لە ڕاستیدا هەواو هەوەس بوو کە حوکمی خوایەتی دەکرد لەناو دڵی خەڵکاندا. ئافرەتانیش بوونە کاڵایەك بۆ دامرکاندنەوەی هەوا و هەوەسی پیاوان و لەژێر دەسەڵاتی پیاواندا زوڵمیان لێ دەکراو

ئازار و ئەشكەنجە دەدران. بۆیە لە هەموو لاوە هاواری فریاكەوتن دەبیسترا.

ئەوە بوو ئیسلام لە ناو جەزیرەی عەرەبدا سەری بەرز كردەوە و بە باڵا بەرزەكەیەوە لە نێوان كۆمەڵگادا وەستاو وتی منم فریادڕەسی هەموو مەزڵومان و ستەملێكراوانم، نەك تەنها فریادڕەسی ئافرەتان، بەڵكو فریادڕەسی هەموو مرۆڤایەتی بوو.

بۆیە كەوتە فێركردنی داب و نەریتەكانی ژیان و بووە یاریدەدەری مرۆڤایەتی بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چاكەكانی ژیان.

ئافرەتانی لە ناو زەلكاوی جەهل و نەفامی و ئازار و ئەشكەنجەدا دەرهێنا و لەسەر بڵندترین لوتكە و بەرزترین جێگادا داینان.

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئافرەت و پیاو بە یەك چاو سەیر دەكرێن و هەردووكیان بە مرۆڤ دەزانرێن، بە پێچەوانەی نەتەوەكانی كەی پێش ئیسلام كە بەس بە تەنها پیاوانیان وەك مرۆڤ سەیر دەكرد.

ئافرەت و پیاو بە یەك چاو سەیر دەكرێن و یەكسانن لە دینی ئیسلامدا لە ڕووی بەندایەتی و خواپەرستی و بەدەست هێنانی مەقاماتی مەعنەوی و ئینسانییەكان، هەردوو یەكسانن و بەرپرسن لە پێكهێنانی خانەوادە و پەروەردەكردنی منداڵ، داب و نەریتەكانی كۆمەڵگا.

خوای گەورە لە ئایەتێكدا ڕوونی دەكاتەوە كە پیاوان و ئافرەتان بەگشتی لە نەفسێ، یان لە كەسێك دروست بوون.

وەك دەفەرمووێت: «یاأیها الناس اتقو ڕبكم الذي خلقكم من نفس واحدة»

وە هەر لەو تاکە کەسەش ئافرەتی دروست کردووە، چۆن پیاوانی تری لێ دروست کردووە وەك دەفەرمووێت:

"وخلق منها زوجها». «وبث منهما رجالا كثيرا او نساء".

هەر لەم دوانەشەوە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی دروست کردووە، خوای گەورە ئافرەت و پیاوی بە یەك چاو سەیرکردووە، وەك لەم ئایەتانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ماف و چاکە و سزادا دادوەر بووە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا٣٥﴾ [الأحزاب]

هەر ئیسلام بانگی پیاوان دەکات کە بەجۆرێکی زۆر باش مامەڵە لەگەڵ ئافرەتەکاندا بکەن، وەك دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا١٩﴾ [النساء: ١٩]

واتە:"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دروست نییە بۆتان ئافرەتان بە زۆر بکەنە میراتی خۆتان و دەستیان بەسەردا بگرن، (وەکو کەل و پەلی تری ناو ماڵ)، زۆریان لێ مەکەن تا هەندێك مارەییتان بۆ بگەڕێننەوە، مەگەر ئەوان گوناهێکی ئاشکراو دیاریان ئەنجامدا، با ڕەفتار و کردار

و گوفتارتان چاك و جوان بێت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بێزار بوون، دوور نییە دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکات بە مایەی خێرو بێری زۆرو بێ سنوور".

لە بەڕێوەبردن و دابەشکردنی کاروباردا چەند جیاوازییەکیان هەیە، ئەم جیاوازیانەش لەسەر بنەمای جێگا و پایەی ئافرەتانە لە کۆمەڵگادا کە هەریەکەیان کار و بەرپرسیاریە خۆی دەزانێت چییە، ئەمەش خزمەتکردن بە ئافرەتان و ڕێزلێنانیانە نەك نادادپەروەری و بە کەم سەیرکردنی ئافرەتان. دینی ئیسلام دەیەوێت ئافرەتان بەوپەڕی مافەکانی خۆیان بگەن بەو شێوەیەی کە شایستەی مرۆڤێکە لەم ڕووەشەوە ڕێگای نیشان داون تا بتوانن بە ئیختیار و ئیرادەی خۆیان ڕێگای ژیانی بەختەوەری هەڵبژێرێت.

خوای گەورە لە قورئاندا بەس داوا لە پیاوان ناکات کە کاری چاکە ئەنجام بدەن و واز لە خراپە بێنن، بەڵکو داوا لە مرۆڤ دەکات لە ئافرەتیش وەك پیاو سەیر دەکرێت و داوای لێکراوە کە خۆی دوور بگرێت لە خراپە و کاری باش ئەنجام بدات.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: «یا ایّها النّاس و یا ایّها الّذین آمنوا"

ئەم بانگکردنەش تەنها مەبەست لە پیاوان نییە، بەڵکو ئافرەت و پیاو پێکەوە.

قورئانی پیرۆز ئافرەتان کە لەوپەڕی بێ مافی و بێدەسەلاتی و بەکەم سەیر کردنەوە، کە بە کەسێکی کەم عەقڵ و دوور لە هەرچی بڕیاردانە بۆ ژیانی خۆی! گەیاندنیە ئەوپەڕی سەرفەرازی و بەرزیتی و تاجی

ڕێزلێنانی «ولقد كرمنا بني آدم»ی نایە سەر سەری ئافرەتان و شانبەشانی پیاوان کردنییە جێنشینی خوای گەورە لەسەر زەویدا.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا هەموو ئەو بەڵگانەی بە درۆ خستەوە کە جاهیلان دەیان وت کە ئافرەتان چینێکی ناتەواون و دەبێت تەنها بەکار بهێنرێت بۆ ئارەزووەکانی پیاوان، وە بە درۆ خستنەوەی ئەو دینانەی کە پێش هاتنی دینی ئیسلام بوون و دەستکاریان کرابوو بەپێی بەرژەوەندییەکانی دەسەڵاتداران.

لە دینی ئیسلامدا بە پێچەوانەی هەموو دینەکانی تر حوکمی دەسەڵاتداران و جاهیلان کە دەسەڵاتیان هەبوو لە ناو کۆمەڵگای پێش هاتنی ئایینی ئیسلامدا، ئافرەتانی یەکسان کردووە لە زۆربەی مافەکاندا لە بەرامبەر پیاواندا، ئەگەر چەند جیاوازییەکی بچوك ببینین لە ڕووی میرات و سپاردنی بەڕیوەبەرایەتی خانەوادە بە پیاوان. ئەمانە بە جیاوازیکردنی ژن و پیاو ناژمێردرێت، بەڵکو ئەم جیاوازییانە لە ڕووی ژیانی کۆمەڵگاکەیە کە ئافرەت و پیاوانی تێدا دەژین، نەك جیاوازی کردن بێت لە ڕووی مرۆڤایەتی و بەندایەتیکردنی خوای گەورەوە بێت.

**یەکسانبوون لە ڕووی بەدیهێنانەوە :**

ئەگەر بمانەوێت سەیری قورئان و قانونەکانی دینی ئیسلام بکەین لە بارەی بەدیهێنانی پیاو و ئافرەتەوە، ئەوا باشتر وایە پێشتر سەیری کتێب و مەزهەبەکانی تری بێجگە لە ئیسلام بکەین تا بزانین لەو بارەیەوە چی دەڵێن، سەیری عەقڵ و هزر و بیری خەڵکانێك بکەین کە لەسەردەمی جاهلیدا ژیاون بە تایبەت ئەو خەڵکەی کە لە دوورگەی عەرەبیدا ژیاون ئاشنا ببین بۆ ئەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزمان باشتر بۆ ڕوون بێتەوە.

ئەو کتێبانەی کە ئەمڕۆ لە بەردەستن و دواکەوتوانێکی بەرچاویان لە جیهاندا هەیە(تەورات و ئینجیل)ە لەم دوو کتێبەدا ئافرەت هەروەك لە کۆمەڵگاکانی تردا وەك مرۆڤێك سەیر نەکراوە، بەڵکو بە شتێکی پیس و قیزەون سەیر کراوە، کە دەبێت بەکار بهێنرێت لە ڕێگای بەرژەوەندییەکانی پیاواندا.

لە داستانی دەرکردنی ئادەم لە بەهەشتدا لە تەورات و ئینجیلدا هاتووە کە «حەوا» لە باخی (عەدەن) بووە هۆی فریودانی ئادەم و وای لە ئادەم کرد تا سەرپێچی لە فەرمانی خوا بکات، تا لەبەری ئەو درەختە بخوات کە خوای گەورە خواردنی قەدەغە کردبوو.

لە تەوراتی سفری بەدیهێنان (التکوین) بابی (٣) ئایەتی (٦)دا هاتووە و دەڵێت: «لەدوای ئەوەی کە «شەیتان» «حەوای» فریو دا تا لە بەری ئەو درەختە بخوات، حەواش بۆ ئەوەی ئادەم فریو بدات تا ئادەمیش بێبەش نەبێت لەو سەرپێچیکردنەی خوای گەورە و ئەویش سزا وەربگرێت.

لە هەمان بابدا لە ئایەتی (١٢) هاتووە کە کاتێك خوای گەورە بە ئادەمی وت من خواردنی بەری ئەو درەختەم لێ قەدەغە کردبووی بۆ خواردت؟ لە وەڵامدا ئادەم دەڵێت: «حەوا منی فریو داوە و لە بەری ئەو درەختەی داومەتێ و خواردومە».(تەورات چاپی لەندەن).

لە ئینجیلی برنابا فەصلی (٤٠)ئایەتی (٢٦و٢٧)دا هاتووە کە «کاتێك شەیتان حەوای فریودا و لەبەری درەختەکەی خوارد، ئادەم خەوتبوو کاتێك لەخەو هەستا حەوا لەو میوەیەی دا بە ئادەمیش ئەویش خواردی، کەوا بوو حەوا ئادەمی فریودا» «ئینجیل برنابا، تەرجەمەی سەردار کابولی“

ئەو کەسانەی کە تەفسیری کتێبە پیرۆزەکان دەکەن و ئەربابانی کلیساکان بەم جۆرە تەفسیری ئەم ئایەتانە دەکەن کە «ئافرەت بۆتە هۆی بەدبەختی مرۆڤایەتی، ئەگەرنا ئادەم بۆ هەتا هەتایە لە بەهەشت دەمایەوە» بۆیە بە چاوێکی نەفرەت ئامێز سەیری ئافرەتان دەکەن، بەڵام قورئانی پیرۆز ئادەم و حەوا بەیەك چاو سەیر دەکات و هەردووکیان بە سەرپێچیکردن لە حوکمی خوای گەروە باس دەکات، نەك ئەوەی کە هەموو گوناهەکە بکاتە گەردنی حەوا بە تەنها. هەروەك کە قورئانی پیرۆز دەفەرموویت: « وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلاَ مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَـذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الْظَّالِمِينَ «﴿٣٥﴾ البقرة

واتە:"ئینجا وتمان : ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەر و نیشتەجێ بن لەهەر کوێ حەزدەکەن بخۆن و بخۆنەوە بە تێر و تەسەلی، بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەون (درەختێکی دیاری کراو بۆ تاقی کردنەوە لێیان قەدەغە کرا ) ئەگینا دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە".

هەردووکیان شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیان تا لە بەری ئەو درەختە بخۆن «فوسوس لهما الشیطان» ﴿٢٠﴾ اعراف.

وە هەردوکیان سزا دران لە لایەن خوای گەورە وە «وَناداهُما رِبّهما الم أنهکما عن تلکما الشجرة".

سزای هەردووکیان وەك یەکبوو کە دەرکردنی هەردووکیان بوو لە بەهەشت " فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ «﴿٣٦﴾" البقرة.

شەیتان(فرسەتی لێهێنان) و لە خشتەی بردن (وایلێکردن لە بەر و بومی درەختە قەدەغە کراوەکە بخۆن) و لەو شوێنە (خۆش و پڕلە نازو نیعمەتە) بەدەرکرنی دان، ئەوسا پێیان وتن: (مادەم سەرپێچیتان کرد ئیتر لێرە جێتان نابێتەوە)، دەبێت دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، جا(لەوێ) هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شەیتان دوژمنی ئێوەیە و بەردەوام هەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوانتاندا بەرپا بکات)، تاماوەیەکی دیاری کراو نیشتەجێ دەبن لە زەویدا و لە ناز و نیعمەتەکان سوود وەردەگرن و بەهرەوەر دەبن".

ئادەم و حەوا هەردووکیان تەوبەیان کرد «قالا ربّنا ظلمنا انفسنا و ان لم تغفر لنا و ترحمنا لنكوننّ من الخاسرين»﴿٢٣﴾ الأعراف

واتە: "ئەو کات هەردوولا هەستیان کرد بە وەی کە تاوانیان کردووە.... وتیان پەروردگارا ئێمە ستەمان لە نەفسی خۆمان کردووە ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبیت بەزەیی خۆت بەسەرماندا نەڕێژیت ئەوا ئێمە لە خەسارەت و زەرەر مەندینەکانین.

کەواتە ئەنجامەکە ئەوەیە کە ئافرەت و پیاو لە ڕووی بەدیهێنانەوە یەکسانن و هیچ کامێکیان ڕێزی نەدراوە بەسەر ئەویکەیاندا، ئەگەر زیاتر ڕێزلێنانێك بێت ئەوا لە ڕووی دینداری و بەندایەتییەوەیە بۆ خوای گەورە.

**یەکسان بوون لە ڕووی کەمالات و لەپێشدانان مرۆڤایەتیەوە»**

یەکێکی کە لە تێڕوانینە تەحقیر ئامێزەکانی کە، کە بەرانبەر بە ئافرەتان دەکرا لە سەردەمی جاهیلی و لە دینە دەستکاری کراوەکاندا ئەوە بوو کە ئافرەت لە ڕووی مەعنەوی و ڕۆحانییەوە. لاوازە و ناتوانێت بگاتە پلە بەرزەکانی مرۆڤایەتی، هەروەك چۆن پیاوان دەگەنە ئەو پلەیە. قورئانی پیرۆز لە زۆر جێگادا بۆمان باس دەکات کە پاداشت وەرگرتن بۆ بەندایەتی کردنی خوای گەورە لە ڕووی ڕەگەزەوە نییە، بەڵکو پەیوەستە بە ئیمان و کار و کرداری مرۆڤەکانەوە. قورئانی پیرۆز هەروەك چۆن کار و فرمانی بۆ پیاوان داناوە و پێیان ڕادەگەیەنێ کە کاری چاکە بکەن هەروەها بە ئافرەتانیش دەڵێت:

”انّ المسلمين و المسلمات و المؤمنين و المؤمنات و القانتين و القانتات و الصّادقين و الصّادقين و الصّادقات و الصّابرين و الصّابرات و الخاشعين و الخاشعات و المتصدّقين و المتصّدقات و الصّائمين و الصّائمات و الحافظين فروجهم و الحافظات و الذّاكرين اللّه كثيراً و الذّاكرات اعد اللّه لهم مغفرة و اجراً عظيماً» ﴿٣٥﴾ ألأحزاب

واتە: ”بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، پیاوان و ئافرەتانی مل کەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر و ئارامگر، پیاوان و ئافرەتانی لە خوا ترس، پیاوان وئافرەتانی بەخشندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژوو وان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك، وە ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین ولێبوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایان خواوە بۆ ئامادە کراوە...“

هەروەها پەیمانی چوونە بەهەشت بە هەردوو ڕەگەز دەدات، نەك تەنها بە پیاوان، هەروەك دەفەرمووێت:

و من عمل صالحاً من ذكرٍ و انثى و هو مؤمن فاولئك يدخلون الجنّة ﴿٤٠﴾ غافر.

واتە: "ئەوەی کردەوەی چاکە دەکات لە نێر و مێ (کوڕان، کچان) لە کاتێکدا خاوەنی باوەڕێکی دامەزراوبێت ئەوا ئەوانە دەچنە بەهەشت..."

هەروەها لە جێگەیەکی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە خوای گەورە پەیمانی بەخشینی نیعمەتەکانی خۆی بە هەردوو ڕەگەز دەدات لە بەهەشتدا، دەفەرمووێت: وعد اللّه المؤمنين و المؤمنات جنّاتٍ تجرى من تحتها الانهار خالدين فيها ﴿٧٢﴾ التوبة.

واتە: "خوای گەورە پەیمانی داوە بە پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار کە دەچنە بەهەشتێك بە ژێریدا ڕووبار دەڕوات و وە بۆ هەتا هەتایی لەوێدا دەمێننەوە"

لە قورئانی پیرۆز لە پشت هەموو پیاوێکی گەورەوە ئافرەتێکی گەورە و پایە بەرز هەیە، هەروەك لە پشتی پێغەمبەران ئادەم و ئیبراهیم (سەلامی خوایان لێ بێت) خێزانەکانیان ناو براوە، لە پشتی پێغەمبەران موسی و عیسی (سەلامی خوایان لێ بێت) دایکانیان ناو براون. هەروەها خێزانی هەردوو پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێ بێت) نوح و لوط ناوبراون بە ئافرەتانێکی ناشایستە بۆ هاوسەرەکانیان، ژنەکەی فرعەون بە ئافرەتێکی گەورەو پایە بەرز کە گرفتاری کابرایەکی بەدکار بووە ناودەبات.

خوای گەورە دەربارەی حەزرەتی مەریەم دایکی پێغەمبەر عیسی (سەلامی خوایان لێ بێت) دەفەرمووێت:

فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٣٩﴾ آل عمران.

واتە:"جا یەکسەر فریشتە جبرائیل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا لە محرابەکەدا وەستا بوو، نوێژی دەکرد، (وتی)بەراستی خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە بەخشینی کوڕێك ناوی یەحیایە، بەراستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایە و گەورە و ڕێزدارە و خۆپارێزە لە گوناهان و پێغەمبەرێکە لە چاکان".

هەروەها دەفەرمووێت: إِذْ قَالَتِ الْمَلآئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴿٤٥﴾ آل عمران.

واتە: (هەروەها یادیان بهێنەوە) کاتێك فریشتەکە بە مەریەمی وت: ئەی مەریەم بەراستی خوا مژدەت دەداتێ: بە وشەیەکی خۆی (کە فرمانی ـ کن فیکون ـ ە، ڕۆڵەیەکت پێ ببەخشێت) کە ناوی(المسیح)ە، عیسای کوڕی مەریەمە، کە پیاو ماقووڵ و پایە بەرزە لەم دنیادا، لە قیامەتیشدا لە دەستەی نزیکانە (لە ئێمەوە).

هەروەها لە جێگایەکی کەدا هاتووە ( وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ) ﴿٤٢﴾آل عمران.

واتە: "(هەروەها یادیان بهێنەوە کاتێك) جبرائیلی فریشتە وتی: ئەی مەریەم بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووە و خاوێن و پاکیزەی کردوویت، هەڵی بژاردوویت و ڕێزی داویت بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا".

خوای گەورە پێی دەفەرمووێ: کە عیبادەتی خوای گەورە بکات (يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ)﴿٤٣﴾ آل عمران.

واتە: ”ئەی مەریەم ملکەچ و فەرمانبەرداری پەروەردگارت بە، سوژدە و کڕنووشی بۆ ببە لەگەڵ کڕنووشبەراندا“.

هەروەها خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیی بۆ دەنارد لە ڕێگای غەیبەوە (فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَـذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ)﴿٣٧﴾آل عمران.

واتە: ”ئینجا پەروەردگاری بەشێوەیەکی جوان و پەسەند مەریەمی وەرگرت، زۆر بەجوانی پێی گەیاند، زەکەریای کردە مامۆستا و سەرپەرشتی (کە هەم خزم و هەم پێغەمبەر بوو، تا بەچاکی دینداریی فێر بکات، پاشان کە مەریەم گەورە بوو) هەرکاتێك زەکەریا دەچوو بۆ سەردانی لە شوێنی خواپەرستیەکەیدا دەیبینی ڕزق و ڕۆزیی و ناز و نیعمەتی جۆراوجۆری لایە، زەکەریا وتی: ئەی مەریەم ئەم هەموو ڕزق و ڕۆزییەت لەکوێ بوو؟!، مەریەم لە وەڵامیدا وتی: ئەوە لە لایەن خواوەیە، ئەو بۆم دەنێرێت، بەڕاستی خوا بە هەر کەس بیەوێت ڕزق و ڕۆزیی بێ سنوورو بێ هۆکار دەبەخشێت“.

کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئافرەتان لە گەیشتن بە بەرزترین پلەی مەعنەویەت و ئیمان داری و لە خوا نزیك بوون لەگەڵ پیاوان هیچ جیاوازیەکیان نییە.

قورئانی پیرۆز ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئافرەتان و پیاوان هیچ جیاوازیەکیان نییە لە ڕووی بەندایەتییەوە، ئەوەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە

ئەم دوو ڕەگەزە لەڕووی هێزو توانای وەرگرتن و فێربوونەوە جیاوازیان نییە، هەروەك چۆن لەم سەردەمەدا هەڵەیەکی زۆر دەکرێت لە ڕووی هێزو توانای ئافرەت و پیاوانەوە بە تایبەت لە کۆمەڵگا ڕۆژئاوایەکاندا کە تەنانەت لە ڕووی ئەرك و فرمان و پێگە کۆمەڵاتیەکانەوە هیچ جیاوازیەك نابینن لە نێوان ئافرەت و پیاواندا کە ئەمەش وایکردووە لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان کە کۆمەڵگایەکی یەك ڕەگەزی بێت، تا ئەو ڕادەیەی کە ئافرەتان لە ئافرەت بوونی خۆیان نەفرەت بکەن و بکەونە لاسایی کردنەوەی پیاوان، هەموو هێزو توانای خۆیان بخەنە کار تا بتوانن وەك پیاوان ڕەفتار بکەن، چونکە کۆمەڵگاکە ئەو قانونەی داناوە کە دەبێت وەك پیاوان هەوڵ بدەن. ئەم کارەش وای لە ئافرەتان کردووە کە بە تەواوەتی ئەرك و فرمانە سەرەکییەکانی خۆی کە گەورەترینیان دایکایەتییە لە بیر بکەن، لە بریتی ئەوە لەگەڵ پیاواندا کێبەرکێ بکەن لە ئیش و کارەکانی دەرەوەدا.

کۆمەڵگایەك کەلە سەر بنەماکانی ئایینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز دابمەزرێت ئەوا کۆمەڵگایەکی دوو ڕەگەزی دەبێت، کە هەردوو ڕەگەزی ئافرەت و پیاو ئەرك و فەرمانی تایبەتی خۆیان هەیە، وە لەم دابەشکردنی ئەرکانەدا بەشی بە دەستهێنانی بژێوی ژیان و کارکردن لە ئەستۆی پیاوان دایە، هەروەك چۆن بەڕیوەبردنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ لە ئەستۆی ئافرەتاندایە، کە ئەمە گەورەترین و پیرۆزترین کارە، چونکە ئەو ڕەوەندەی کە ئەوان پەروەردەی دەکەن پێکهێنەری کۆمەڵگان لە داهاتوودا.

تەنها بەم شێوەیەیە کە کۆمەڵگایەکی سەلامەت و ژیانێکی ئاسودە بۆ هەموان فەراهەم دێت، قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دەفەرمووێت:

وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾ البقرة

واتە: "دایکان (تەڵاقدراو بن یان نا) دوو ساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن بۆ هەر کەس کە دەیەوێت شیری تەواو بدات و پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خاوەنی منداڵەکەیە (واتە باوکی یان بەخێوکەری) ڕزق و ڕۆزیی و پۆشاك بەشێوەیەکی جوان و پەسەندی ئایین ئامادە بکات، ئەرك لەسەر هیچ کەس دانانرێت جگە لە توانای خۆی، نابێت هیچ دایکێك زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەکەیەوە، هەروەها باوکیشی نابێت زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەکەیەوە و لەسەر میراتگری منداڵەکەشە وێنەی ئەو مافانەی کە باسکران، خۆ ئەگەر دایك و باوك هەر کاتێك بە ڕەزامەندی و پرس و ڕای هەردوولایان ویستیان منداڵەکەیان لە شیر ببڕنەوە، ئەوە قەیناکات و هیچ گوناهیان لەسەر نییە لەو بارەیەوە، خۆ ئەگەر ویستتان دایەن بۆ شیرپێدانی منداڵەکانتان بگرن، ئەوەش قەیناکات و هیچ گوناهتان لەسەرنییە، بەمەرجێك ماف و کرێیان بەجوانی و شایستە پێ بدەن، لە خوا بترسن و پارێزکاربن و چاك بزانن بەڕاستی خوا زۆر بینایە بەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن."

هەروەها دەفەرمووێت: الرّجال قوّامون على النّسآء بما فضّل اللّه بعضهم على بعض و بما انفقوا من اموالهم فاالصّالحاتُ قانتاتٌ حافظات للغيب بما حفظ ً اللّه﴿٣٤﴾النساء.

واتە: ”پیاوان مافی سەرپەرشتیان هەیە بەسەر ژنان دا، ئەمەیش بڕیاری خوایە کە فەضڵی و ڕێزی هەندێك دەدات بەسەر هەندێکی تردا پیاوان سەروەت و سامان دەبەخشن لە پێناوی ئاسوودەیی خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا لەولاشەوە ئافرەتانی ژیر چاك و پاکن لەخواترسن نهێنی نێوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن ئەمیش خۆی لە خۆیدا بە جێهێنانی فەرمانی خوایە....“

لە جیهانی ئەمڕۆی ڕۆژئاوادا زۆربەی ئافرەتان بێزارن لەو دروشمانەی کە دەدرێن وەك (ئازادی، یەکسانی و فێمێنیستی)، خانمێکی ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی کە لایەنگری مافەکانی ئافرەتە، کتێبێکی نووسیوە و چاپ کردووە کە باس لە ژیانی خۆی دەکات.

لە کتێبەکەیدا هاتووە کە «ئافرەتانی ئەمریکی بە سەرقاڵبوون بە کاری دەرەوە و پێشبڕکێی لەگەڵ پیاوان، گەورەترین سۆزی ژیانیان لەدەست داوە کە دایکایەتیە“

ئەم ڕۆژنامەنووسە ئافرەتە ئەمریکییە ئامۆژگاری هەموو ئافرەتانی جیهان دەکات و دەڵێت: «ئەگەر دەتانەوێت خێزان پێکەوە بنێن و ببنە دایك، ئەوا بەس ئەرك و فرمانەکانی خۆتان جێ بەجێ بکەن“

ڕادیۆی دەوڵەتی ئنگلتەرا لە بەرنامەیەکی تایبەت بە ناونیشانی ”ئیسلام تاکە دینێکە کە بە خێرایی تەشەنە دەکات لەو وڵاتەدا“

لە بەشێکی ئەو بەرنامەیەدا دەڵێت: «لەسەر بنەما ڕاپرسی ڕۆژنامەی تایمز، ژمارەی تازە موسوڵمانبوانی دەوڵەتی ئینگلیز لەساڵێکدا زۆر جار دەگاتە ١٠٠هەزار کەس، کە زۆربەی زۆریان لە ئافرەتانن، لە نێو

تازە موسوڵمانبوانی ئەمریکیشدا ٪٨٠ی ئافرەتان پێکیدەهێنن. بە وتەی ئافرەتانی موسوڵمان بوی ئینگلیزی دەڵێن: هۆکاری موسوڵمان بوونیان ئەو ئەرزشانەیە کە دینی ئیسلام بۆ ئافرەتانی داناوە.

**ئافرەت لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانی ئەم سەردەمەدا :**

لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا کاتێك ئـــافرەتێك دەچێتە ناو ژیـــانی هاوسەریەتییەوە دەبێت ناوی خانەوادەی خۆی بگۆڕێت و بیکات بە ناوی خانەوادەی هاوسەرەکەی، بەو مانایەی کە ناوی خانەوادەی خۆی لە دەست دەدات و بەفەرمی دەبێت هەڵگری ناوی هاوسەرەکەی بێت.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئافرەت خۆی بە کەسێکی زۆر نزم سەیر دەکرێت، تا لە ماڵی باوکیەتی ناوی باوکی هەڵدەگرێت و کاتێکیش کە چووە لای هاوسەرەکەی دەبێت ناوی پیاوەکە هەڵبگرێت، کە دووبارە لە هەبوونی ناو و بەهایەکی نییە. کە ئەمە سەرەتاییترین مافە ئافرەت لە ڕۆژئاوا نییەتی و دەمیش لە ئازادی و مافی مرۆڤ دەکوتن.

لە فەرمانگەی ڕەسمییەکانی دەوڵەتدا لە هەبوونی دوو ناوی ئافرەتان پرسیار دەکەن، کە ئایا ئەو ناوەت چییە کە لە دوای هاوسەرگیریەوە وەرت گرتووە، چونکە ئەو ناوەیان ڕەسمیەتی زیاترە لە ناو دەوڵەتدا.

لە ڕاستیدا پیاوان کە خاوەن ماڵن خاوەنداری ئافرەتەکەن، لە تەوراتی ئێستادا هاتووە کە ئافرەت بە تاڵترین مەرگ ناو دەبات، ئەمەش ئەو یەهودیانەن کە بە هەڵە خۆیان بە پێشەنگی مرۆڤایەتی و پاکترین نەژاد دەزانن، بە وتەی «ناهوم گلدمن» کە یەکێکە لە بونیادگوزارانی سیستەمی ئێستای ئیسرائیل کە دەڵێت: «خەڵکی یەهود پەدیدەیەکی مێژوویی و شازن“

بەم پیا هەڵدانەی کە ئەو لە یەهودیەکانی دەکات کە ئەوان ئافرەت بە چاوێکی کەم تەماشا دەکەن و لەو باوەڕەدان کە ئافرەتان هیچ کاتێك نابنە هۆی خۆشبەختی، بەڵکو هەروەك مەرگ چۆن بۆ مرۆڤەکان تاڵ و ناخۆشە ئافرەتانیش بە شێوەی مەرگن.

یەکێك لەو گۆڤارە ئیسلامیانەی کە لە لەندەن دەردەچێت لە بابەتێکدا دەنووسێت کە «لە ئیسلامدا شتێکی جالب هەیە، کە ١٤٣٢ساڵ پێش ئێستا ئیسلام مافی ئافرەتانی پەسەند کرد، کە لە وڵاتێکی وەك بەریتانیا لە سەرەتای سەدەی بیستەوە لە ڕێگای پرۆژەیەکی پەرلەمانی ئەو وڵاتەوە مافی ئافرەت پەسەند کرا.

لە کۆتای ئەم لێکۆڵینەوەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ڕاکردنی ئافرەتان لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوا و پەناگرتنیان بە دینی ئیسلام ئەوە دەگەیەنێت، کە کەسانێکی بەرژەوەندی خواز و بازرگانانی ئافرەتان و هەڵسوکەوتی کۆمەڵگای ڕۆژئاوا هیچ کڕیارێکی نییە..

## یەکەم زمانی مرۆڤ کە ئاخاوتنی پێکردووە بناسە..

ئادەم یەکەم مرۆڤە کە دروست بووە؛ خوای گەورە لەو خاك و خۆڵەی کە هەیە دروستی کردووە زۆربەی ئەو توخمانەی کە لەناو خاك دایە پێکهاتەی مرۆڤن، پاشان لەگەڵ ئاو تێکەڵ کراوە بووەتە قوڕ و خۆشکراوە بۆ ئەوەی پێکەوە ئەو قوڕە بلکێنرێت.. ئینجا وشك کراوتەوە تا بۆتە شێوەی فەخفوری لەسەر شێوەی لاشەی مرۆڤ کە هەیە دروست کراوە، بە هێز و توانای زاتی خوایی دروست کراوە زاتی پاکی بنیادنەر و داهێنەری هەموو بوونە، هەموو ئەم قۆناغانە لە قورئاندا باس کراوە لە» تراب، طين، طِينٍ لَّازِبٍ، صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ» بە هیز و توانای خوایەتی ڕۆحی کردووە بە بەر ئادەمدا و کردوویەتیە مرۆڤ.

لە دوای دروستبوونی یەکەم مرۆڤ(ئادەم) خوای گەورە خۆی فێری هەموو شتێکی کردووە کە مرۆڤ پێداویستی سەرەتاییەکانی چییە، وەك ناوەکان و کەرەستەکان و ئەو شتانەی لە دەوربەریدایە، وەك شاخ، ئاو، دار، بەرد، ناوی خواردنەکان و ناوی کەرەستەکان وەك لۆکە، جلوبەرگ، پێداویستی و وەهەروەها.. ئەم باسە لە قورئاندا خوای گەورە بۆمان باس دەکات کە چۆن فێری ناوەکانی کردووە زانستی فێرکردووە بۆیە مرۆڤ بۆتە خاوەنی ڕێزو فریشتەکان ڕێزیان لێناوە، بەهۆکاری توانا و زانستی مرۆڤ خۆی بووە، بێگومان ئەو توانا و زانستانەش هەر خوای گەورە پێیبەخشیوە..

وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٣١﴾البقرة

ئەوسا ئیتر خوا ویستی توانایی و لێهاتوویی ئادەم بۆ فریشتەکان ڕوون بکاتەوە ناوی هەرچی پێویستی دەوروبەر هەیە فێری کرد، لەوەودوا نیشانی فریشتەکانیشی داو پێی فەرموون: ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاست دەکەن) و توانای ئاوەدانکردنەوەی زەویتان هەیە؟

فێری کردووە چۆن پەرستش و بەندایەتی بکات و خوای گەورە بە بەرز و پیرۆز ڕابگرێت.. تا ئێرە زۆرێك لە خەڵکی کێشەی نیە، دوای ئەوە پرسیارەکە خۆی زیندوو دەکاتەوە ئایا بە چ زمانێك خوای گەورە ئادەمی فێر کردووە..

بێگومان بەزمانی ئەدەمی!..

ئەی زمانی ئادەمی ناوی چییە ؟

ئەویش زمانی سریانی بووە.

لێرەدا دەبێت باسی ئەوە بکەم: زۆریك لەوانەی کە بڕوایان بە بیردۆزەکەی»داروین«ە گوایە لە ڕێگای گەشەکردنی مرۆڤایەتیەوە ووردە وردە زمانەکەن لە تەختەوە بەرەو تۆنی دەنگ ڕۆشتون، بۆیە ئەو باسەم نەکردووە، چونکە ئەو باسە لە ڕووی زانستییەوە هیچ بنەمایەکی نیە، تەنانەت زانکۆ دیارەکانی وەك ئۆکسفۆرد و کاردیف و هانۆڤەر و زۆرێکی تر لە زانکۆکانی تری جیهان تیۆری گەشەسەندنی داروینیان بە درۆ خستەوە بەتایبەتیش لەدوای دۆزینەوەی DNAترشەڵۆکی بۆماوەیی.

ئیتر بە تەواوەتی ئەم بیردۆزە کۆتایی پێهاتوە لە هیچ زانکۆیەکی دونیادا وەك زانست ناخوێنرێت، بەڵام دەشێت لە هەندێك جێگادا وەك مێژوو باس بکرێت، چونکە بۆ سەردەم و قۆناغی خۆی گرنگی هەبووە،

لەبەر ئەوە جێگای بایەخم نەبوو کە سەری خوێنەری پێوە بئێشێنم کە وەك ئەوە وایە من بەدوای هێلکەی کەڵەشێردا وێڵ بم!، یان پێوەری جۆرەکانی مەیمون تا دەگاتە شەمپازی لەسەر مرۆڤ هەژمار بکرێت بڵێین بە گوێرەی قۆناغەکان گۆڕاوە، دەی کە وا بێت زۆرێك لە ناو سکی مشك و کەروێشك لە دونیای زانستی ئەمڕۆدا زۆر نزیەك لە مرۆڤەوە ئەی بەم دوانەی تر بڵێین چی ئەمانەیش هەر باوکە گەورەی مرۆڤن.. بەهەر حاڵ ئەوە قسەیەکی کۆنە و هیچ بنەمای زانستی نیە.

هەندێك پرسیار هەیە زانست ناتوانێت وەڵامی بداتەوە، چونکە زانست حەتمیە و دیارە، بۆیە ناچارین فەلسەفە ببێتە ماڵی وەڵامدانەوەی ئەو باس و خواستانە، چونکە فەلسەفەش بۆ خۆی لە نادیار و پرسیار ئامێزەکان دەکۆڵێتەوە وەڵامیان بۆ دەستەبەر دەکات، دیارە هەندێکیشی لای فەلسەفە وەڵامی نیە، بۆیە ناچار دەبێت پەنا بهێنرێتەوە بۆ ئایین، چونکە وەڵامەکەی تەنها لای خوای گەورەیە، وا وەڵامت ئەداتەوە کە لەگەڵ ناخی و لۆژیکی مرۆڤدا بگونجێت.

زومانی ئەدەمی ئەو زوبانەیە کە یەکەم جار خوای گەورە ئادەمی فێر کردوە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان باس دەکات کە ئادەم و نەوەکانی تا سەردەمی نوح – علیه السلام- بە زمابانی سریانی قسەیان کردوە واتا « شیث پێغەمبەر و ئیدریس ناسراو بە (ئەخنوخ) پێغەمبەر و پێغەمبەر نوح – سەلامی خوا لە هەرسێکیان بێت- بە زمانی سریانی ئاخافتنیان کردووە..

ئەم زمانە پێکهاتەی هەموو زمانەکانی ئێستایە، تێکەڵیش بۆتەوە بە زومانی ئارامی کە زۆربەی جیهان بەم دوو زومانە قسەیان کردوە

بەردەوامیش ئەم دوو زومانە بوونیان هەیە لە وشەسازی ئێستای دونیادا لەمسەری بۆ ئەوسەری لەو جەمسەر بۆ ئەم جەمسەر..

لە ئێستادا- زمانی سریانی تەنها لە عێراقدا بە فەرمی کاری پێدەکرێت وەك زومانی کەمە نەتەوەکان ناسراوە، لە وڵاتانی تری وەك سوریا و لوبنان و ئێران و ئەرمینیا و تورکیا و ئیسرائیل و فەڵەستین و هندستان و قوبرس وەك ناسینی زمانەکە ناسراوە، بەڵام نەکراوەتە زمانی فەرمی وڵاتەکان، بەڵام لە هەموو ڕوسیا و ئەمریکا و کەنەدا و ئوستورلیادا و بەشێکی زۆری ئەورپا بەردەوام زمانی دینی ئەو وڵاتانەن،..وەك کۆچکەرانی زومانی سریانی لەوڵاتانەدا بوونیان هەیە مەراسیمە ئایینیەکانی خۆیانی پێدەخوێنن..

لە وێنەیەکی جوگرافیایدا بە جوانی وێنا کراوە ئەم زومانانە لە کوێدا بڵاوە.

ئادەم یەکەم مرۆڤی سەر زەوی بووە، د. شەوقی ئەبوخلیل لە ئەطڵەسی قورئاندا بە بەڵگە لە ئیبن و عەباسەوە هێناویەتی کە لە هیندستانەوە سەرچاوەی گرتووە، پاشان لەگەڵ دایکە حەوا لە وڵاتی نیوەدورگەی عەرەبی ژیانیان بردۆتە سەرو لە موزدەلیفە بەیەك گەیشتون و لە عەرەفات یەکتریان ناسیوەتەوە..

یەکەم بینا لەسەر زەوی کە دروستی کردووە ئاوەدانی کردۆتەوەماڵی خوا بووە، واتا کەعبەی ئێستا لە شاری مەککە و ئینجا لە سەفەریاندا بۆ فەڵەستین بینای ماڵی دووەمی خوایان کردووە کە مزگەوتی قودسە.

**زمانی ئادەم سریانی بووە:**

پێغەمبەر دەفەرمووێت بە ئەبوزەری غیفاری.. چوار پێغەمبەر سریانی بوون.. ئادەم، شیث، ئیدریس، نوح.. چوار پێغەمبەریش عەرەب بوون شوعەیب و ساڵح و هود و موحەممەد.

فەرموودەکە دوورودرێژە ئەوەی کە من مەبەستمە لە فەرموودەکەوە وەریدەگرم تەنها زوبانەکەیە، بەڵام فەرموودەکە و سەندەکەی وەك خۆی دادەنێم..

عن ابن عائذعن أبي ذر قال: قلت: يا ڕسول الله، كم الأنبياء؟ قال: «مائة ألف وعشرون ألفا »، قلت: يا ڕسول الله، كم الرسل من ذلك ؟ قال: « ثلاث مائة وثلاثة عشر جما غفيرا »، قال: قلت: يا ڕسول الله، من كان أولهم؟ قال: « آدم ». قلت: يا ڕسول الله، أنبي مرسل؟ قال: «نعم، خلقه الله بيده، ونفخ فيه من ڕوحه، وكلمه قبلا»، ثم قال: « يا أبا ذر أربعة سريانيون: آدم، وشيث، وأخنوخ وهو إدريس - وهو أول من خط بالقلم - ونوح. وأربعة من العرب: هود، وشعيب، وصالح، ونبيك محمد.[1]

---

(١) سنده حسن وهو جزء من حديث أبى ذر الطويل، ڕواه وابن عساكر في «تاريخ مدينة دمشق» ٢٣/٢٧٣ وما بعدها اأشار إلى صحته، ط. دار الفكر، ورواه ابن حبان (٣٨٤/١-التعليقات الحسان) وصححه أبو نعيم في «الحلية» (١٦٦/١-١٦٨)، ط. دار الكتب العلمية، وابن الجرير في»التاريخ» (١٥٠/١-١٥١) و (١٧٠/١-١٧١) ط. دار المعارف، ورواه ابن الجوزى في «المنتظم» (٢٢٣/١) و (١٤٢/٢-١٤٣)، ط. دار الكتب العلمية، احتج به، وقال الحافظ في «الفتح» (٤١٦/٦-شبية الحمد): صححه ابن حبان، وقال في «تحفة النبلاء»: ڕواه ابن حبان وفي صحتن مقال عن «موسوعة ابن حجر» (٣٠٢/٣)، ط. الحكمة، ورواه اب كثير في البداية والنهاية (٢٢٦/١)

بە گوێرەی زەمەن و دیموگرافی و گۆڕانی ئاووهەوا جوگرافیا و وردە وردە زوبانەکان لێکترازون، هەر ناوچەیە بەشی خۆی بردووە تا هەریەکە زوبانی تایبەتی خۆی لێدروست کردووە.. بەڵام بە گشتی زوبانی سریانی یەکەم زوبانی سەر زەوی بووە، کە زوبانی زۆربەی گەلانی سامی و ئاری بوون وەك یۆنان و کورد و ئاشوری و ناوچەکانی تری شام و تەنانەت ناوی سوریا لە سریانییەوە وەرگیراوە کلدانی زۆرێکی تر لە گەلە کۆنەکانی دونیا بەم زمانە ئاخافتنیان کردووە، دوای ئەم زوبانە زوبانی ئارامی گەشەی داوە بەم زووبانە هەردووکیان ئاوێتە بوونەتەوە بەیەکەوە کە ئەم زوبانە چەند بەشێکی گرنگی لێ جیا دەبێتەوە.

بۆ یەکەم جاریش ئەو کەسەی کە بە قەڵەم یاخود جۆری «توش» نووسیویەتی واتا نووسینی و وێنای شتەکانی چواردەوری کردووە ڕەمزی بۆ داناوە، پێغەمبەر ئیدریس بووە لەڕێگای فێرکردنی صحوف و نووسینەوەی بۆ نەوەکانی دوای خۆیان، بێگومان بە هاوکاری باوکی شیث و باوکەگەورەی ئادەم کە هەموویان لە یەککاتدا ژیاون، سەردەمی ئەم کۆمەڵە پێغەمبەرە- سەلامی خوایان لێبێت- گەیاندنی تەوحید و ڕاستکردنەوەی چەمکەکانی ئایین نەبووە، بەڵکو خۆیان شارەزا بوون لەو بنەمایانە و خەڵکەکەش بە سروشتی خۆیان پاکبون لەو ڕووانەوە، بەڵام ئەوان کێشەیان لەگەڵ ئارەزوو شەهەواتی خەڵکیدا بوو وەك

---

و (٣/٨٩-٩٠)، ط. دار هجر، وفي تفسيره (٤/٣٧١-٣٧٢-٣٧٣-٣٧٩) ط. قرطبة. وهو في «الدار المنثور» (٥/١٦٣) ط. دار هجر، وفي «الكامل في التاريخ» (١/٥١*، ط. دار الكتب العلمية، وانظر « السلسلة الصحيحة» (٦/٣٦٢) و «سلسلة الضعيفة» (٤/٣٨٣) و (١٣/٢٠٥ ) الألباني، وبالجملة فإن أصل حديث أبى ذر حديث صحيح، ولكن تصرف بعض الرواة في.

تاوانەکانیان.. لەدوای هاتنی پێغەمبەر نوحەوە ئیتر شیرك وچەمك و تێزەکان پێویستیان بە ڕاستکردنەوە هەبووە، بۆیە زیاتر پەرە دراوەتەوە بە نووسین، تا ئەو سەردەمەش هەر زوبانی سریانی تاکە زووبان بووە، بەڵام لەدوای جیابوونەی کوڕەکانی «نوح، سام و حام و یافث» ئیتر بە گوێرەی ناوچەکان زمانەکان گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە کە بڵاوەیان کردووە..

**وێنەیەکی خەیاڵی سام و حام و یافث..**

خوای گەورە بە هەموو زوبانێك فرستادە و باس و خواسی ناسینی خۆی بۆ هەموو گەلان ناردووە، پەیامەکەی من ئەوەیە: - زوبان ئالیەتی ئاخافتنە و دووانە، نەك- بە پیرۆز ڕاگرتن و تەماشا کردنی.. بۆ نمونە سەرەتای مرۆڤایەتی سریانی بووە، پاشان عەرەبی، ئینجا عیبری ئیسرائیل و ئارامی، زمانی موسا و بەنی ئیسرائیلی عیبری بووە، پێغەمبەر عیسا ئارامی بووە و هەروەها، بە دڵنیاییەوە بە زمانی کوردیش هاتوە، بە ئینگلیزی و زمانی هیندە سوورەکانیش هەر فردستادە و پێغەمبەری خۆی ناردووە بۆ ئەوەی لێپرسینەوەیان لەسەر ئەوە لێبکات کە زانیاریان لەسەری هەیە.

**پەیامی کۆتایی لەم باسەدا:**

وەك ئاماژەم پێداوە زووبانی ئاخاوتن تەنها ئالیەتی کارکردنە، زوبان کەس ناکاتە ڕەگەز واتا کە من بە عەرەبی قسەم کرد مانای وانییە ئیتر ڕەگەزی عەرەبیم، یان بە کوردی قسە بکەم من ڕەگەزی کوردم، نا- بەڵکو ڕەگەز بنەڕەتی لە نێوانی مرۆڤ بە دوو شێوە دابەشکراوە نێرو مێ، کورد و عەرەب و فارس و ئینگلیزو ئەفریقی.. هەمووی مرۆڤن کەس لە کەس

بەرێزتر نیە مەگەر بە تەقوا و چاکە نەبێت لای خوای گەورە، خوای گەورە ڕێزی لە مرۆڤەکان بە گشتی گرتووە دەبێت کەراماتیان پارێزراوبێت..

هیچ دەوڵەتێك بەهۆکاری زوبانەکەی نەبۆتە دەوڵەت لە مێژوودا شتی وانیە، بەدەیان دەوڵەت هەیە خاوەنی زوبانی خۆی نیە و دەوڵەتیشە، وەك ئەمریکا کە زلهێزترین دەوڵەتە، کەنەدا، ئوستورالیا و ئەرجەنتین، کوبا، بەرازیل. فلپین، سریلانکا، بۆتان،..هتد.

لەناو ئیسلامیشدا زۆربەی زانایان و ئەهلی ئیسلامەکە کە خاوەنی زانستی گەورەی ئەم ئیسلامەن، عەرەب نەبوون، بەڵکو عەرەب لە ناویاندا بە پەنجەی دەست دەژمێرێت، شەش فەرموودەوانە ڕاستەکە هیچیان عەرەب نەبوون، زۆرێك لە موفەسیرین و مێژوونووس زانایانی تەزکیەی نەفس و موجاهیدان، تەنانەت خەلیفەکانیش زۆربەیان عەرەب نەبوون کەس ڕەخنەی نەگرتوە لە عەرەب نەبوونیان..

پاشان وتەی کۆتاییم: ئەگەر پەیامی خوای بەهەر زوبانێکی تر بهاتبا خوارەوە هەمان هەنجەت هەبوو بۆ ئەوەی خەڵکی تر داوا بکات بۆ بە زمانی وڵات و گەلەکەی ئەو نەهاتۆتە خوارەوە، ئەمەش لە پیشەی خەڵکی ئاقڵ نیە بەدوای سوفستائیدا بگەڕێت، بەڵکو بە دوای حیکەمەتیدا دەگەڕێت کە بۆ ئایین بەو زوبانە هاتووە..

## سروودی ئەی ڕەقیب بناسە..

زۆر لە مێژە هەندێك لە نووسەران دەنگۆی ئەوەیان هەیە کە سروودی ئەی ڕەقیب تێکەڵاوی کلتوری کوردی بووە، بەشێکە لە فەرهەنگمان بۆتە دیرۆکی ئەم گەلە!

زۆربەیان ئەو کەسانەیان بە ئاجەر و گوجەر و خۆفرۆش لەقەڵەم داوە کە ڕەخنەیان لەهۆنراوەکەی شاعیری کورد دڵدار گرتووە.

ئەم باسە کە کراوە تەنها لە دڵسوزیمانە بۆ ئەو گەل و نیشتیمانە تا نەوەکانی بەرەو ئاقارێکی ڕێك دروست بەرین، خۆ زۆر بەداخەوە خەڵکی دڵسۆزی ئێمە هەمیشە ناوزەد دەکرێت بە خۆفرۆش و یاخود ناشایستە یان و بودەڵە و سیخوڕ، ئەگەرچی ئەوەی سیخوڕ و خۆفرۆشە وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێت، بە دروشم قسەی زل و باق و بریق دەیباتە سەر، بێ ئەوەی بیر لە وڵات و ئاسایشی نەتەوەکەی خۆی بکاتەوە بێباکە لەوەی کە چۆن نەوەی نوێ پەروەردە بکات.

سەرەتا بۆ ڕازیکردنی دڵی ئەو کەسانەی کە خۆیان زۆر بە نەتەوەیی دەزانن ولاف گەزافی کوردایەتیمان پێ دەفرۆشن با بە چاوی ئەوان سەیری ئەی ڕەقیب بکەین!!

سەرەتای هۆنراوەکەی دڵداری شاعیر دەڵێت:-

ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان
نـــایشکێنێ دانـــەیی تۆپی زەمـــان

کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە قـــەت نانەوێ ئـــاڵاکەمان

ئەی ناسیۆنالیزمی کوردی وشەی (رقیب)لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبیە بە واتای (چاودێر یاخود ئاگادار) دێت ئەگەر مەبەست لەم واتایە بێت هیچی ناگونجێت لەگەڵ ڕستەکەدا، خۆ ئەگەر بەواتای (رقیب)ی فارسی بێت بەواتای دوژمن هاتبێت لە زمانی فارسی دوژمن هەر دوژمنە، ڕەقیب لە فارسیدا وەتە نەیار یاخود بەرهەڵستکار یان کێشمەکێشمی ململانێی نێوان دوو کەس، واتا پێشبڕکێ لە بوارێکدا.

گریمان وشەکە بۆ دوژمن بەکار هاتووە، پرسیارەکە باوا بکەین: ئەگەر سروودی نیشتیمانییە بۆ وشەی کوردی تێدا بەکار نەهاتووە؟

هیچ مافێکی بە زمانی کوردییەوە نیە، کوا پاراستنی زمانی کوردی لە سروودی نیشتیمانی، خۆ ئەمە سەرەتاکەیەتی کە دەست پێدەکات بە ئەی ڕەقیب؟

ئەم ڕستەیە هیچ ژێرخانێکی مەعریفی تێدا نیە.

بێجگە لە وشەی ئەی ڕەقیب وشەی(قوم)هاتووە کە بەکوردی واتا گەل، هۆز، ولە بنەڕەتدا ئەمیش عەرەبیە، بۆ دەبێت سروودی نیشتیمانییەکەمان ئاڕاستەوانی زمانی کوردی ڕەسەن نەبێت، زمانی بێگانە بێت، خۆ ناونراوە بە سروودی نیشتیمانی!!

وشەی زەمان (زمن)ی عەرەبی تێدا بەکار هاتووە کە بە واتای کات و سەردەم دێت، لێرەدا زمانی کوردی لەم سرووده هیچ لە لانەکەدا نەگیرێت وەك ڕەهندێکی زمانەوانی.

پاشان ڕستەی کەس نەڵێت کورد مردووە، ئاڕاستەیە بۆ ناو خەڵکی کورد کێ لەکورد دەڵێت خۆم مردووم، وە سروودی نیشتیمانی ئاڕاستەی دوژمن ناکرێت، وەك ئەوە وایە کەسێك بڵێت کورد مردووە، خۆ ئەگەر ئەو مانایە ببەخشێت لەوانەیە بۆ قۆناغێکی خەبات، هێزو دروشمێك بووبن، بەڵام بۆ نەوەی نوێ لە لایەنی دەروونیەوە کاریگەری خراپی دەبێت، ڕەهەندێکی شڵەژاو دروست دەکات.

هەروەها وشەی قەت(قط) عەرەبییە هاتووە، بۆ دەبێت ئەم سروودە لەناخی خەڵکەکەوە هەڵنەقوڵابێت؟ کوا لەناخی خەڵکی کورد دەدوێت بۆ ئاڕاستەیەك نییە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز، کارکردن لە پێناوی کاتێك کە گوێمان لێدەبێت، دەڵێ پێشمەرگە ڕیزی بەستووە بە شاخەکانەوە بەرەو کاری پارتیزانی دەڕۆن ئەم قۆناغە لەگەڵ قۆناغی شاخ بەراورد ناکرێت.

ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوورو شـۆڕشین

سەیری کە خوێناوی‌یە ڕابردوومـــان

ئەوەی کە جێگای سەرنج و تێبینیە وشەی خوێنە کە لە سروودی نیشتیمانیدا دەبوو شەهید یاخود سەروەری پێشمەرگە تۆمار بکرێت نەك ترس و بیم لە دڵی خەڵکیدا بڕوێنرێت ئەی ڕەنگەکانی ئاوەدانکردنەوە و ئاشتی بەگوێی نەوەکانماندا بدەین باشترە یان هەر خوێن و شەڕ؟!

دەقی دوای ئەو دەڵێت:-

لاوی کورد هەستایە سەرپێ وەك دلێر

تا بە خوێن نەخشی بکا تاجی ژیـــان

لەکام سروودی نیشتیمانی وڵاتاندا باسی خوێن کوشتار بۆ نەوەکانی دەکات، یان دەبێت لەجیاتی ئەوەی فێری داد پەروەری و ئاشتی و ئازادی و مافی مرۆڤیان بکەین، کلتوری خوێن خەریکە دەبێتە زمانی نەوەی نوێ، خەڵکەکەمان بۆیە خەڵکێکە تائێستایش هەر بە توڕەیی دەژی تا مردن.!

پاشان هەڵەیەکی زۆر گەورە ئالێرادا بەدی دەکرێت زۆربەی سرودە نیشتیمانییەکانی جیهان لێکۆڵینەوە و زۆربەیان دکتورایان لەسەر وەرگیراوە بۆ نمونە سروودی نیشتیمانی نەرویژ و فرنسا و بولگاریا، هتد.... کە باس لە ژیار و شارستانیەتی نەتەوەکەی خۆی دەکات باسی لە فەرهەنگی خەڵکەکەی دەکات، بەڵام نازانم لە ڕۆشنبیرانی کورد بە گشتی مێژوونووسان بە تایبەت چۆن بێدەنگ لە ئاستی هەڵەیەکی وا زەق، یان سەرکردەکان چۆن ڕازین بەوەی کە نەوەکانیان بکەنە کوڕی دوژمنەکانیان!!لە کاتێکدا کە ژیار و شارستانییە بە دەستی تێکچووبێت، لە هەمان کاتدا شانازی پێوە بکەین، بەڕاستی جێگای تێڕامانە، وەرن سەیری ئەم دەقە بکەین کە باس لەوە دەکات

ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەیخوسرەوین

دینمـان، ئـــاییـنمـان هەر نیشتمـان

لە ڕاستیدا زۆر لەسەر وشەی میدیا ناڕۆم، هەرچەندە وێڕا تێبینیم لە سەری کە کورد زۆر لە میدیا کۆنترە، بەڵکو مادەکان بەشێکن لە کورد، زۆربەی کوردەکانیش لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوای خۆیان هەبووە، لەو فەرمانڕەویەدا بوون وەك کوردەکانی ناوچەی زاگرۆس کە خۆیان خاوەنی دەسەڵاتی خۆیان بوون، زۆرجاریش مادەکان هێرشیان بردۆتە

سەریان، بەڵام هەندێك لە مێژوونووسەكان دەڵێن كە ئەوانیش هەر بە مادی بچوك ناوزەد كراون، بەڵام لە ناو فەرمانڕەوای مادەكاندا فارس و عەرەب و تورك هیند و ئازەری و ئۆزبەكی و تاجیكی یاخود قەوقازی و پەشتۆنی لە خۆی گرتبوو، جا دەبێت كوردی ئێستامان خۆیان ساغ بكەنەوە لە كامیانن، بەڵام زۆربەی دەسەڵاتی مادەكان كوردەكان فەرمانڕەویان كردووە، بەڵام كوردەكان بە تەنها خاوەنی فەرمانڕەوای مادەكان نین، بەڵكو فارسیش خاوەنی فەرمانڕەوی ماد بووە، فارسەكان خۆیان بە خاوەنی ئەو فەرمانڕەواییە دەزانن.. جا باشتر نەبوو هەر وشەی كورد بەكار بهاتایە، هەرچەندە زۆر كێشە نیە هەر ئاماژەیەكە بۆ مێژووی كورد، بەڵام ئەوەی كە زۆر گرنگە و دڵداری شاعیر هەڵەیەكی گەورەی تێدا كردووە ئەویش ناوی كەیخوسرەوە.

لە هەموو پاشاكان و فەرمانڕەواكانی ماد كەسێكیان نەبووە بەناوی كەیخوسرەو لە سەردەمی دەست پێكردنی فەرمانڕەواكانی مادەوە هەر لە دیاكۆ و قوباد كواكیساری گەورە و كە دەستی پێكردوە لە زنجیرە ئەو فەرمانڕەویەدا كەسێكی تیدا نەبووە ناوی كەیخوسرەو بێت، بەڵگەم بۆ ئەم قسەیە نە لە مێژووی مەردۆخی نە لەمێژووی ئەمین زەكی بەگ و نە ئیبن ئەسیری جزیری زۆری مێژوونووسەكانی تر كە سەیرم كردوە ئەو ناوەی تێدا نیە.

لە هەردوو مێژووەكەدا هاتووە واتا مەردوخی و ئەمین زەكی كە ئەم كەیخوسرەوە فەرمانڕەوای كورد نەبووە.

ئەگەر مەبەست لەو كەیخوسرەوە بێت كە لەگەڵ براكەی بە شەڕ هاتووە لە بابل بە پشتیوانی فەرمانڕەوای یۆنان هێرشی هێنایە سەر فەرمانڕەوای

بابل، لە کۆتاییشدا خۆی کوژراو و دژی براکەی خۆی جەنگا کە بەنۆکەری پاشای یۆنان ناوزەد دەکرێت، پاشان قوتابییەکی ئەفلاتون بوو بەسەرکردەی ئەو سوپایە تا لە تورکیادا زۆربەیان لەناوچون، ئەم کەیخوسرەوە کورد نەبووە، مافی بەسەر کوردەوە نیە، لە کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ لاپەرە (١١٣) بە تەواوەتی ئاماژەی بۆ کردووە...

خۆ ئەگەر مەبەست لە سیروزی گەورەیە وەك مەردوخی باسی دەکات ئەوە دەڵێت کەسێك بووە کە فەرمانڕەوایی مادی ڕوخاندوە! (لە مێژووی کورد و کوردستانی هاتووە کە عەبدولکریم محمەد سەعید وەرگیراوە.)...

کەچی ئێمە خۆمان بەنەوەی کەیخوسرەو دەزانین!!

پاشان ئەگەر بڵێین نا مەبەستی کەیخوسرەو لە کورشی گەورەیە، ئەویش کەسێك بووە لە فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی فارس کە هەموو مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە کورش دەسەڵاتی لە(ئازیدەباك) سەندەوە کە کوڕی کواکیساری بچوك بوو کە فەرمانڕەوای مادی دەکرد دوایی بوو بە دەسەڵاتی پارسەکان، زۆر بەڵگەی تر لەبەر دەستدایە کە ئەو ڕاستیانە دەسەلمێنن.

جا خۆتان سەرپشك بن ئەی ئەوانی کە خەڵکانێك بە نەفام دەزانن، خۆتانی زانا لە مێشکتاندا زەڕب و تەقسیمێکی بکەن.

لێرەوە ئەوەندە بەسە بۆ ناسیۆنالیزمەکان خۆتان بگەڕێن بە دوای ڕاستیدا واز لە نەوەکانمان بێنن ئەگەر دڵسۆزن.

پاشان دێمە سەر مەلاکان و پیاوانی ئەم ئیسلامە و جەنابی مەسعود بەرزانی کە کوڕی پیاوێکی دیندار و عەمامە بەسەر بووە کە موستەفا بەرزانی یە خوالێی خۆش بێت...

لە دوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت کە لە ڕووی مێژووە زۆر هەڵەی تێدایە هەڵەکانی زەقە، مێژووی میللەتەکامان بەرەو شێوان دەبات، پێویستە لە ڕووی ئایینییەوە خوێندنەوەیەکی ترمان هەبێت بۆ ئەم هۆنراوەیە کە زۆرینەی خەڵکی کورد موسڵمانە وشەکانی زۆر نەشیاوە بۆ سروودی نەتەوایەتی، چونکە گەلی کورد گەر موسڵمان بێت دەبێت ڕەنگدانەوەی ئایینەکەی لە سروودی نیشتیمانەکەیدا ببینرێت، خۆ ئەگەر نا! با بە خراپ باس نەکرێت، چونکە ئەوە زۆر نەگونجاوە بۆ ناو کۆمەڵگای ئێمە....

لەوانەیە دڵداری شاعیر تەنها وەك هەست و سۆزێکی نەتەوەیی خۆی ئەم وتانەی وتبێت کە زوڵم وستەم لەسەر کورد زۆر بووە ئەم چەند وشەی درکاندوە، چونکە ئەو خۆی ئەم هۆنراوەیەی بۆ سرودی نیشتیمانی نە نووسیوە چونکە سرودی نیشتیمانی بنەمای تایبەتی خۆی هەیە و لە دەقدا هونەرێکی پڕ تەکنیکە، دەبێت بە کۆمەڵێك وشەی کەم مانایەکی زۆر بدات، تا پێی دەوترێت سروودێکی گونجاو بۆ نیشتیمان کە هەموو دەستەو هۆزێك بگرێتەوە، خۆ ئێوە باس لە یەکسانی دەکەین ئەی یەکسانی مەسیحی و ئەزیدی و کاکەیی و هتد... کوا؟

پاشان ئەم دەقەی کە زۆر سەرنج ڕاکێشە تا ئێستایش خەڵکی هەر پاساوی بۆ دێنەوە و تەئویلی بۆ دەکەن

دینمـان، ئایینمـان هەر نیشتمـان

ئەگەر گەلی کورد بە موسڵمان دەزانن بە هەموو پێوەرێك ڕەوشتی و مرۆڤایەتی و سیاسی وکۆمەڵایەتی هەموو فەرهەنگەکان ئەم دەقە لەگەڵ گەلی کورد نەگونجاوە

لەوانەیە بپرسن چۆن؟

ئێمەی کورد موسڵمانین، ئایینمان ئیسلامە و نیشتیمانمان کوردستانە، نیشتیمان ناپەرسترێت بەڵکو ئینتیمامان بۆی هەیە، چونکە نیشتیمان خۆشەویستییەکەی لە سەر بنەمای یادگاری خۆشەویستیەکە دروست دەبێت.. خۆ ئەگەر کەسێك زمانی کوردی بێت لە خاکێکی تر لە دایك بوو‌بێت با زمانی کوردی بزانێت دایك و باوکی کورد بێت بەڵام ئەگەر یادگاری لەسەر خاك و شۆڕشی ئەو وڵاتەدا نەبێت هیچ خۆشەویستییەکی ئینتیمای بۆی نابێت.. کەواتە نیشتیمان ناپەرسترێت. هەر کەسێك خاوەنی ئایین بێت دوو پەرستش ناکات یان خوا دەپەرستێت یان نیشتیمان.

کەواتە بە هەموو پێوەرێك ئەمە گونجاو نییە، ئەکرێت دڵدار وەك هەست و تێڕوانینی خۆی نووسیبێتی، ئەتونین بڵێین هۆنراوەی خۆیەتی سەراپا چی دەنووسێت ئازادە، بەڵام ناکرێت نە ئەو و نە کەسێکی تر بەسەر میللەتێك دا بیسەپێنێت، ئەگەر بیرمان بەلای لادینی بڕوات خۆمان بە عەلمانی بزانین هەر مەعریفی نییە بڵێین ئێمە نیشتیمانەکەمان بپەرستین!! چونکە ئەگەر خەڵکێك بڕوای بە ئایین نەبێت نەنگیە پەرستن ئەنجام بدات، خۆ ئەگەر موسڵمانە ئەوا موسڵمان خوا دەپەرستێ.. ئەی کوا ڕێزی ئەو میللەتە موسڵمانە؟ کوا ڕاگرتنی هەست و سۆزی موسڵمانان؟ ئەگەر سرووودی نیشتیمانییە بۆ دەبێت لە ناخی هەموومان نەدوێت؟! بۆ دەبێت یاری بە هەست و سۆزی نزیکەی چوار ملیۆن موسڵمانی کوردستانی باشوور بکات؟ ئێمە دەبێت لەگەڵ خۆمان و خەڵکەکەمان ڕاستگۆ بین، گەلی کورد بە ڕاستی موسڵمانە و نیشتیمان ناپەرستێت! بەڵکو خوا دەپەرستێت.

کوا ئەم سروودە لە ناخی خەڵکی ئەدوێت؟ ئینجا بۆ نابێت بگۆڕێت؟

خۆ ئەگەر دەڵێن مەبەستی دڵدار ئەوە نەبوە، ئێمە ناتوانین فاڵ بۆ خەڵکی بگرینەوە، لەسەر بنەمای دەق قسە دەکەین و ناکرێت هەست و سۆزی دڵدار بەسەر ملیۆنەها خەڵکدا بچەسپێنین، چونکە دڵدار خۆی کەسێك بووە کە زۆر کاریگەری چەپی بەسەرەوە هەبووە، ئەوەتا خۆی دەڵێت (ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین!)

پاشان لەم نووسینانەی دڵداردا دەردەکەوێت(في طريقي الى معرفة الحقائق ـ انتقادات الى قلب البهائيين، ناگزوری کۆمەڵایەتیمان، اقتصادنا الوطني) زۆری تریش کە بە ڕوونی پێوەی دیارە.

ئینجا گلەییەك لە مامۆستا بەرێزەکانی ئەوقاف دەکەم :

بەڕێزان مامۆستایانی ئایینی چ تەفسیر چ تەئویلێکتان هەیە بۆ دینمانە ئاییمنان؟

خۆ ئێوە جێنشینی پێغەمبەرن دروودی خوا لێبێت خۆ وشەی ڕەقیب یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە، ئەگەر لە ئەدەبیاتە بەو شێوە بەکار هاتبێت، لە ڕووی بیرو باوەڕەوە هەر هەڵەیە و نەگونجاوە، چونکە کەس شەڕی پێناکرێت لەگەڵ خوا، چۆن ڕەقیب کە ناوێکی خوا بێت بە دوژمن ئاماژەی بۆ بکرێت!!

ئەی ڕەقیب لە ڕووی شەرعەوە هەر ناگونجێت لە ڕووی کلتوریشەوە هەر نەشیاوە.

ئەم دەقەی تر مامۆستایانی ئایینی چی وەسفێك هەڵدەگرێت کە دەڵێت:-

نایشکێنێ دانەیی تۆپی زەمان کە بە ئەنقەست دەوترێت (نایشکێنێ دانەری تۆپی زەمان).

خۆ ئەمە هەموو گومانێك ئەڕەوێنێتەوە! لێرەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە خوایش ناتوانێت نەعوزوبیللا کورد لە ناو بەرێت!!

کوفرێکی دیارە، نەگونجاوە، لە ناو کۆمەڵگاکەماندا شتێکی ناقۆڵایە.. جا مامۆستایان خۆتان ئەمە ساغ بکەنەوە، تا بزانین ئەمانە چ مانایەك ئەدەن بەدەستەوە؟ بۆ ئەوەندەی مامۆستا مەلا کەریمتان پێ ناکرێت کە چەندین کتێبی شاعیرانی نووسیوەتەوە و شی کردۆتەوە؟ ئێوەش ئازابن وەرن ئەو شیعرەمان بۆ شی بکەنەوە.

لە کۆتایی هۆنراوەکەدا دەڵێت:-

لاوی کورد هەر حـــازر و ئامـــادەیە
گیان فیدایە، گیان فیدا هەر گیان فیدا

ئەوکەسانەی کە شارەزان لە دەروونناسیدا ئەوان بابێنە گۆ بەویژدان قسە بکەن، سروودی نیشتیمانی دەبێت گەورە و بچوك لە بەری بێت بۆ ئەوەی کاریگەری هەبێت لەسەر خەڵکی، بەڵام ئەم دەقە لەجیاتی ئەوەی لاوان فێری ژیارو شارستانیەت و پێشکەوتن و داهێنان بکات، کەچی فێری خوێن ڕشتن وئیرهابیان دەکات و هەوڵی شەڕانگێزییان پێ دەدات.

پێشکەوتنی میللەتەکەمان لەم سروودەدا کوا ؟
کوا فەرهەنگی داهێنان؟
ئەی کوا دادپەروەری ؟
ئەی خۆشەویستی و یەکسانی؟

کوا باسی مافی مرۆڤ ؟

سەدان پرسیاری تر ؟

ئەم هۆنراوەیە هەرگیز بە سروودی نیشتیمانی دانانرێت! ئەمەش دیکتاتۆریەتە بەسەر خەڵکیدا چەسپاندوویانە، بۆیە دەبێت هەر لابچێت.

کۆتایی پرسیارمان لەسەر شیعرەکانی دڵدارە، ئەویش ئەوەیە بۆچی کەسانی تر لەسەر هۆنراوەکانی نەدواون؟ دیارە لەبەر ئەوەی زۆر گرنگ نەبووە، لە ڕووی ئەدبیاتەوە و لە ڕووی تێگەیشتنەوە زۆر بە هێز نەبوون.

دڵدار، ناوی «یونس»ی کوڕی مەلا ڕەئوفی کوڕی مەحمودی کوڕی مەلا سەعدی خادم ئەلسەجادەیە. لە ڕۆژی ٢٠ ی شوباتی ساڵی ١٩١٨دا لە شاری «کۆیە»هاتۆتە ژیانەوە.

باوکی فەرمانبەرێکی بچووك بووە و لە تاو هەژاری و نەبوونی و گەڕان بە شوێن پاروە نانێکی ژیان و گوزەریدا، خێزانەکەیان زۆر تاڵ و سوێری و سارد و گەرمی چەشتووە، پاش ماوەیەك باوکی دەکەن بە فەرمانبەری سەرژمێری ڕانیە و لە تەمەنی دە ساڵیدا «دڵدار» دەخرێتە قوتابخانە و پۆلی یەك و دووی سەرەتایی لە ڕانیە دەخوێنێ.

دڵدار لە بارەی ژیانی ڕانیەوە دەڵێت: «هەرچەند ڕۆژێکی چاك و چوار ڕۆژانیش نەخۆش بووم، سەرەڕای ئەوەش ڕانیەم هەر لەلا خۆش بوو، بە تایبەتی سەوداسەری قولـلە* بووم. هەر کاتێ چاك بووبامایەوە، مەلەم لە ڕووبارەکە و لە بن داربییەکان و ڕاوەچۆلەکەم دەکرد.“

دوای ماوەیەکی کەم باوکی لەسەر فەرمانەکەی لادەبەن و ناچار بە ماڵەوە دەگەڕێنەوە بۆ کۆیە و خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە تەواو دەکات.

لە بارەی خولیای هۆنراوە و چێژ لێوەرگرتنی خۆیەوە دەڵێت: «هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووم، کە زۆرینەی دیوانی حاجی قادری کۆیی-م لەبەر کردبوو، هەمیشە بە وردی سەرنجم لە هەڵبەستەکانی عەونی و ڕاجی و عاسی و حسێنی و هیرانی دەدا و لەبەریشمدەکردن، بەوانەش دابین نەبووم هەڵبەستی هەرکەسێکم دەستبکەوتایە دەمنووسیەوە و لەبەریشمدەکردن. بەتایبەتی هەڵبەستی وەفایی، کوردی، بێکەس، پیرەمێردم زۆر لەبەرکردن و هەر لەو ساڵەدا هەستم بەوە دەکرد، کە چێژ لە هەڵەبەست وەرگرم و زۆر گیرۆدەی بووم.“

هەروەها لە بارەی سەرەتای خۆ تاقیکردنەوە بە شیعر دەڵێت:

”لە١٩٣٥دا لە پۆلی یەکی ناوەندیی بووم، کە دیوانی (نالی)م زۆر بەوردی خوێندەوە، هەڵبەستە جوانەکانی (نالی) لەگەڵ هەڵبەستە ئاگرینەکانی حاجی قادری لەسەر پیشەوایەتی وێژەیی لە مێشکمدا شەڕیان بوو. ئەو کێشمەکێشە دەرگای هونەری شاعیری لێکردمەوە، زۆر کەڵکەڵەی وام لە کەلەدا بوو حەزم دەکرد لە بۆتەی هەڵبەستەدا دایڕیژم. ئەوجا بەناو خەڵکیاندا بڵاویکەمەوە و ئیتر هەر خۆم تاقیکردەوە.“

دڵدار، یەکەمین هۆنراوەی لە ساڵی ١٩٣٥دا داناوەو لە ژمارەی ٢ ی ساڵی ١٩٣٥دا لە گۆڤاری «ڕووناکی»دا بڵاویکردۆتەوە.

لە ساڵی ١٩٤٠دا لە شاری کەرکوك قۆناغی دواناوەندی تەواو دەکات و پاشان ڕوودەکات بەغدا و دەچێتە کۆلێژی یاساو ساڵی ١٩٤٥ بڕوانامەی کۆلیژی یاسایی وەردەگرێت و دەبێتە پارێزەر.

لە تەمەنی سی ساڵیدا بە»ژەهراویبوون» لە ١٢ ـ ١١ ـ ١٩٤٨ دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و سەری جوانەمەرگیی نایەوە.

وەك دیارە زۆر خولیای زانین و بەتایبەتی فەلسەفە بووە، ئەم یادگارانەشی بۆ بەجێهێشتووین:

١. في طريقي الى معرفة الحقائق ـ انتقادات الى قلب البهائيين.

٢. وتارێك دەربارەی عومەری خەییام.

٣. زمانی كوردی و ئەدەبیات.

٤. ناگزور كۆمەڵایەتیمان.

٥. اقتصادنا الوطني.

٦. بیرەوەریەكانی یونس ڕەئوف دڵدار.

# نـــاوەڕۆك